# فەرمووده ناسی

ڕوونکردنەوەیەکی بەسوودە لەسەر
(هۆنراوەی بەیقوونی) لە زانستی فەرمووده

نووسینی
أمجد محمد زاهد شيخ محمد

# فەرموودەناسی

ڕوونکردنەوەیەکی بەسوودە لەسەر

(هۆنراوەی بەیقوونی) لە زانستی فەرموودە

ناوی کتێب: فەرموودەناسی
نووسینی: أمجد محمد زاهد شيخ محمد
نەخشەسازی ناوەوە: کۆمپیوتەری نارین (محمد علی)
ساڵی چاپ: ٢٠١١ ز
ژمارەی سپاردن: (٢٥٨٦)ی ساڵی (٢٠١٠)ی پێدراوە

# فەرموودەناسی

## ڕوونکردنەوەیەکی بەسوودە لەسەر.

## (هۆنراوەی بەیقوونی) لە زانستی فەرموودە


## نووسینی

أمجد محمد زاهد شيخ محمد

پێشکەشە بە:

- چرای ڕووناکی بەخش بە فەرموودە وکردارەکانی، سەرداری سەرداران پێغەمبەری ئاخر زەمان (دروودی خودای لەسەر بێت).
- هەموو ئەو زانایانەی کە لە خزمەتی فەرموودەکانی حەزرەتدا جێگە دەستیان دیارە، بەتایبەتی شێخ (ابن الصلاح)ی شارەزووری ومامۆستای بەیقوونی.
- شێخانی نەقشبەندی بیارە وهەورامان، بەتایبەتی شێخ موحەممەد عوسمان (سراج الدین)ی دووەم.
- باپیرەی خۆشەویستم زانای نوورانی، مەرحوومی مامۆستا شێخ موحەممەدی خۆراسانی.
- مامۆستای گەورەم عەللامەی مەریوانی مەرحوومی مامۆستا مەلا موحەممەد ئەمینی کانی سانانی.
- باوك ودایکی دڵسۆز وبەسۆزم.
- هەموو فێرخوازانی فەرموودەناسی.

## لەسەر نووسینی مامۆستای پایەبەرز (نوری فارس حەمە خان)

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس بۆ خودا، درووود لە حەزرەت

ڕەزا لە یـاران، ڕەحمەت لە ئومەت

لەپاش ئەمە، عەرزم ئەمەیە:

زۆر بە وردی، لە زۆر شوێن، ئەم کتێبە پیرۆزەم سەرنج دا، لە ئەنجامدا بۆم دەرکەوت:

١) کە کتێبێکی زۆر زۆر جوانە، لە بابەتی علومی حەدیسدا، هەرچی عەیبێکی ڕۆژگاربێ نیەتی، جگە لەوە کە کوردیە، چونکە جێگەی داخە کە مامۆستا بەڕێزەکانی خۆمان هەتا ئەلحال، بە چاوی ڕێزی تەواو تەماشای کوردی ناکەن، پەنا بەخوا لە هەڵەی وا !

٢) بەڕاستی کە تەماشای زنجیرەی ناوی سەرچاوەکانی کتێبەکە دەکەیت، ئەوسا دەزانیت کە زانستی فەرموودە چەندە گرنگی پێ دراوە، ولە ولاتی ئێمەدا چەندە بێ نازە !

٣) بەهەرحاڵ ئەم جۆرە کتێبە پسپۆڕ پسپۆڕتر دەکات، سوود بە هەموو کەس دەگەیەنێ، زەخیرەیەکە بۆ ڕۆژی قیامەت.

لە خوای گەورە وسەروەر داواکارم کە پیت وفەڕ وبەرەکەت بخاتە تەمەن وقەڵەم وبەرهەمی مامۆستا مەلا (أمجد)ەوە. بەپشتی خودا هەروایش دەبێ.

سوپاس بۆ خودا کە گەنجی وەك کاك (أمجد) لە ولاتماندا هەیە.

خودایە لە پیت وفەڕی ئەم بەرهەمە پیرۆزە بێ بەشمان نەکەیت. آمين

خادم العلماء والمشايخ والفقراء

نوری فارس حەمە خان

٨ / ١١ / ٢٠١٠

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

خوایە هەرچی سوپاس وستایشە هەر شایستەی زاتی پاکی تۆیە، بەدیهێنەر وپەروەردگاری، ژیان ومردن بەدەستی تۆیە، ئەوەندەی کە لێمان ڕازی دەبیت سوپاست دەکەین، ئەگەرچی بێ دەسەلاّت ونەتوانکارین لەبەرامبەر شوکرانەبژێری ناز وبەخششەکانت.

هێندەی کە پێت خۆشە، درووود وسەلام وسۆز ومیهرت برژێنە بەسەر گەورە وسەردار وپێشەوا ورێنموویکار، ڕووناکی دڵی هەموو ئیمانداران، پێشەوا وڕابەر وگەورەی پێغەمبەران، حەزرەتی (مُحَمَّد) پێغەمبەری ئاخر زەمان.

هەروا برێژە بارانی سۆزت بەسەر تەواوی ئالوبەیتی ئەو سەروەرە، وهاوەلاّن وشوێنکەوتوانی بەرنامە ورێبازەکەی ئەو گەوهەرە، تاکەسێ پابەندی دینە، لەسەر تەختی ئەم زەمینە.

زانایانی ئەم ئاینەش، فیداکاران ودڵسۆزانی ئەم بەرنامەیە، ئەوانەی کە هەموو تەمەنیان خەرج کرد، لەڕێی خزمەتکاری ئەم ڕێبازە، وگەیاندنی ئەم جێگای ئومێد ونیازە، نەوە لەدوای نەوە، تاوەکو ئێمە، خوایە بەختەوەریان بکەیت، سەربەرز وپایەدارتریان بکەیت، لە باخی پڕ بەروبووم وڕازاوەی بەهەشتدا سەرفراز وئاسوودەیان بکەیت.

آمین، یا مجیب السائلین



# پێشەکی

سەرچاوەی سەرەکی دەرهێنان وهەڵێنجانی ئەحکامە شەرعیەکان بریتیە لە قورئانی پیرۆز کە فەرمایشتی خوای پەروەردگارە، وە فەرموودە وحەدیسەکانی پێغەمبەر، کە ئەویش هەر سەرچاوەی لە وەحیی خواییەوە وەرگرتووە.

بۆیە بایەخدارترین زانست کە زانایان خۆیان پێوە خەریك کردووە وتەمەنی خۆیان لە پێناودا خەرج کردووە، بریتین لەو زانستانەی کە پەیوەندیان بەم دوو سەرچاوە سەرەکییەوە هەیە.

ئەوەتا شانبەشانی ئەو زانایانەی کە خۆیان بە زانستە تایبەتەکانی قورئانی پیرۆزەوە خەریك کردووە، کۆمەڵێکی تر لە زانایان خەریك بوون بە کۆکردنەوە ورِوونکردنەوە وشیکردنەوە ولێکۆڵینەوەی فەرموودەکانی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، پاشان دانانی کۆمەڵێك یاسا ورِێسا بۆ جیاکردنەوەی حەدیسی (صحیح) لە حەدیسی غەیرە (صحیح)، وە بۆ زانینی چۆنێتی پێوەرگرتن وبەبەڵگە حسێب کردنی حەدیسێك، یان پێ وەرنەگرتن ورەد کردنەوەی ئەو حەدیسە، وە بۆ زانینی ئەحواڵی ئەو کەسانەی کە حەدیسیان رِیوایەت کردووە.

سەبارەت بە دانانی ئەو رِێسا گشتیانە زانایان فەرموویانە: سەرەتاکەی دەگەرِێتەوە بۆ ئیمامی شافیعی، لە هەردوو کتێبی (الرسالة، والأم)، پاش ئەویش ئیمامی موسلیم، کە لە پێشەکی صەحیحەکەیدا هەندێك لەو رِێسایانەی باس کردووە، پاش ئەویش ئیمامی ئەبو داوودی سەجستانی، وپاش ئەویش ئیمامی (ترمذي). ئیتر هەر لەو سەردەمەدا چەند زانایەکی تریش لە کتێب ونوسراوەکانیاندا ئاماژەیان بە ژمارەیەك لەو رِێسایانە کردووە، تاکو گەیشتە ساڵانی نیوەی یەکەمی سەدەی چوارەمی کۆچی، ئەوجا بۆ یەکەم جار کتێبی سەربەخۆ وتایبەت بەو رِێسا گشتیانە وزاراوە تایبەتەکانی زانستی فەرموودەناسی دانرا.

- یەکەم کتێبێکی تایبەت کە لەم زانستەدا دانراوە بریتیە لە کتێبی[1]: (المحدِّث الفاصل بين الراوي والواعي)، کە دانراوی (القاضي أبو محمد الحسن بن عبد الرحمن بن خلاد الرامَهُرْمُزِي)ە، کە زۆرێك لە بابەتەکانی ئەم زانستەی لەخۆ گرتووە، بەڵام گشتگیر نیە.

(١) بروانە: الرسالة المستطرفة لبيان مشهور كتب السنة المصنفة، محمد بن جعفر الكتاني / ٢١٥ – ٢١٧، والنكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ٩، وتدريب الراوي شرح تقريب النواوي، الإمام السيوطي / ٢١ – ٢٢، ومنحة المغيث شرح ألفية العراقي في الحديث، الشيخ محمد إدريس ألكاندهلوي / ٣٢ – ٤٠، وأصول الحديث، علومه ومصطلحه، الدكتور محمد عجاج الخطيب / ٤٨٠ – ٤٨٧.

- پاش ئەو ئیمامی حاکیمی نەیسابووری خاوەنی کتێبی: (المستدرك)، هات وکتێبێکی دانا بە ناوی: (**معرفة علوم الحديث**)، کە باسی پەنجا جۆر زاراوەی حەدیسی کردووە، بەڵام ئەمیش هەر گشتگیر نەبووە، وتایبەت وپوخت کراویش نەبووە.
- پاش ئەو زانای پایەبەرز (**أبو نعيم الأصبهاني**) خاوەنی کتێبی: (**حلية الأولياء**) هات، و لەسەر ئەو کتێبەی ئیمامی حاکیم (مستخرج)ێکی دانا، وهەندێك بابەتی بۆ زیاد کرد، کە لەودا نەبورن، بەڵام هەندێك بابەتی تر کە پێویستیان بە باس لێوە کردن هەبووە، ئەو باسی نەکردوون، بۆیە زانایانی پاشتر باسیان لێوە کردوون.
- پاش ئەویش زانای پایەدار (**أبو بكر أحمد بن علي بن ثابت**) ناسراو بە (**الخطيب البغدادي**) هات، وکتێبێکی دانا بە ناوی: (**الكفاية في علم الرواية**)، پاشان کتێبێکی تری دانا لە باسی ئادابی ئەو کەسانەی کە حەدیس ڕیوایەت دەکەن، بە ناوی: (**الجامع لآداب الشيخ والسامع**)، ئیتر هەر بەم جۆرە، کەم بابەتی ئەم زانستی فەرموودەناسییە هەیە کە ئەم کتێبێکی تێدا دانەنابێت، هەر بۆیە زانای ناودار (**ابن نقطة الحنبلي**) لە وەسفیدا فەرموویەتی: ئەوەی کە ویژدانی هەبێت، دەزانێت کە هەموو فەرموودەناسانی پاش (**الخطيب البغدادي**) ئەرك بوون لەسەر کتێبەکانی ئەو، وسوودیان لەو کتێبانە بینیوە.
- پاش ئەویش زانای گەورە (**القاضي عياض بن موسى اليحصبي**) هات، وکتێبێکی کورت و جوانی لەم بارەیەوە دانا، بە ناوی: (**الألماع إلى معرفة أصول الروايات وتقييد السماع**).
- پاش ئەویش زانای ناودار (**أبو حفص الميانجي**) هات، و کتێبێکی دانا بە ناوی: (**مالا يسع المحدث جهله**)، پاشان زانای گەورە (**أبو جعفر عمر بن عبد المجيد المقدسي**) ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر نووسی، بە ناوی: (**إيضاح مالا يسع المحدث جهله**).
- ئیتر هەر بەم شێوەیە کتێب دەنوسرا ودادەنرا لەسەر ئەم زانستە، هەندێك بە درێژی، تاوەکو تەواوی بابەتەکان بگرێتەوە، وهەندێکیش بە کورتی، بۆ ئەوەی بە باشی وەربگیردرێت وتێگەیشتنی ئاسان بێت، تاوەکو گەیشتە سەردەمی زانای گەورە وشۆڕەسواری ئەم مەیدانە، گەنجینەی زانست، فەرموودەناس وشەرعزان وتەفسیرزان، خواناسی ڕاساڵ، کوردی کوردستانی، شارەزووری بەناوبانگ: (**تقي الدين أبو عمرو عثمان بن صلاح الدين عبد الرحمن بن عثمان الكردي الشهرزوري الشافعي**) هات، کتێبە بەناوبانگەکەی دانا بە ناوی: (**علوم الحديث**)، کە دواتر بە: (**مقدمة ابن الصلاح**) ناوی دەرکرد، کە زۆربەی زۆری باسەکانی ئەم زانستە گەورەیەی

تێدا کۆکردەوە، بە پوختی وبە ڕێکی باسی کردوون، بە سوود وەرگرتن لەو سەرچاوانەی کە پێش ئەو لەم زانستەدا نووسرابوون، توانی شەست وپێنج جۆر لە باس وزاراوەکانی بە پێناسە ونموونە وڕوونکردنەوە وبۆچوونە بتەوەکانی خۆی، لەو کتێبەدا کۆبکاتەوە.

بۆیە دواتر ئەم کتێبەی شێخی شارەزووری لە نێو زانایاندا بە جوانترین وباشترین کتێب ناسرا لەم زانستەدا،[1] و بایەخێکی تایبەتیان پێدا، ئەوەش وەهای کرد کە زۆرینەی فەرموودەناسانی دوای ئەو هەر لەسەر هەمان پەیڕەوی ئەو بڕۆن لە دانانی کتێبەکانیاندا، بەڵکو زیاد لەوە، چەندین زانا هەستاون بە کورت کردنەوەی، یان نووسینی ڕوونکردنەوە لەسەری، یان کردنی بە هۆنراوە.

---

(١) لەم بارەوە زانایان وتەی زۆریان فەرموود لە وەسفیدا، لەوانە: (الإمام النووي، وابن خلكان، والذهبي، وابن كثير، والسبكي، وابن الحاجب، والسخاوي، وابن عماد الحنبلي، وابن الرشيد السبتي، وابن جماعة، والزركشي، والأبناسي، وابن الملقن، والحافظ العراقي، وابن حجر العسقلاني، والسيوطي). بڕوانە: پێشەکی توێژینەوە ولێکۆڵینەوەی هەردوو دکتۆر (عبد اللطيف الهميم وماهر ياسين الفحل) لەسەر کتێبی: (شرح التبصرة والتذكرة)ی عێراقی / ١ / ١٥ - ١٦، هەروەها بڕوانە پێشەکی توێژینەوە ولێکۆڵینەوەی دکتۆر (زين العابدين بن محمد بلا فريج) لەسەر کتێبی: (النُّكَت على مقدمة ابن الصلاح)ی زەرکەشی / ١ / ٤٦ – ٤٩، وە پێشەکی توێژینەوە ولێکۆڵینەوەی دکتۆر (أسامة بن عبد الله خياط) لەسەر کتێبی (التقييد والإيضاح لما أطلق وأغلق من كتاب ابن الصلاح)ی (الحافظ العراقي) / ١ / ٤٢ - ٤٤.

یەکێك لە قوتابیەکانی شێخی شارەزووری بەناوی (محمد بن أحمد بن خليل بن سعادة الخويي)، هەستاوە کتێبەکەی شێخی شارەزووری کردووە بە هۆنراوە، ولە سەرەتاکەیدا فەرموویەتی:

وخيرُ ما صُنِّفَ فيــها، واشتَهَر — كـتابُ شَيْخِنا الإمامِ المعْتَبَر

وهو الذي بابنِ الصَّلاحِ يُعرَفُ — فَلَيْسَ مِنْ مِثــالِهِ مُصَنَّفُ

واتە:

بــاشـتریــن کتێب کـە دانرابێ — ناوبـانگی لەنـاو زانـایان مــابێ

کتێبی شێخی شارەزووری ژیــر — (ابن الصلاح)ە، بێ وێنەو نەزیــر

هەر بۆیە زانای خوانـاسی تەمەن وقەڵەم نوورین، جێگە شانازی زانایانی کورد، مامۆستای مامۆستاکان، جەنابی خوالێخۆشبوو مامۆستا عەبدولکەریمی بیارە (خوای گەورە پایەدارتری بکات)، بە هەوڵ وکۆششێکی بێ وێنە لە کوردەواریدا، هەستاوە بە نووسینی کتێبێك لەم زانستەدا بە ناوی (ڕێگەی ڕەهبەر)، کە وەکو بڵێیت: کتێبەکەی شێخی شارەزووری وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، وهەندێك بابەتیشی بەپێی پێویست بۆ زیاد کردووە، وەکو لە سەرەتاکەیدا دەفەرموێت:

ئەغڵەب هێناومە بە هیوای نەجاح — لـە تەئلیفەکەی شێخ (ابن الصلاح)

مەشهـوور لە نـاوا بە شــارەزووری — پیــرۆز بێ قەصری قەبری پڕ نـووری

لە نموونەی کورتکراوەکان:

١) (إرشاد طلاب الحقائق إلى معرفة سنن خير الخلائق)، کە ئیمامی نەواوی دایناوە، پاشان ئەویشی کورتتر کردۆتەوە وناوی ناوە: (التقريب والتيسير لمعرفة سنن البشير النذير)، کە دواتر ئیمامی (سيوطي) شەرحی کردووە بە ناوی: (تدريب الراوي).

٢) الاقتراح في بيان الاصطلاح. کە زانای ناودار (ابن دقيق العيد) دایناوە. پاشان ئیمامی (ذهبي) هەستاوە بە کورت کردنەوەی ئەم کتێبە، وناوی ناوە (الموقظة في علم مصطلح الحديث).

٣) (الخلاصة في أصول الحديث) کە دانراوی زانای گەورە (الحسين بن عبد الله الطيبي)یە.

٤) (اختصار علوم الحديث)، کە شێخی (ابن كثير) دایناوە، پاشان مامۆستای پایەبەرز (أحمد شاكر) شەرح وتەحقیقی کردووە، وناوی ناوە (الباعث الحثيث شرح اختصار علوم الحديث).

٥) (المنهل الروي في مختصر علوم الحديث النبوي) کە زانای پایەبەرز (بدر الدين بن جماعة الكناني) دایناوە وچەند باسێکی تری بۆ زیاد کردووە.

٦) (المقنع في علوم الحديث)، کە دانراوی زانای گەورە (سراج الدين عمر بن علي بن أحمد الأنصاري)ە، کە بە (ابن الملقّن) بەناوبانگە.

٧) (محاسن الإصلاح في تضمين كتاب ابن الصلاح) کە زانای پایەدار (أبو حفص سراج الدين عمر بن رسلان البلقيني) دایناوە وچەند باسێکی تریشی بۆ زیاد کردووە.

٨) (نخبة الفكر في مصطلح أهل الأثر)، کە شێخی عەسقەلانی دایناوە، کە دواتر لەلایەن خۆی وکەسانی تردوە چەندین شەرح وحاشیەی لەسەر نوسراوە، وکراویشە بە هۆنراوە.

چەندین زانای گەورەش نوکەت وشەرحیان لەسەر کتێبەکەی شێخی شارەزووری نووسیوە، لەوانە: (البدر الزركشي والحافظ العراقي وإبراهيم الأبناسي والحافظ ابن حجر العسقلاني)، بە هەرچوار ناونیشانی:

- النكت على مقدمة ابن الصلاح. للزركشي.
- التقييد والإيضاح لما أطلق وأغلق من كتاب ابن الصلاح. للحافظ العراقي.

- الشذا الفياح من علوم ابن الصلاح. للأبناسي
- النكت على كتاب ابن الصلاح. للعسقلاني.

پاشان (الحافظ العراقي) هەستاوە کردوویەتی بە هۆنراوەو، وبۆشی زیاد کردووە، وئێستا بە (ألفية العراقي) بەناوبانگە. کە دواتر چەندین شەرحی لەسەر کراوە لەلایەن دانەر خۆی وچەندین زانای تریشەوە، لەوانە:

- شرح التبصرة والتذكرة. الحافظ العراقي.
- صعود المراقى شرح الفية العراقى. الخضيري الدمشقي.
- فتح المغيث شرح ألفية الحديث. شمس الدين السخاوي.
- فتح الباقي بشرح ألفية العراقي. القاضي زكريا الأنصاري.
- منحة المغيث شرح الفية العراقى في الحديث. للشيخ محمد إدريس ألكاندهلوي.

پاش ئەویش ئیمامی (سیوطي) هەستاوە پوختەی ئەلفیەکەی ئەوی لە ئەلفیەیەکی خۆیدا کۆکردۆتەوە، ئەویش هەم خۆی وهەم زانایانیش شەرحیان لەسەر کردووە.

ئیتر هەر بەم شێوەیە زانایان بەردەوا بوون لە دانانی کتێب لەم زانستەدا، کە گرنگترینیان:

- قفو الأثر في صفوة علوم الأثر.محمد بن إبراهيم الحلبي، کە بەناوبانگە بە (ابن الحنبلي).
- توضيح الأفكار لمعاني تنقيح الأنظار.محمد بن إسماعيل الأمير الحسني الصنعاني.
- قواعد التحديث من فنون مصطلح الحديث. جمال الدين القاسمي الدمشقي.
- توجيه النظر إلى أصول الأثر. طاهر الجزائري الدمشقي.
- الوسيط في علوم ومصطلح الحديث. محمد بن محمد أبو شهبة.
- أصول الحديث علومه ومصطلحه. الدكتور محمد عجاج الخطيب.
- علوم الحديث ومصطلحه. الدكتور صبحي الصالح.
- المنهج الحديث في علوم الحديث. الدكتور الشيخ محمد محمد السماحي.

شایانی وتنە کە لە سالآنی سەدەی یانزەیەمی کۆچیدا زانای پایەبەرز عومەری کوڕی موحەمەدی بەیقوونی دیمەشقی شافیعی هۆنراوەیەکی لەم زانستەدا داناوە، ئەگەرچی زۆر کورتیشە، بەلآم بۆ کەسانی سەرەتایی وتازە ناشنابوان بەم زانستە زۆر بەسوودە.

منیش بینیم كه ئه‌م هۆنراوه‌یه‌، له‌ جیهانی ئیسلامی وعه‌ره‌بیدا بایه‌خێكی به‌رچاوی پێدراوه‌، وچه‌ندین شه‌رح وحاشیه‌ی له‌سه‌ر نووسراوه‌،[1] وله‌ زۆرێك له‌ مزگه‌وت وفێرگا

(١) له‌وانه‌:

١) شه‌رحی زانای پایه‌به‌رز الحافظ محمد بن عبد الباقي بن يوسف الزُّرْقانيّ الشافعي، كه‌ به‌ گرنگترین شه‌رح هه‌ژمار ده‌كرێت. كه‌ دواتر یه‌كێك له‌ زانایان به‌ ناوی عطية بن عطية الأجهوري حاشیه‌ی له‌سه‌ر نووسیوه‌.

٢) شه‌رحی زانای پایه‌به‌رز عبد القادر بن جلال الدين المحلي الشافعي، به‌ ناوی: فتح القادر المغيث بشرح منظومة البيقوني في علم الحديث .

٣) شه‌رحی زانای پایه‌به‌رز شهاب الدين أبو العباس احمد بن محمد الحسيني الحموي الحنفي المصري.

٤) شه‌رحی زانای پایه‌به‌رز شمس الدين محمد بن محمد البديري الدمياطي، كه‌ به‌ ابن الميت به‌ناوبانگه‌، به‌ ناوی: صفوة الملح بشرح البيقونية في المصطلح .

٥) شه‌رحی زانای پایه‌به‌رز الشيخ محمد بدر الدين بن يوسف المدني الدمشقي، به‌ ناوی: الدرر البهية في شرح المنظومة البيقونية.

٦) شه‌رحی زانای پایه‌به‌رز الشيخ محمد بن خليفة بن حمد النبهاني الطائي المكي المالكي، به‌ ناوی: النخبة النبهانية.

٧) شه‌رحی زانای پایه‌به‌رز الشيخ عبد الله سراج الدين الحلبي.

٨) زانایه‌كی كوردیش به‌ ناوی مصطفى بن ملا محمد الكردي شه‌رحێكی كردووه‌ به‌ ناوی: كشف الظنون والدرالمصون بشرح متن البيقون، كه‌ تاوه‌كو ئێستاش هه‌ر ده‌ستنووسه‌ له‌ (دار المخطوطات) له‌ به‌غداد.

٩) شه‌رحی زانای پایه‌به‌رز الشيخ العلامة الأثري السيد أبي الطيب صديق بن حسن خان القنوجي البخاري الهندي، به‌ ناوی: العرجون في شرح البيقون.

١٠) هه‌ردوو زانای پایه‌به‌رز الشيخ عبد الرحمن بن سلمان بن يحيى الأهدل، ومحمود بن محمد بن عبد الدائم نشابة الطرابلسي الشامي حاشییه‌یان له‌سه‌ر كردووه‌.

١١) ئه‌مانه‌ وچه‌ندین شه‌رحی تریش له‌لایه‌ن هه‌ریه‌كه‌ له‌م زانایانه‌وه‌: (محمد عثمان بن محمد المكي الميرغني، وحسن بن غالي الأزهري المالكي الخداوي المصري، وزين بن احمد بن زين الصياد المرصفي الازهري الشافعي، وعبد الغني بن محمد السوداني البرهاني المالكي، ومحمد بن معدان الحاجري الشهير بمحمد حاد المولى الفقيه الشافعي. ئه‌م زانیاریانه‌م به‌ كورتی له‌ شه‌رحی (عبد الله جاسم الجنابي) نقلّ كردووه‌.

١٢) هه‌روه‌ها چه‌ند شه‌رحێكی تریش كراوه‌ له‌لایه‌ن: (محمد بن صالح العثيمين، وعبد الله بن عبد الرحمن الجبرين، وحسن محمد المشاط، وعبد الله جاسم الجنابي، وأبو الحسن مصطفى بن إسماعيل السليماني، وأحمد بن حمود الخالدي، وسليمان بن خالد الحربي، وعبد الكريم بن عبد الله الخضير). كه‌ هه‌موو ئه‌م شه‌رحانه‌ له‌سه‌ر (CD) المكتبة الشاملة له‌ ریزی كتێبه‌كانی (مصطلح الحديث)دا ده‌ست ده‌كه‌ون. كه‌ به‌لای منه‌وه‌ باشترینیان شه‌رحه‌كه‌ی (أبو الحسن مصطفى بن إسماعيل السليماني)ه‌، به‌ ناوی (الجواهر السليمانية على المنظومة البيقونية).

ئاینیەکاندا وەکو کتێبێکی مەنهەجی بە وانە دەوترێتەوە، بەڵام بەداخەوە تاوەکو ئێستا نەمبینیوە کە کەسێك هەوڵی دابێت ئەو هۆنراوەیە بکات بە کوردی، وڕوونکردنەوەیەکی وەهای لەسەر بنوسێت کە قوتابیانی ئێمەش لە فەڕ وبەرەکەتی ئەو هۆنراوەیە وئەو زانستەی کە تێیدا دانراوە بێ بەش نەبن.

بۆیە بە یارمەتی خوای گەورە دەستم دایە شەرح کردن وڕوونکردنەوەی ئەو هۆنراوەیە،[1] بە ئامانجی دەست خستنی چەند مەبەست وهیوایەك:

١) ئومێدم هەیە ئەم کارە خوای گەورە بە کەرەمی خۆی بەچاکە لێم وەربگرێت، وبۆ پاشەڕۆژم ببێت بە خێر. حەزرەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) دەفەرموێت: (إِنَّ مِمَّا يَلْحَقُ الْمُؤْمِنَ مِنْ عَمَلِهِ وَحَسَنَاتِهِ بَعْدَ مَوْتِهِ عِلْمًا عَلَّمَهُ وَنَشَرَهُ....)[2].

---

(١) ئەم بیرۆکەیەم کاتێك بۆ درووست بوو کە لە خانەقای پیرۆزی بیارەدا لە ساڵانی (١٩٩٩ - ٢٠٠١)ی زاینی، پاش ئیجازە وەرگرتنی خۆم لە خزمەت زانای گەورە وخواناسی نووورانی (مەرحوومی مامۆستا مەلا محمد ئەمینی کانی سانانی)، لەسەر داوای جەنابی وداوای مەرحوومی شێخ عبد الملك کوڕی شێخی سیراج الدینی دووەم، لەوێ مابوومەوە، بەهۆی بێ توانایی وبەساڵاچوون ونەخۆشی مامۆستاوە، دەرسم دەوتەوە بە فەقێکان. یەکێکیان ڕۆژێك نوسخەیەکی چاپی کۆنی شەرحێکی ئەم هۆنراوەیەی بۆ هێنام کە شێخی زورقانی کردبووی، وە حاشیەی ئەجهوریشی لەسەر بوو، داوای کرد کە پێی بڵێم، سوپاس بۆ خوای گەورە کە تەوفیقی داین، من بە وتنەوە وئەویش بە خوێندن هۆنراوەکەمان تەواو کرد. ئیتر هەر ئەو کاتە بیرم کردەوە کە ئەگەر ئەم هۆنراوەیە بە زمانی کوردی ڕوون بکرێتەوە، سوودێکی باشی دەبێت بۆ زانست خوازانی ئەم وڵاتەی ئێمەش، بەڵام بەهۆی بارودۆخی ئەو کاتەی کوردستان، وچۆڵبوونی ناوچەکە بۆ ماوەیەك، ودابڕانی ئێمە وفەقێکانیش لە خانەقا، ئیتر بۆم نەکرا کە ئەو خەیاڵەم بکەم بە واقع، وبیهێنمە دنیای بوونەوە وبەرجەستەی بکەم. وا ئێستا بە یارمەتی خوا دەرفەتم دەستکەوت بۆ بە ئەنجام گەیاندنی ئەو پرۆژەیە.

هەزاران هەزار سوپاس و سەنا		بۆ پەروەردگار، خاوەنی پەنا
هەروا درووود وسەلامی زۆری		بۆسەر پێغەمبەر وەك تیشکی خۆری
پاش ئەویش لەبۆ سەر ئال ویاران		بڕژێ بەسەریان وەك تاوی باران
وەك شوێنکەوتوان ئێمەش بەرکەوین		با ئاسوودەبین، تا ماوین لە ژین

(٢) سنن ابن ماجة / افتتاح الكتاب في الإيمان وفضائل الصحابة والعلم / باب ثواب معلم الناس الخير / حەدیسی ژمارە ٢٤٢. شێخی (المنذري) فەرموویەتی: رواه ابن ماجه بإسناد حسن والبيهقي ورواه ابن خزيمة في صحيحه مثله. بڕوانە: الترغيب والترهيب من الحديث الشريف / ١ / ٥٥ / حەدیسی ژمارە ١٢٣. عبد العظيم بن عبد القوي المنذري، دار الكتب العلمية — بيروت، الطبعة الأولى، ١٤١٧، تحقيق: إبراهيم شمس الدين. وە شێخی (العجلوني)یش پاش ئەوەی کە دەقی حەدیسەکە بە (عِلْماً نَشَرَهُ) دەهێنێت، دەفەرموێت: مانای ئەم فەرموودەیە، هەم کتێب دانان، وهەم دەرس وتنەوەش دەگرێتەوە، بەڵام زیاتر کتێب دانانەکە، چونکە زیاتر دەمێنێتەوە، ووشەی (نشر)یش زیاتر بۆ نووسین وبڵاوکردنەوە بەکار دەهێنرێت، نەك فێرکردن. بڕوانە: كشف الخفاء ومزيل الالباس عما اشتهر من الاحاديث على ألسنة الناس، العجلوني،إسماعيل بن محمد الجراحي / ١ / ٥.

٢) بەڵكو ئەگەر بتوانم لەم بوارەدا، كە بەداخەوە لە كوردستاندا زۆر غەریب بووەتەوە !!! سوودێك بە خوێندەواران وقوتابیانی كوردی موسوڵمان ونەوەكانی شێخی شارەزووری وشوێنكەوتوانی قورئان وحەدیسی حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) بگەیەنم، ئەگەر چی خۆشم بە ئەهل نازانم، بەڵام وەكو ئەمانەتێكی زانستی هەوڵ دەدەم كە تەواوی ئەو زانیاریانەی لەم ڕوونكردنەوەدا دەیانهێنم، هەمووی لە سەرچاوە متمانەدارەكانی ئەم زانستەوە نقڵ بكەم.

٣) بەڵكو ئەم كارەی من ببێتە پاڵنەر وهاندەرێك، هەم بۆ ئەو مامۆستایانەی كە شارەزاو لێهاتوون لەم زانستەدا، بۆ ئەوەی كتێبی باشتری تێدا دابنێن، هەم هاندەرێكیش بێت بۆ قوتابیان كە قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵبماڵن، وئازایانە بچنەوە مەیدان، تاوەكو بە لوتفی خوای گەورە جارێكی تر خەڵكانێكی وەكو شێخی شارەزووری پەیدا ببنەوە، وبە زانستی خۆیان دووبارە دنیای كوردستان وجیهانی ئیسلامی پڕبكەنەوە لە نوور، وڕووی گەش ودرەوشاوەی زانایانی كورد جارێكی تر بەدەر بخەنەوە.

ئەوەی كە ماوە بیڵێم:

بە سوپاس وڕێزانینێكی زۆرەوە بۆ مامۆستای قەڵەم نوورین، گەورەو بەڕێز مامۆستا (نوری فارس)، سەرەڕای سەرقاڵی بە نووسینی خۆیەوە، هەندێك لە كاتی پڕبەهای خۆی تەرخان كرد بۆ پیاچوونەوەی ئەم بەرهەمە، تاوەكو بەم جۆرە دەربێت، وبە تێبینیەكانی دەوڵەمەند تری كرد. خوای گەورە لەبرێتی ئێمە وموسوڵمانان پاداشتی خێری بداتەوە. بەرەكەتی زیاتریش بخاتە تەمەن وتەندروستی وپێنووسە ڕەنگینەكەیەوە.

أمجد محمد زاهد شیخ محمد

دەربەندیخان

ڕەمەزانی ساڵی ١٤٣١ی كۆچی

ئابی ساڵی ٢٠١٠ی زایینی

# پەیڕەوی من لەم ڕوونکردنەوەیەدا

بێ گومان هەر کەسێك کە کارێك ئەنجام دەدات، پەیڕەو وڕێبازێکی تایبەتی خۆی هەیە، کە ڕەنگدانەوەی بیر وقەناعەتی خۆیەتی بۆ چۆنێتی جێبەجێ کردن وبەپایان گەیاندنی ئەو کارە، کە خۆی لەخۆیدا دەرئەنجامی جیاوازی بیر ولێکدانەوە وپلەی عەقڵ وزانیاری کەسەکانە، کە خوای گەورە هەر یەکێکی بە جۆرێك خەلق کردووە.

منیش لەم ڕوونکردنەوەیەمدا بۆ ئەم هۆنراوەیە، هەوڵم داوە لەسەر ئەم چەند خاڵە بڕۆم:

١) سەرەتا بۆ هەر نیوەدێڕ، یان دێڕە هۆنراوەیەك یان زیاتر کە تایبەت بێت بە جۆرێك لە جۆرەکانی حەدیس وزاراوە فەرموودەناسییەکان، هاتووم مانایەکی سادە وپوختم بۆ کردووە، بە مەبەستی نزیککردنەوەی ماناکەی لە تێگەیشتنی خوێنەران.

٢) باسی هەر جۆرە حەدیس وزاراوەیەکم، بەپێی پێویست، دابەش کردووە بۆ چەند لقە باسێك، لە پێناسە وجۆر ونموونە وحوکم وجێگەی دەستکەوتنی ئەو جۆرە حەدیسانە لە کتێب وسەرچاوە حەدیسیەکاندا.

٣) کاتێك فەرمایشت وبۆچوونی یەکێك لە زانایانم هێنابێت، ئەوە ئەگەر تەنها خۆی بوو یان دووکەس یان سێ کەس، زۆرجار هەوڵم داوە ناویان بهێنم، وبۆچوونەکە بدەمە پاڵ خۆیان، ئەگینا ئەگەر زیاتر بوون، ئەوا دەڵێم: زانایان فەرموویانە، یان بەلای زانایانەوە، یان بەلای فەرموودەناسانەوە.

٤) هەوڵم داوە ڕوونکردنەوەیەکی مامناوەند بێت، نە کورتێکی زیانبەخشی مەبەست نەگەیەنەر، نە زۆر درێژێکی ماندووکەر، کورت وپوختە کاتێك کە بەس بێت، درێژ وتەفصیلە کاتێك کە پێویست بێت.

٥) بەو پێیەی کە هەر زانستێك زاراوەی تایبەتی خۆی هەیە، وئەم کارەی منیش وەکو یەکێك لە بەرهەمە یەکەمینە کوردیەکان وەهایە لەو بوارەدا، بۆیە هاتووم هەموو

زاراوەکانم هەر وەکو خۆیان هێناوە، بەبێ وەرگێڕانیان بۆ زمانی کوردی، ئەویش تەنها لەبەر زیادە ڕوونی.

٦) سوودم لە تەواوی ئەو شەرحانە بینیوە کە بۆ ئەم هۆنراوەیە کراون، ئەوانەی کە بەردەستم کەوتوون، بەتایبەتی شەرحی زورقانی بە حاشییەی ئەجهورییەوە. بەرچاوڕوونیم لە هەموویانەوە وەرگرتووە، خوا پاداشتی خاوەنەکانیان بداتەوە، کە لەم کارەمدا فەزڵێکی تایبەتیان بەسەرمەوە هەیە. بەڵام بۆ زیاتر بەهێزی وبەپێزی ومتمانەی زانستی کارەکەم، هەوڵم داوە تەواوی زانیاریەکان بگەڕێنمەوە بۆ سەرچاوە سەرەکیە متمانەدارەکانی ئەم زانستە پیرۆزە، ئەمەش مانای تەقدیر نەکردن وهەست پێنەکردن وکەمبایەخ کردنی ئەو شەرحانە نیە!!! پەنا بەخوا، بەڵکو منیش هەر ئەوە دەڵێم ودەڵێمەوە، کە زانای نەحوزان (ابن مالك) لە دێڕی شەشەمی پێشەکی ئەلفییەکەیدا فەرموویەتی:

وَهُوَ بِسَبْقٍ حَائِزٌ تَفْضِيلاً مُسْتَوْجِبٌ ثَنَائِيَ الْجَمِيلا

٧) لە هێنانەوەی نموونە بۆ جۆرەکانی حەدیس وزاراوە فەرموودەناسیەکان بەگشتی، نموونەکانم وەکو خۆی بە زمانی عەرەبی هێناوە وبەس، ئیتر خۆم نەگەیاندوەتە لێکدانەوە وڕاڤەکردنی ماناکانیان.

٨) شانبەشانی هۆنراوەکەی مامۆستا، منیش هۆنراوەیەکم بە زمانی شیرینی کوردی لەسەر هەمان ئەو جۆرە حەدیس وزاراوانە داناوە، کە مامۆستا ناوی بردوون، هیوام وایە جێگەی سوود بێت، وناوم لێ ناوە: ((دیاری دەربەندیخانی لە زانستی فەرموودەی پێغەمبەری نوورانی)).

# ( متن المنظومة البيقونية )

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ

| | |
|---|---|
| أَبْـدَأُ بِـالْحَمْدِ، مُصَـلِّيًا عَلَى | مُحَمَّـدٍ خَيْـرِ نَبِيٍّ أُرْسِـلاَ |
| وَذِي مِنَ اقْسَـامِ الْحَدِيْثِ عِدَّهْ | وَكُـلُّ وَاحِـدٍ أَتَى وَحَـدَّهْ |
| أَوَّلُهَا الصَّحِيحُ وَهْـوَ مَـا اتَّصَلْ | إِسْنَـادُهُ، وَلَـمْ يَشُذَّ، أَوْ يُعَلْ |
| يَرْوِيـهِ عَـدْلٌ ضَابِطٌ عَنْ مِثْلِهِ | مُعْتَمَدٌ فِي ضَبْطِـهِ وَنَقْـلِهِ |
| وَالحَسَنُ المعْرُوفُ طُرْقـاً، وَغَدَتْ | رِجَـالُهُ، لاَكَالصَّحيحِ اشْتَهَرَتْ |
| وَكُلُّ مَا عَنْ رُتْبَـةِ الحُسْنِ قَصُرْ | فَهْوَ الضَّعِيفُ، وَهْوَ أَقْسَامًا كَثُرْ |
| ومَـا أُضِيـفَ للنَّبِي المرْفُـوعُ | وَمَـا لِتَـابِعٍ هُـوَ المقْطُـوعُ |
| وَ المسْنَدُ المتَّصِلُ الإِسْنَـادِ مِـنْ | رَاوِيـهِ حَتَّى المصْطَفَى، وَ لَمْ يَبِنْ |
| ومَـا بِسَمْعِ كُـلِّ رَاوٍ يَتَّصِـلْ | إِسْنَـادُهُ لِلْمُصْـطَفَى، فَالْمُتَّصِـلْ |
| مسَلْسَلٌ قُلْ مَا عَلَى وَصْفٍ أَتَى | مِثْلُ أَمَـا وَاللهِ، أَنْبَـانِي الفَتَى |
| كَـذَاكَ قَـدْ حَدَّثَنِيهِ قَائِمَـا | أَوْ بَعْـدَ أَنْ حَـدَّثَنِي تَبَسَّمَـا |
| عـزِيـزُ مَرْوِي اثْنَيْنِ أَوْ ثَـلاَثَـة | مَشْهُـورُ مَروِيْ فَوْقَ مَـا ثَلاَثَة |
| معَنْعَنٌ كَعَنْ سَعِيدٍ عَنْ كَـرَمْ | وَمُبْهَمٌ مَـا فِيهِ رَاوٍ لَمْ يُسَمْ |
| وَكُـلُّ مـا قَلَّتْ رِجَـالُهُ عَـلاَ | وَضِـدُّهُ ذَاكَ الَّـذِي قَـدْ نَزَلاَ |
| وَمَا أَضَفْتَهُ إِلَى الأَصْحَـابِ مِـنْ | قَـوْلٍ وَفِعْـلٍ فَهْوَ مَوْقُوفٌ زُكِنْ |
| وَمُرْسَلٌ مِنْهُ الصَّحَـابِيُّ سَقَـطْ | وَقُـلْ غَرِيبٌ مَا رَوَى رَاوٍ فَقَطْ |

وَكُلُّ مَـا لَـمْ يَتَّصِلْ بِحَـالِ    إسْنَـادُهُ مُنْقَطِعُ الأوْصَـالِ
وَالمعْضَلُ السَّـاقِطُ مِنْهُ اثْنَـانِ    وَمَـا أتَى مُـدَلَّسـاً نَوْعَـانِ
الأوَّلُ الإسْقَـاطُ للشَّيْـخِ، وَأنْ    يَنْقُـلَ عَمَّـنْ فَـوقَـهُ بِعَنْ وَأنْ
وَالثَّانِ لا يُسْقِطُـهُ لـكِنْ يَصِـفْ    أوْصَـافَـهُ بِمَـا بِهِ لاَ يَنْعَرِفْ
وَمَا يُخالِفْ ثِقَـةٌ بِـهِ المـلاَ    فَـالشَّـاذُ، وَالمقْلُوبُ قِسْمانِ تَلاَ
إبْدَالُ رَاوٍ مَـا بِرَاوٍ قِسْـمُ    وَقَلْبُ إسْنَـادٍ لِمَتْنٍ قِسْـمُ
وَالْفَرْدُ مَـا قَيَّدْتَـهُ بِثِقَـةِ    أو جَمْـعٍ أوْ قَصْرٍ عَلَى رِوايَـةِ
وَمَـا بِعِلَّةٍ غُمُـوضٍ أوْ خَفَـا    مُعَلَّـلٌ عِنْـدَهُـمُ قَـدْ عُرِفَـا
وَذُو اخْتِلاَفِ سَنَـدٍ أوْ مَتْـنِ    مُضْطَرِبٌ، عِنْـدَ أُهَيْـلِ الفَـنِّ
وَالمدْرَجَاتُ فِي الْحَدِيثِ مَا أتَـتْ    مِنْ بَعْـضِ ألْفَـاظِ الرُّوَاةِ اتَّصَلَتْ
وَمَـا رَوَى كُـلُّ قَرِينٍ عَنْ أخِـهْ    مُـدَبَّجٌ، فَـاعْرِفْهُ حَقّـاً وَانْتَخِهْ
مُتَّفِـقٌ لَفْظـاً وخَطّـاً مُتَّفِقْ    وَضِدُّهُ فِيـمَـا ذَكَرْنَـا المفْتَرِقْ
مُـؤْتَلِـفٌ مُتَّفِـقُ الخَـطِّ فَقَـطْ    وَضِدُّهُ مُخْتَلِفٌ، فَـاخْشَ الغَلَـطْ
وَالمنْكَرُ الفَـرْدُ بِـهِ رَاوٍ غَـدَا    تَعْدِيـلُـهُ لاَ يَحْمِـلُ التَّـفَـرُّدَا
مَتْرُوكُهُ مَـا وَاحِـدٌ بِـهِ انْفَرَدْ    وَأجْمَعُوا لِضَعْفِهِ، فَهْـوَ كَـرَدْ
وَالْكَـذِبُ المخْتَلَـقُ المصْنُـوعُ    عَلَى النَّبِي، فَذَلِـكَ الموْضُـوعُ
وَقَـدْ أتَتْ كَـالجَوْهَرِ المكْنُـونِ    سَمَّيْتُهَـا (مَنْظُومَـةَ البَيْقُـونِي)
فَـوْقَ الثَّلاثِيـنَ بِـأرْبَـعٍ أتَـتْ    أبْيَـاتُهَـا تَمَّتْ، بِخَيْرٍ خُتِمَتْ

# ( دیاری دەربەندیخانی )

## لە زانستی فەرموودەی پێغەمبەری نوورانی

خوایە بە ناوی پڕ میهر وسۆزت     وا دەست پێدەکات بەندەی دڵسۆزت
سوپاس لە بۆ تۆ، درووديش لەسەر     گەورەی نێرراوان ڕابەر وسەروەر
چەندین جۆر حەدیس وا لەم هۆنراوە     پێناسەش بۆ گشت جۆرێ هێنراوە
یەکەم (صحیح)ە، زنجیرەی مەوصول     کە نابێ (شاذ) بێ، وە نابێ (معلول)
ڕاویەکانیش هەموو بە پارێز     (عادل وضابط) بیرتیژ وبەرێز
بیرتیژی ڕاوی حەدیسی (حسن)     کەمتر لە ڕاوی (صحیح)ی پەسەن
کەمتر لە پلەی (حسن)ی شەریف     گەلێك جۆری هەن، ناسراو بە (ضعیف)
پاڵدراو بۆ لای حەزرەت (مَرْفُوع)ە     بۆ لای تابیعیش، بڵێ (مَقْطُوع)ە
گەر بچڕانیش نەبوو لە سەنەد     هەتاکو حەزرەت، پێی بڵێ (مُسْنَد)
(مُتَّصِل) واتە: هەتا پێغەمبەر     ڕاوی لە ڕاوی بیستبێت خەبەر
(مُسَلْسَل) بڵێ: لە سیفەتێکا     ڕاوی هاوبەشن، یان وتەیێکا
وەك: پێدەکەنی، یان ڕاوەستا بوو     یاخود شتێکی لەناو دەستا بوو
ڕاوی حەدیسی (عَزِیز) دوو یا سێ     بۆ (مَشْهور) دەبێ زیاتربێ لە سێ
لە ڕیوایەتا گەر وترا: (عَنْ، عَنْ)     تۆ بەو حەدیسە بڵێ: (مُعَنْعَن)
(مُبْهَم)یش لەبۆ حەدیسێك ناوە     یەك لە ڕاوییان ناو نەبراوە
وتە وکرداری بە هاوەڵ مەعروف     فەرمودەناسان پێی دەڵێن (مَوْقُوف)
(مُرْسَل) هاوەڵی تیا لابراوە     یەك ڕاوی هەبوو، (غَریب)ی ناوە
(مُنْقَطِع) ئەگەر زنجیرەی ڕاوی     بچڕانی تیابوو، وەهایە ناوی
(مُعْضَل)یش بڵێ حەدیسێ وایە     بە تەرتیب دوو کەس لێی لابرایە
(مُدَلَّس) دەڵێن: ئەویش دوو جۆرە     وا دەیانهێنم هەردووك بە نۆرە

یەکەم نەوەیە کە شێخ لابیرێ        حەدیس لەژوور ئەو ڕیوایەت بکرێ
بە (عَنْ) یاخود (أَنْ)، دووەمیش باسی        شێخ وەها دەکا، ڕەنگە نەیناسی
پێی بڵێ (شاذ)ە، گەر کەسێ (مَوثوق)        بێنێ، موخالیف بۆ خەڵکێ (مَرْمُوق)
(مَقْلُوب)یش کەوا هاتووە ناوی        واتە: گۆڕینی ڕاوی بە ڕاوی
یاخود بێ ڕشتەی حەدیسێ بێنێ        بە حەدیسێکی تری بلکێنێ
هەر حەدیسێکیش کە تەنها کەسێ        متمانەدار بێ، یاخود هەر کەسێ
یان خەڵکی شارێ بێن وبیهێنن        زانایان بە (فَرْد) ناوی دەهێنن
ئەگەر نەخۆش بوو، بەڵام شاراوە        بڵێ: (مُعَلَّلْ)، وەکو زاراوە
جیاوازی لە دەق یان لە زنجیرە        دەڵێن (مُضْطَرِب)، چوون ناجێگیرە
(مُدْرَج) گەر وتەی ڕاوی بهێنرێ        لەگەڵ حەدیسێك تێهەڵکێش بکرێ
ڕیوایەی حەدیس لە نێوان دوو کەس        کەوا هاوڕێ بن، (مُدَبَّج)ە، وبەس
لە ڕاوی تەنیا گەر وەرنەگیرا        بڵێ (مُنْكَر)ەو بابێ لە بیرا
حەدیسی (مَتْرُوك) بڵێ بە ئاسان        ناسراوە لەلای فەرموودەناسان
هێنراوە لە لای تەنها یەك ڕاوی        یەکدەنگن لەسەر (ضَعِيف)ی ناوی
درۆی هەڵبەستراو بەدەم پێغەمبەر        پێی دەڵێن (مَوْضُوع) با هەتبێ خەبەر
لە (٣٦) بەیتا تەواو بوو (دیاری        دەربەندیخانی) موحتاج بە باری

# چەند زاراوەیەکی فەرموودەناسی[1]

| | |
|---|---|
| الحديث | بریتیە لە وتە وکردار وتەقریر وسیفەتی حەزرەت یان هاوەڵان یان شوێنکەوتوان. |
| الخبر | هەندێك فەرموویانە بەمانای حەدیس دێت. هەندێکیش فەرموویانە: تەنها بۆ وتەو کردار وتەقریری هاوەڵان یان شوێنکەوتوان بەکار دێت، هەندێکیش فەرموویانە هەموو حەدیسێك خەبەرە، نەك بە پێچەوانەوە. |
| الأثر | واتە حەدیسی حەزرەت یان یەکێك لە هاوەڵان، بەڵام شەرعزانانی خۆراسان پێیان وایە خەبەر بۆ حەدیسی حەزرەت بەکار دەهێنرێت، و(أثر)یش بۆ حەدیسی هاوەڵان. |
| علم الحديث رواية | واتە ئەو زانستەی کە باس لە گێڕانەوە وچۆنێتی خوێندنەوە ونووسینەوەی حەدیس دەکات. |
| علم الحديث دراية | واتە بوونی زانیاری بە کۆمەڵە ڕێسایەك کە بەهۆیانەوە ئەحواڵی دەقی حەدیس وڕشتەی گێڕانەوەکەی دەزانرێت. |
| المتن | واتە دەقی حەدیس، ئەو وشەو ڕستانەی کە حەدیسەکەیان لێ پێکهاتووە. |
| السند | واتە ڕشتەی ناوی ئەو کەسانەی کە لە گێڕانەوەی حەدیسدا بەشوێن یەکدا هاتوون. |
| إسناد | واتە دانەپاڵی حەدیس بۆلای خاوەنەکەی. |

(١) ئەم زانیاریانەم بە پوختی لەم سەرچاوانە وەرگرتووە: تدريب الراوي / ٩ – ٢١، وقواعد في علوم الحديث، ظفر أحمد العثماني التهانوي / ٢٤ – ٣٠، ومنهج النقد في علوم الحديث، لنور الدين عتر / ٢٦ – ٣٢، و٧٦ – ٧٧، ومنظومة مصباح الراوي في علم الحديث، للشيخ عبد الله بن فودي، دراسة وتحقيق وشرح: محمد المنصور إبراهيم / ٢٥ - ٢٦.

| | |
|---|---|
| أحوال السند | واتە ئەو سیفەتانەی کە ڕوو لە ڕشتەی گێرانەوەی حەدیسێك دەکەن، وەکو ئەوەی کە ئایا پچڕانی تێدا نیە، یان تێیدایە، یان تەدلیسی تێدا کراوە، یان هەندێك لە کەسەکانی فاسقن یان تۆمەتبارن بە درۆکردن، یان شتیان زۆر لەبیر دەچێت....هتد. |
| أحوال المتن | واتە ئەو سیفەتانەی کە ڕوو لە دەقی حەدیسەکە دەکەن، وەکو ئەوەی کە ئایا (مرفوع)ە یان (موقوف)ە یان (مقطوع)ە، یان صەحیحە یان شاذە.... هتد. |
| المسنِد | واتە ئەو کەسەی کە حەدیسێك بە ڕشتەوە دەگێڕێتەوە، ئیتر ئایا شارەزایی هەبێت لەبارەیەوە یان هەر تەنها بیگێڕێتەوە وبەس. |
| المحدث | واتە ئەو کەسەی کە حەدیس بە ڕشتەوە دەگێڕێتەوە، وشارەزاییشی لەبارەی دەقی زۆرینەی حەدیسەکان وعەدالەت وناعەدالەتی کەسەکانی سەردەمی خۆی هەیە. |
| الحافظ | واتە ئەو کەسەی کە لە هەر چینێك، ئەوەی کەدەیزانێت زیاترە لەوەی کە نایزانێت، وخەریکی زانستی فەرموودەناسیە. |
| الحجة | واتە کەسی (حافظ)، بەلاَم لەڕووی بیرتیژی ووریاییەوە لە جیاکردنەوەی دەق وڕشتەی حەدیسەکاندا زۆر بەهێزە. |
| الحاکم | واتە ئەو کەسەی کە ئاگای لە هەموو حەدیسەکان هەیە، بەجۆرێکی وەها کە لەوانەیە تەنها کەمێکی لەدەست دەربچێت. |
| أمیر المؤمنین في الحدیث | بالاَترین وەسفە بۆ ئەو کەسانەی کە بە حەدیسەوە خەریکن، بەجۆرێك کە ئەوەندە بیرتیژە وقووڵ بووەتەوە لە فەرموودەناسیدا، کە بووە بە جێگەی پرس وبۆلاگەڕانەوەی زانایانی فەرموودەناس. |

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

أَبْدَأُ بِالْحَمْدِ مُصَلِّيًا عَلَى		مُحَمَّدٍ خَيْرِ نَبِيٍّ أُرْسِلاَ

# دەستپێکی ڕوونکردنەوە

به ناوی خودای بەخشندەی میهرەبان

واته: به سوپاس وستایشەوه دەست پێدەکەم له دانان وهۆندنەوەی ئەم هۆنراوەیە، وه درووود وسەلامی خودا داوا دەکەم بۆ سەر پێغەمبەر (محمد) که باشترینی پێغەمبەر ونێردراوەکانی خودایه.

مامۆستای دانەر سەرەتای ئەم هۆنراوەیەی به ناوی خودا وسوپاس وستایشی ئەو دەستپێکردووه، له لایەك وەك شوێنکەوتنێکی قورئانی پیرۆز، که ئەویش به (بسم الله الرحمن الرحيم) و (الحمد لله) دەستی پێکردووه، لەلایەکی تریشەوه، له چەند گێڕانەوەیەکدا هاتووه له حەزرەتی پێغەمبەردوه (دروودی خودای لەسەر بێت) که فەرموویەتی: هەر کارێك که جێگەی بایەخ وگرنگی پێدان بێت، و به ناوی خوداوه، یان به سوپاس وستایشی خوداوه دەستی پێ نەکرێت، ئەو کاره بێ خێر وبەرەکەت بڕاو دەبێت.(١)

هەروەها حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت) له تەواوی نامەکانیدا که ناردوونی، به (بسم الله) دەستی پێکردوون، وه له تەواوی وتارەکانیدا که داونی له بۆنه تایبەتی وگشتیەکاندا به سوپاس وستایشی خودای پەروەردگار دەستی پێ کردوون.

پاشان داوای ڕەحمەت وسۆزی خودای پەروەردگاری کردووه بۆ سەر ڕۆحی پیرۆزی حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خودای لەسەر بێت)، که لێرەشدا گوێڕایەڵی ئەو ئایەته پیرۆزەی قورئانی کردووه، که خودای گەوره پاش ئەوەی که باس له صەڵەواتدانی خۆی وفریشتەکانی

---

(١) "كُلُّ أَمْرٍ ذِي بَالٍ لَا يُبْدَأُ فِيهِ بِبِسْمِ اللَّهِ فَهُوَ أَبْتَرُ" وفي لفظ فهو أَجْذَمُ وفي لفظ فهو أقطع. و "كُلُّ أَمْرٍ ذِي بَالٍ لَا يُبْدَأُ فِيهِ بِحَمْدِ اللَّهِ فَهُوَ أَقطع" بڕوانه: كشف الخفاء ومزيل الالباس عما اشتهر من الاحاديث على ألسنة الناس، العجلوني / ٢ / ١٠٩ / حەدیسی ژماره ١٩٦٢، له پاش هەموو ئەم ڕیوایەتانه دەفەرموێت: والحديث حسن.

ده‌کات له‌سه‌ر حه‌زره‌ت (دروودی خودای له‌سه‌ر بێت)، ئه‌وجا ڕوو ده‌کاته ئیمانداران وپێیان ده‌فه‌رموێت: ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾.[ الأحزاب/ ٥٦ ].

وه له فه‌رمووده‌ی (صحيح)ی حه‌زره‌ت خۆیدا هاتووه (دروودی خودای له‌سه‌ر بێت)، که هه‌ر که‌سێك صه‌له‌واتێك بدات له‌سه‌ری، خوای گه‌وره ده صه‌له‌وات ده‌دات له‌سه‌ر ئه‌و که‌سه، وده خراپه وتاوانیشی له‌سه‌ر لاده‌بات، وده پله‌ش پله‌ی به‌رز ده‌کاته‌وه.[١]

وه له شێوه‌ی صه‌له‌واتدانه‌که‌یدا، مامۆستای دانه‌ر به‌و شێوه‌یه وه‌سفی حه‌زره‌تی کردووه (دروودی خودای له‌سه‌ر بێت)، که فه‌رموویه‌تی: چاکترینی پێغه‌مبه‌ران وره‌وانه‌کراوانی خودایه.

ئه‌م جۆره وه‌سفه‌ش هه‌م له قورئانی پیرۆز، وهه‌م له فه‌رمووده‌کانی حه‌زره‌ت خۆشیدا هاتووه (دروودی خودای له‌سه‌ر بێت)، که هه‌ندێك له پێغه‌مبه‌ران فه‌زڵ وپله‌وپایه‌یان له هه‌ندێکی تریان زیاتره، وه‌ك خودای گه‌وره ده‌فه‌رموێت: ﴿ تِلْكَ الرُّسُلُ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَى بَعْضٍ مِنْهُمْ مَنْ كَلَّمَ اللَّهُ وَرَفَعَ بَعْضَهُمْ دَرَجَاتٍ ﴾ [البقرة / ٢٥٣] ﴿ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ ﴾ [ الإسراء / ٥٥ ].

وه حه‌زره‌تیش (دروودی خودای له‌سه‌ر بێت) فه‌رموویه‌تی: من گه‌وره وسه‌رداری نه‌وه‌کانی ئاده‌مم، له ڕۆژی قیامه‌تدا، به‌بێ شانازی.[٢]

به‌ڵام نابێت باسی ئه‌وه بکرێت که کامیان له کامیان باشتره، به جۆرێك که ناویان ببرێت، وه‌ك ئه‌وه‌ی که بوترێت: حه‌زره‌تی پێغه‌مبه‌رمان له حه‌زره‌تی موسا یان یونس یان.... باشتره (دروودی خودایان له‌سه‌ر بێت). چونکه حه‌زره‌ت (دروودی خودای له‌سه‌ر بێت) به فه‌رمووده‌ی خۆی

---

(١) « مَنْ صَلَّى عَلَيَّ صَلاَةً وَاحِدَةً صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ عَشْرَ صَلَوَاتٍ وَحُطَّتْ عَنْهُ عَشْرُ خَطِيئَاتٍ وَرُفِعَتْ لَهُ عَشْرُ دَرَجَاتٍ ». رواه أحمد والبخاري وأبو داود والترمذي والنسائي عن أنس. بڕوانه: كشف الخفاء / ٢ / ٢٥٧ / حه‌دیسی ژماره ٢٥١٧.

(٢) " أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ" رواه مسلم وأبو داود عن أبي هريرة من حديث وهو عند أحمد والترمذي وابن ماجه عن أبي سعيد في حديث بزيادة (ولا فَخْرَ). بڕوانه: كشف الخفاء / ١ / ١٨٤ / حه‌دیسی ژماره ٦١٦.

نەهی لێ کردووین کە ئەو جۆرە قسانە بکەین، وبەو جۆرە فەزڵی بدەین بەسەر پێغەمبەرانی تردا، وەك هاتووە کە فەرموویەتی: فەزڵی من مەدەن بەسەر موسادا. وە هیچ کەسێك لە ئێوە مافی ئەوەی نیە کە بڵێت: من لە یونسی کوڕی مەتا باشترم.(١)

هەروەها مامۆستای دانەر وەسفی حەزرەتی کردووە بە هەردوو سیفەتی (النبوة والرسالة) کە خوای گەورە خۆی لە قورئانی پیرۆزدا بەم دوو وەسفە وەسفی پێغەمبەری کردوە (درودی خودای لەسەر بێت)، وەك لە چەندین جێگەدا بانگی دەکات ودەفەرموێت: يَاأَيُّهَا النَّبِيُّ، يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ، یان دەفەرموێت: مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ، یان کە بانگی خێزان وهاوسەرەکانی دەکات پێیان دەفەرموێت: يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ.

ئەوجا لە بوونی جیاوازی لە نێوان ئەم دوو وەسفەدا زانایان ڕای جیاوازیان هەیە:

هەندێکیان دەفەرموون: هەردووکیان بە یەك مانا هاتوون، وهیچ جیاوازیان نیە. واتە: هەموو نەبییەك ڕەسوولە، وە هەموو ڕەسوولێکیش نەبییە.

هەندێکی تریان فەرموویانە: جیاوازیان هەیە، ونەبیی گشتگیر ترە. واتە: هەموو ڕەسوولێك نەبییە، بەڵام هەموو نەبییەك ڕەسوول نیە. چونکە بەلای ئەم بۆچوونەیانەوە، نەبیی بە کەسێك دەوترێت کە شەریعەتێکی نوێی بە وەحی لەلایەن خودای پەروەردگارەوە بۆ هاتبێت، ئەگەرچی فەرمانی پێ نەکرابێت کە بە خەڵکی ڕابگەیەنێت، خۆ ئەگەر فەرمانی پێ کرابوو، ئەوا پێشی دەوترێت ڕەسوول، هەروەکو چۆن پێی دەوترێت نەبیی.(٢)

---

(١) "لاَ تُخَيِّرُونِي عَلَى مُوسَى " صحيح البخاري / كتاب الأنبياء / باب وفاة موسى / حەدیسی ژمارە ٣٢٢٧، وصحيح مسلم / كتاب الفضائل / باب من فضائل موسى / حەدیسی ژمارە ٢٣٧٣."لا يَنْبَغِي لِعَبْدٍ أَنْ يَقُولَ أَنَا خَيْرٌ مِنْ يُونُسَ بْنِ مَتَّى" صحيح البخاري / كتاب الأنبياء / باب قول الله تعالى { وَإِنَّ يُونُسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ } / حەدیسی ژمارە ٣٢٣٤، وصحيح مسلم / كتاب الفضائل / باب في ذكر يونس عليه السلام وقول النبي (صلى الله عليه و سلم) لا ينبغي لعبد أن يقول أنا خير من يونس بن متى / حەدیسی ژمارە ٢٣٧٦.

(٢) بڕوانە: تدريب الراوي / ١ / ٥٩، وفتح المغيث شرح ألفية الحديث، السخاوي / ١ / ٩.

وَذِي مِنَ اقْسَامِ الْحَدِيْثِ عِدَّهْ  وَكُــلُّ وَاحِـدٍ أَتَى وَحَـــدَّهْ

# جۆرەكانی حەدیس

واتە: ئەوەی كە لە مێشك وبیری خۆمدا ئامادەم كردووە، یان ئەم هۆنراوەیەی كە دامناوە، چەند جۆرێك لە جۆرەكانی حەدیسی لەخۆ گرتووە، كە هەریەكەیان لەگەڵ پێناسەكەیدا هاتوون.

مامۆستای دانەر هەوڵی داوە لەم چەند هۆنراوەیەدا تەنها ناوی سی ودوو (٣٢) جۆر لە جۆرەكانی حەدیس بهێنێت، وباسی (٣٢) زاراوەی فەرموودەناسی بكات، ولەگەڵ ناوهێنانی هەر جۆرێكیشدا بە شێوەیەك لە شێوەكان پێناسەی بۆ ئەو جۆرە كردووە.

ئەمەش وا دەگەیەنێت كە جۆرەكانی حەدیس تەنها ئەوەندە نین كە مامۆستا هێناونی، بەڵكو وەكو لە زۆرێك لە كتێبەكانی تایبەت بەم زانستە پیرۆزەدا هاتووە، زانایان زیاد لە شەست جۆر حەدیسیان باس كردووە،[1] بەڵام بەو پێیەی كە ئەم هاتووە هۆنراوەیەكی كورتی لەم زانستەدا داناوە، وتەنها سی وچوار بەیتە، بۆیە هەر توانیویەتی ئەوەندەیان باس بكات، ئەگینا جۆرەكان ژمارەیان دوو بەرامبەری ئەوەیە كە ئەو هێناونی.

(١) بڕوانە: الباعث الحثيث، لابن كثير / ١٧ - ١٨، وتوضيح الأفكار لمعاني تنقيح الأنظار، للصنعاني / ١ / ١٤.

أَوَّلُهَا الصَّحِيحُ وَهْوَ مَا اتَّصَلْ    إِسْنَادُهُ وَلَمْ يَشُذَّ أَوْ يُعَلْ
يَرْوِيهِ عَدْلٌ ضَابِطٌ عَنْ مِثْلِهِ    مُعْتَمَدٌ فِي ضَبْطِهِ وَ نَقْلِهِ

# جۆری یەكەم

# حەدیسی ( الصَحِیْح )

واتە یەكەم جۆری ئەو حەدیسانە حەدیسی (صحیح)ە، كە بریتیە لەو حەدیسەی كە ڕشتەی گێڕانەوەكەی بەیەكەوە بەستراوە وبچڕانی تێدا نیە، و (شاذ و معلّل)یش نیە، وە كەسانی ناو ڕشتەكە یەك لەدوای یەك كەسی (عادل وضابط)بن، وەمتمانەدار بن لە لەبەركردن وزەبت كردن وهێنان وگواستنەوەی حەدیسدا.

سەرەتا دەڵێین: زانایان چەند جۆرە دابەشكردنێكیان كردووە بۆ حەدیس، هەر دابەشكردنێك بە ئیعتیبارێك، لەوانە:

- بەپێی قبوولْ كردن ورەد كردنەوە، دابەشیان كردووە بۆ: صحیح و حسن وضعیف.
- بەپێی ڕێگەی گێڕانەوە، دابەشیان كردووە بۆ: آحاد ومتواتر.
- بەپێی ئەو كەسەی كە دەدرێتە پاڵی، دابەشیان كردووە بۆ: مرفوع وموقوف ومقطوع.

زانایان حەدیس وا دابەش ئەكـەن    (صحیح وضعیف)، نێوانیان (حسن)
هەم دابەشیان كـرد لە لایەكی تـر    لـــــە بـــۆ (آحاد) وبۆ (متواتر)
بەپێی دانەپاڵ فەرموویان: (مرفوع)    ئـەگەرنا (موقوف) یاوەكو (مقطوع)

مامۆستای دانەر بەر لە هەموو جۆرەكان سەرەتا بە حەدیسی (صحیح) دەستی پێ كرد، چونكە بەهێزترین جۆرەكانی حەدیسە لەڕووی قبوولْ كردن وكارپێكردنەوە، وە پێناسەی كردووە بەوەی كە: ئەو حەدیسەیە كە ڕشتەی گێڕانەوەكەی هەر لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێت) تاوەكو گەیشتوەتە دوایین ڕاوی هیچ بچڕانی تێدا نیە، بەڵكو هەمووی پێكەوە بەسراوە، هەروەها (شاذّ) نیە، و(معلّل) نیە، وئەو كەسانەی كە ڕیوایەتی دەكەن، یەك لەدوای یەك (عادل وضابط)ن، وجێگەی متمانەن لە گێڕانەوەی حەدیسدا.

لەم پێناسەیەوە دەردەكەوێت بۆ ئەوەی كە حەدیسێك بە (صحیح) دابنرێت، پێویستە پێنج مەرجی تێدا بێتەجێ، كە بریتین لە:

١) ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەكە بچڕانی تێدا نەبێت.
٢) حەدیسەكە سەلامەت بێت لە (شذوذ).
٣) حەدیسەكە سەلامەت بێت لە (علّة).
٤) گشت ڕاویەكانی (عادل) بن.

٥) گشت ڕاویەکانی (ضابط) بن.

ئەوجا بۆ زیاتر تێگەیشتن لەم مەرجانە، هەندێك بە کورتی باسی هەریەکەیان دەکەین:

## ١) ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکە بچڕانی تێدا نەبێت

ئەمیش بەوە دەبێت کە هەر یەکێك لەو کەسانەی کە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا ناویان هاتووە، دەبێت بە یەکێك لەو ڕێگانەی وەرگرتنی حەدیس، لەوەی پێش خۆیی وەرگرتبێت.[1] ئیتر لە ڕێگەی بیستنەوە بێت، وەك ئەوەی کە بڵێت: گوێم لە فلان بوو کە

---

(١) زانایان فەرموویانە: لە چەند ڕێگایەکەوە کەسێك دەتوانێت حەدیسێك لە کەسێکی تر وەربگرێت، کە ئەوانیش:

- السماع من لفظ الشيخ: ئەوەیە کە مامۆستاکە حەدیسەکە دەخوێنێتەوە وقوتابیەکەش گوێی لێ دەگرێت، ئیتر بینوسێتەوە یان تەنها گوێ بگرێت.
- القراءة على الشيخ (أو العرض): ئەوەیە کە قوتابیەکە ئەو حەدیسانەی کە مامۆستاکەی ڕیوایەتی کردوون، بیانخوێنێتەوە، ومامۆستاکەش گوێی بۆ بگرێت ولێی ببیسێت.
- الإجازة: ئەوەیە کە مامۆستاکە مۆڵەتی گێڕانەوەی حەدیسێك یان چەند حەدیسێك یان کتێبێکی حەدیس بدات بە قوتابیەك، ئیتر ئەو مۆڵەت پێدانە بە زاردکی بێت یان بە نووسین.
- المناولة: ئەمیش دوو جۆری هەیە، یەکەم ئەوەیە مۆڵەتیشی لەگەڵدایە، وەك ئەوەی کە مامۆستاکە کتێبێکی خۆی بدات بە قوتابیەکە وپێشی بڵێت: ئەمە ڕیوایەتی منە لە فلانە مامۆستاوە، تۆش لە منی ڕیوایەت بکە، ئەوجا کتێبەکەی بداتێ بۆ خۆی، یان بیداتێ کە وێنەیەکی لێ بگرێتەوە. دووەم ئەوەیە کە مۆڵەتی لەگەڵدا نیە، وەك ئەوەی کە مامۆستاکە کتێبێکی خۆی بدات بە قوتابیەکە وپێی بڵێت: من ئەم کتێبەم لە مامۆستایەکی خۆم بیستووە.
- المكاتبة: ئەمیش دووبارە دەکرێت کە مۆڵەتی لەگەڵدا بێت، یان لەگەڵیدا نەبێت، وەکو ئەوەی کە مامۆستاکە ئەوەی کە بیستوویەتی لە مامۆستایەکی خۆی، بینووسێتەوە بۆ یەکێك لە قوتابیەکانی.
- إعلام الراوي لطالب: وەکو ئەوەی کە مامۆستایەك بە قوتابیەکی خۆی ڕابگەیەنێت کە فلانە حەدیس یان فلانە کتێبی لە مامۆستاکەی خۆیەوە بیستووە.
- الوصية بالكتب: وەکو ئەوەی کە مامۆستایەك لە کاتی سەرەمەرگیدا یان لەکاتی گەشت وسەفەرێکیدا وەسێت بکات بۆ کەسێك کە یەکێك لەو کتێبانەی بدرێتی کە ئەو ڕیوایەتی کردووە.
- الوجادة: وەکو ئەوەی کە کەسێك حەدیسێك یان چەند حەدیسێك یان کتێبێك بدۆزێتەوە کە بە دەستخەتی مامۆستایەکی ناسراو نوسرابێتەوە وڕیوایەتیشی کردبێت، کەچی ئەو کەسە نە بیستوویەتی لەو مامۆستا ونە مۆڵەتی گێڕانەوەشی لێ وەرگرتووە. بۆ زانیاری زیاتر لەبارەی هەر یەکە لەم ڕێگایانە وچۆنێتی پێ وەرگرتنیان بڕوانە هەریەکە لە: مقدمة ابن الصلاح / ٧٥ – ١٠٢، والباعث الحثيث / ٩٠ – ١١٨، والمقنع في علوم الحديث / ٢٩٢ – ٣٣٦، وتدريب الراوي / ٣٠٨ – ٣٥٥، والمنهل الروي في مختصر علوم الحديث النبوي / ٨٠ – ٩٢، ورسوم التحديث في علوم الحديث / ١٠٤ – ١١٦.

وتی....، یان خۆم ئەم حەدیسەم لە خزمەت فلانە مامۆستامدا خوێندوەتەوە، یان فلان بۆی گێڕامەوە. ئیتر هەر بەم شێوەیە تاوەکو دەگاتە سەرچاوە ئەصڵیەکە کە حەزرەتی پێغەمبەرە (دروودی خودای لەسەر بێت).

کەواتە ئەگەر ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێك بچڕانی تێدا بوو، بچڕانێکی ئاشکرا یان شاراوە، ئەوا ئەو حەدیسە بە (صحیح) دانانرێت، وەك لە باسی حەدیسی (منقطع)دا زیاتر بە نموونەوە ڕوونی دەکەینەوە.

## ٢) حەدیسەکە سەلامەت بێت لە (شذوذ)

(شذوذ) واتە: ڕیوایەتی ئەو کەسەی کە حەدیسەکەی گێڕاوەتەوە پێچەوانەبێت بۆ ڕیوایەتی کەسێك یان چەند کەسێکی تر کە لەو لەپێشتر وڕاجیح تر ومتمانەدارتر بن. یان ئەو حەدیسە تەنها یەك کەس ڕیوایەتی کردووە، وەك هەندێك لە زانایان وایان پێناسە کردووە.

## ٣) حەدیسەکە سەلامەت بێت لە (علّة)

(علّة) بەو هۆیە دەوترێت کە دەبێتە هۆی لەکەدار کردنی حەدیسێك کە بە ڕواڵەت لە (صحیح) دەچێت، وئەصڵ وەهایە کە ئەو هۆیەی تێدا نەبێت، کە پێزانینی ئەم جۆرە هۆیەش تەنها بۆ ئەو کەسە پسپۆڕانە ئاسانە کە زۆر شارەزا وزانابن لە بواری فەرموودەناسیدا.

## ٤) گشت ڕاویەکانی (عادل) بن

ڕاوی عادیل بەو کەسە موسوڵمانە عاقڵە باڵغە دەوترێت کە زۆر بەپارێز ولەخوداترسە، بەجۆرێك کە فەرمانەکانی شەرع جێبەجێ دەکات، وخۆی لە تاوانی گەورە وبەردەوامبوون لەسەر تاوانی بچووك بەدوور دەگرێت، و وخۆشی لە هەموو ئەو کردار وگوفتارانە دوور دەخاتەوە کە بە گوێرەی عادەت کاریگەری خراپیان دەبێت لەسەر مەردایەتی وکەسایەتی وحورمەتی مرۆڤ لەناو خەڵکیدا.

## ٥) گشت ڕاویەکانی (ضابط) بن

بەو ڕاویە دەوترێت کە ئەوەی گە وەری دەگرێت ودەیگێڕێتەوە بەچاکی وبە تەواوی لەبەری بێت ولە بیری نەکات.

واتە لەو کاتەی کە لە خزمەت مامۆستاکەیدا دانیشتووە وگوێی لێ دەگرێت وحەدیسەکەی لێ وەردەگرێت، دەبێت زۆر بە ئاگا وهۆشیار بێت، بە جۆرێك کە هەر وشەیەك کە لە دەمی مامۆستاکەیەوە بێتە دەر، ئەم بە چاکی لەبەری بکات وزەبتی بکات، یان بینووسێتەوە وبیپارێزێت. ئەم حاڵەتە پێی دەوترێت: ضبط التحمل صدراً أوكتابةً.

هەروەها دەبێت ئەوەی کە لەبەری کردووە، مەگەر زۆر بە کەمی، ئەگینا لەبیری نەچێتەوە، وهەرکەی بیەوێت بتوانێت وەکو چۆن بیستوویەتی لە مامۆستاکەی، هەر بەو شێوەیەش بیگەیەنێت بە کەسانی تر. ئەم حاڵەتەش پێی دەوترێت: ضبط الأداء.

لە کۆتاییدا دەڵێین: هەر حەدیسێکی حەزرەتی پێغەمبەر (درودی خودای لەسەر بێت) تەواوی ئەم پێنج مەرجەی بەیەکەوە تێدا هاتەجێ، ئەوە بە (صحیح) دادەنرێت، ئەگینا ئەگەر تەنها یەك مەرجیشیان نەهاتبێتەجێ ئەوا لە ڕیزی حەدیسی (صحیح) دەچێتە دەرەوە.

بۆ نموونە: ئەگەر حەدیسێك هەبێت، وچوار مەرجەکەی یەکەمی تێدا هاتبێتەجێ، واتە: ڕشتەی گێڕانەوەکەی بچڕانی تێدا نەبوو، وە شاذ ومعلّل نەبوو، وە ڕاویەکانیش لە هەموو ڕشتەکەدا عادل وضابط بن، تەنها یەکێکیان نەبێت کە شتی لەبیر دەچوەوە، یان تەنها یەکێکیان خۆی لە گوناه نەدەپاراست، ئەوا ئەو حەدیسە بە (صحیح) دانانرێت.

# جۆرەکانی حەدیسی (صحیح)

زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە حەدیسی (صحیح) دوو جۆری هەیە[1]:

١) صحیح لذاته: ئەو حەدیسە (صحیح)ەیە کە لەسەرەتای ئەم باسەدا پێناسەمان کرد.

ئەم جۆرە حەدیسە نموونەی زۆرن، لەوانە هەموو ئەو حەدیسانەی کە هەردوو ئیمامی بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە، واتە: (متفق علیه)ەکان. وەکو حەدیسی: « الْحَرْبُ خَدْعَةٌ »[2] کە سوفیانی کوڕی عویەینە لە عەمرەوە، ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە، ئەویش لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێت) گێڕاویەتیەوە.

بۆیە بەم ناوەوە ناو نراوە، چونکە خۆی لەو ڕێگەیەوە کە لێیەوە ڕیوایەت کراوە، (صحیح)ە وپێویست بەوە ناکات بگەڕێین بە شوێن ڕێگەی تردا تاوەکو پێی بەهێز بکەین، بەڵکو هەر خۆی بەهێزە.

---

(١) نزهة النظر في توضيح نخبة الفكر في مصطلح أهل الأثر، ابن حجر العسقلاني / ٦٧ – ٦٨، وفتح المغيث / ١ / ٨٧، واليواقيت والدرر في شرح نخبة ابن حجر، عبد الرؤوف المناوي / ١ / ٣٣٥ – ٣٣٦، وتوجيه النظر إلى أصول الأثر، طاهر الجزائري الدمشقي / ١ / ٣٦٣، وشرح شرح نخبة الفكر، ملا علي القاري / ٢٤٥، ومنحة المغيث / ١٨٤.

(٢) صحيح البخاري / كتاب الجهاد والسير / باب الحرب خدعة / بە ژمارەی ٢٨٦٦، وە صحيح مسلم / الجهاد والسير / باب جواز الخداع في الحرب / بە ژمارەی ٤٦٣٧. وشەی (خدعة) بە چەند شێوەیەك دەخوێنرێتەوە: (خَدْعَة، خُدْعَة، خِدْعَة، خُدَعَة)، بەڵام زانایانی زمانناس فەرموویانە (خَدْعَة) هەم زمانی حەزرەتە وهەم لە هەموو شێوەکانی تریش فەصیح ترە. بڕوانە: (لسان العرب)ی (ابن منظور)، و(تاج العروس)ی (مرتضى الزبيدي)، و(القاموس المحيط)ی (فيروزآبادي). جا بۆ نموونەی زیاتر لەسەر حەدیسی (متفق علیه) دەکرێت بگەڕێیتەوە سەر هەریەکە لە کتێبی الجمع بين الصحيحين البخاري ومسلم، دانراوی (محمد بن فتوح الحميدي)، وە بلوغ المرام، کە دانراوی شێخی عەسقەلانیە، وە رياض الصالحين کە دانراوی ئیمامی نەواوییە.

٢) صحیح لغیره: ئەم حەدیسە خۆی لە ئەصڵدا حەدیسی (حسن)ە (کە لە جێگەی خۆیدا باسی لێوە دەکەین)، بەڵام لە چەند ڕێگەیەکەوە ڕیوایەت کراوە، ئیتر ڕێگەکان هەموویان وەکو یەکن، یاخود هەندێکیان لە هەندێکیان بەهێز ترن.

ئەم جۆرە حەدیسە بۆیە بەم ناوەوە ناو نراوە، چونکە ئەگەر تەماشای بکەین، لە هیچکام لەو ڕێگایانەی کە لێیەوە ڕیوایەت کراوە، نەگەیشتۆتە پلەی (صحیح)، بەڵام بە هەموو ڕێگاکانەوە بەهێز بووە، تاوەکو گەیشتوەتە ئەو پلەیە، کەواتە بەهۆی ڕێگەکانی ترەوە بە (صحیح) دادەنرێت، ئەگینا خۆی (صحیح) نیە.

زانایان نموونەیان بۆ ئەم جۆرە حەدیسە بەو حەدیسە هێناوەتەوە کە لە ڕێگەی موحەممەدی کوڕی عەمری کوڕی عەلقەمەوە، ئەویش لە ئەبو سەلەمەوە، ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە، کە حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی: « لَوْلاَ أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي لأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ عِنْدَ كُلِّ صَلاَةٍ ». شێخی شارەزووری فەرموویەتی: ئەو موحەممەدە بەڕاستگۆیی وخۆپارێزی بەناوبانگە، بەڵام لەڕووی لەبەرکردن وزەبت کردنەوە لاواز بووە، بۆیە هەندێك لە زانایان بە لاوازیان داناوە، بەڵام هەندێکی تر بە متمانەداریان داناوە چونکە ڕاستگۆ بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەم حەدیسە لە ڕێگەیەکی ترەوە ڕیوایەت کراوە، ئیتر ئێمە ئەو ترسەمان نەماوە لە لاوازی ئەو موحەممەدە لە ڕووی لەبیر نەچوونەوە وزەبت کردنەوە، بەمەش ئەو کەمە نوقسانیەی کە تێیدا بووە، جێگەکەی پڕ کراوەتەوە، بۆیە ئەم حەدیسە ئێستا بە حەدیسی (صحیح) دادەنرێت.[1]

---

(١) بڕوانە: سنن الترمذي / أبواب الطهارة / السواك / حەدیسی ژمارە ٢٢، ومقدمة ابن الصلاح / ٢٠، واليواقيت والدرر / ١ / ٣٩٤ – ٣٩٥، وتدريب الراوي / ١٢٩، وفتح المغيث / ١ / ٨٧ – ٨٨، وتوجيه النظر / ١ / ٤٩٦.

ئەوجا پاش شی کردنەوە وڕوونکردنەوەی پێناسەی حەدیسی (صحیح) بە هەردوو جۆرەکەیەوە، چەند باسێکی تریش لێرەدا پێویستن، لەوانە:

١) ئایا حوکمی حەدیسی (صحیح) چیە لەڕووی بەبەڵگە بوون، وکارپێکردنەوە؟

٢) ئایا حەدیسە (صحیح)ەکان لە نێوان خۆیاندا لە پلەی (صحیح)یدا لە یەکتر جیاوازن؟

٣) ئایا دەکرێت بە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێك بوترێت: ئەم ڕشتەیە لە هەموو ڕشتەکانی تر (صحیح) ترە؟

٤) ئایا ئەگەر ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێك (صحیح) بوو، دەکرێت بوترێت: ئەو حەدیسە (صحیح)ە؟

٥) ئایا چۆن بزانین کە حەدیسێك (صحیح)ە؟

# حوکمی حەدیسی ( صحیح )

تەواوی فەرموودەناسان وشەرعزانان وئوصولیەکانیش یەکدەنگن لەوەدا کە حەدیسی (صحیح) یەکێکە لە بەڵگە شەرعییەکان، وهیچ کەسێك ناتوانێت کاری پێ نەکات، هەر بۆیە لە زمانی زۆرێك لە موجتەهیدەکانەوە هاتووە، کە ئەگەر حەدیسی (صحیح) بینرا، ئەوا دەبێت واز لە بۆچوون وڕاکەی مەزهەبی ئەو بهێنرێت، وکار بە حەدیسە (صحیح)ەکە بکرێت.[1]

---

(١) إذا صحّ الحديث فهو مذهبي. ئەم فەرموودەیەش نابێت بە ڕەهایی وەربگیرێت، وهەر کەسێك حەدیسێکی بینی کە (صحیح) بوو، وە بینی کە بۆچوونی یەکێك لە چوار مەزهەبەکە بە ڕواڵەت پێچەوانەی ئەو حەدیسەیە، ڕاستەوخۆ بێت و ئەو بۆچوونە بەلاوە بنێت، وبڵێت: من تاوەکو حەدیسی (صحیح) وەستابێت، کار بە مەزاهیبی فیقهی ناکەم !!! جا بۆ تێگەیشتن لە مانای ئەو فەرموودەیە پێویستە بگەڕێینەوە لای زانایانی شارەزا وپسپۆڕ، ئەگینا تووشی هەڵە ولەڕێگەلادان دەبین، خودا بمانپارێزێت. بڕوانە لێکدانەوەی ئیمامی نەواوی لە: كتاب المجموع شرح المهذب / ١ / ١٠٤ - ١٠٦.

# جیاوازی پلەی دەقی حەدیسە ( صحیح )ەكان

بە شێوەیەكی گشتی زانایان حەدیسی (صحیح)یان كردوە بە حەوت پلەوە لەڕووی هێزی بەبەڵگەبوون وكارپێكردنەوە، بەم ڕیزبەندییەی خوارەوە، لە بەهێزترینیانەوە، وبەرەو خوارتر[1]:

١) ئەو حەدیسە (صحیح)ەی كە هەردوو ئیمامی بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان كردووە. كە لە زاراوەی ئەم زانستی فەرموودەناسییەدا پێی دەوترێت: (متفق علیه). [2]

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٨، والمقنع في علوم الحديث / ٧٥ – ٧٦، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ٨٤، وە شرح شرح نخبة الفكر / ٢٨٨، وتوجيه النظر / ١ / ٢٨٨ – ٢٩٠. نا لێرەدا زانای پایەبەرز (عبد الفتاح أبو غدة) تەحقیقێكی كەم وێنەی كردووە لەسەر كتێبی (توجيه النظر)ی (طاهر الجزائري)، كە تێیدا بە وردی تاوتوێی ئەم مەسەلەیە دەكات، وردخنە وبەرپەرچی هەندێك لە زانایان دەهێنێت لەسەر ڕیزبەندی ئەم جۆرە دابەشكردنە، لەوانە (الكمال ابن الهمام الحنفي) خاوەنی كتێبی (فتح القدير للعاجز الفقير) كە شەرحی كتێبی (الهداية)ی (برهان الدين الميرغناني)یە لە فیقهی مەزهەبی حەنەفیدا، و(زين الدين قاسم بن قطلوبغا) خاوەنی حاشیەی (القول المبتكر على شرح نخبة الفكر)، و(ابن الحنبلي) خاوەنی كتێبی (قفو الأثر)، وئیمامی صەنعانی خاوەنی كتێبی (توضيح الأفكار)، وە زانای پایەبەرز (محمد زاهد الكوثري)، وە زانای گەورە (أحمد شاكر). پوختەی باسەكەی ئەوەیە كە مەرج نیە هەرچی حەدیسێك كە ئیمامی بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان كردبێت، ئیتر لە هەموو حەدیسێكی تر صەحیح تر بێت. یان مەرج نیە هەر حەدیسێك كە تەنها ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی كردبێت، ئیتر ئەو حەدیسە لەو حەدیسە صەحیح تر بێت كە تەنها ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی كردووە، چونكە مەسەلەی بەراوردی نێوان حەدیسەكان لەڕووی صەحیحیەوە بەندە بە بەهێزی صیفاتی ڕاویەكانی حەدیسەكانەوە، كە دەگونجێت ڕاویەكانی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێكی صەحیحی بوخاری لەڕووی صیفەتی عەدالەتەوە كزتر ولەدواترین لە ڕاویەكانی حەدیسێكی صەحیح كە لە صەحیحی موسلیمدا یان لە هەركام لە كتێبەكانی تردا هاتبێت. بۆیە من پێم وایە تەماشا كردن وئاگالێبوونی ئەو تەحقیقە كارێكی زۆر پێویستە، وەرزۆقی زانست دۆست سوودی زۆری لێ دەبینێت.

(٢) زانایان لە لێكدانەوەی ئەم زاراوەیەدا ڕای جیاوازیان هەیە:

- هەندێكیان پێیان وایە: حەدیس بە (متفق علیه) دادەنرێت، ئەگەرچی دوایین كەسی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەكە لە هەردوو صەحیحی بوخاری وموسلیمدا جیاوازبن، گرنگ ئەوەیە كە دەقی حەدیسەكە یەك بێت، یان ئەگەر جیاوازیش لە دەقەكەدا هەبوو، جیاوازیەكی كەم بێت.
- زۆرینەی زانایان پێیان وایە: كاتێك بە حەدیسێك دەوترێت (متفق علیه)، كە دوایین كەسی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەكە لە هەردوو صەحیحی بوخاری وموسلیمدا یەك كەس بێت. سەرەڕای ئەوەی كە دەقی حەدیسەكەش دەبێت هەمان دەق بێت، یان ئەگەر جیاوازیشیان هەبێت، جیاوازیەكی كەم بێت. بڕوانە: النكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ٢٩٨.

٢) ئەوەی کە تەنها ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە (واتە لە صەحیحەکەیدا).

٣) ئەوەی کە تەنها ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە.[1]

٤) ئەوەی کە لەسەر مەرجی هەردووکیانە، بەڵام هیچکامیان ڕیوایەتیان نەکردووە.

٥) ئەوەی کە تەنها لەسەر مەرجی ئیمامی بوخارییە، بەڵام ڕیوایەتی نەکردووە.

٦) ئەوەی کە تەنها لەسەر مەرجی ئیمامی موسلیمە، بەڵام ڕیوایەتی نەکردووە.

٧) ئەوەی کە بەلای زانایانی ترەوە بە (صحیح) دانراوە، بەڵام لەسەر مەرجی ئیمامی بوخاری وموسلیم نیە، وەکو ئەو حەدیسانەی کە (صحیح)ن بەلای: (ابن خزیمة وابن حبان والحاکم و......)ەوە.

## مەرجی بوخاری وموسلیم چیە؟

هیچکام لە ئیمامی بوخاری وموسلیم نەهاتوون مەرجێك دابنێن بۆ حەدیسی (صحیح)، زیاد لەو پێنج مەرجەی کە لە پێشەوە باسمان کردن، کە جێگەی یەکدەنگی زانایانن، بەڵام زانایان کە گەڕاون وشوێنەوزیان کردووە بە شێوازی هەریەکە لەو دوو ئیمامە پایەبەرزەدا، بۆیان دەرکەوتووە کە هەر یەکە لەو دوو ئیمامە مەرجی تایبەتی خۆی هەیە بۆ (صحیح)ی حەدیس، بۆیە فەرموویانە: مەرجی (صحیح)ی حەدیس بەلای ئیمامی بوخارییەوە ئەوەیە کە ڕاویەکە گەیشتبێت بە مامۆستاکەی و حەدیسەکەی لە دەمی بیستبێت.

بەڵام بەلای ئیمامی موسلیمەوە تەنها ئەوە بەمەرج گیراوە کە هاوچەرخ وهاوزەمان بن، ئیتر مەرج نیە کە بەیەك گەیشتنیان چەسپابێت، بۆیە ئەگەر ڕاویەکە دەرنەکەوت کە خۆی لە

[1] لە سەرچاوە عەرەبییەکاندا فەرموویانە: (ما انفرد به البخاري، وما انفرد به مسلم). جا هەرکاتێك ئەم جۆرە دەستەواژەیە بەکار هێنرا، ئەوە لە بەرامبەر دەستەواژەی (اتفق علیه الشیخان)، یان (متفق علیه) بەکار دەهێنرێت، ئەگینا دەگونجێت بێجگە لەوان، چەندین ئیمامی تر ئەو حەدیسەیان ڕیوایەت کردبێت.

دەمی مامۆستاكەی بیستووە، ئەوا ئەو حەدیسە بەلای ئیمامی بوخاریەوە بە (صحیح) دانانرێت، بەلاّم بەلای ئیمامی موسلیمەوە هەر بە (صحیح) دادەنرێت، چونكە وترا ئەو دوو كەسە لە یەك ماوە وسەردەمی دیاریكراودا ژیاون، ئەوە ئەصلّ وەهایە كە چاویان بەیەكتر كەوتبێت، ومامۆستاكە حەدیسەكەی بە قوتابیەكە گەیاندبێت.(١)

هەر بۆیە زانایان فەرموویانە: فەرموودەكەی ئیمامی بوخاری دروست ترە، كە پێویستە ڕاویەكە خۆی لە دەمی مامۆستاكەی بیستبێت. لەمەشەوە فەرموویانە: كتێبی صەحیحی بوخاری لە كتێبی صەحیحی موسلیم (صحیح) ترە، چونكە ئەو بەمەرجی گرتووە بۆ (صحیح)ی حەدیس، كە دەبێت ڕاوی ومامۆستاكەی بەیەك گەیشتبن، بەلاّم ئەم بەمەرجی نەگرتووە.

## جیاوازی پلەی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسی ( صحیح )

(ئایا هیچكام لە ڕشتەكان لەوانی تریان (صحیح) ترن؟)

بەپێی ئەو مەرجانەی كە دانراون بۆ ئەوەی كە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسی پێغەمبەر (صحیح) بێت، هەندێك لە زانایان فەرموویانە: باشتر وایە كە بڕیار نەدرێت بەسەر هیچكام لە ڕشتەكان، كە گوایە ئەم ڕشتەیە لە باقی ڕشتەكانی تر (صحیح) ترە، چونكە ئەگەر مەرجەكان هەموویان هاتبنەجێ ئەوا ڕشتەكە (صحیح)ە، ئەگەرنا (صحیح) نیە، ئیتر ڕشتەیەك نیە كە پێی بوترێت: ئەمە لەوانی تر (صحیح) ترە.

---

(١) بڕوانە: شرح شرح نخبة الفكر / ٢٤٧، وأصول الحديث علومه ومصطلحه / ٣٢٨ – ٣٢٩ و ٣٣١ – ٣٣٢.

لەگەڵ ئەوەشدا هەندێك لە پێشەوایانی فەرموودەناس[1] پێیان وایە کە جیاوازی وتەفاوتێك هەیە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسی پێغەمبەردا، کە هەندێکیان لە هەندێکی تریان (صحیح) ترن، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە کام ئیمام بەلای خۆیەوە کام ڕشتە لە هەموو ڕشتەکانی تر بەهێز ترە، ئەگینا هیچ ڕشتەیەکیان جێگەی یەکدەنگی زانایان نین.

- دەگێڕنەوە لە ئیسحاقی کوڕی ڕاهەوەیهی وئیمامی ئەحمەدەوە کە فەرموویانە: (صحیح) ترین ڕشتە بریتیە لە ڕشتەی (زوهری لە سالمی کوڕی عەبدولاّ لە عەبدولاّی باوکیەوە کە کوڕی ئیمامی عومەرە).
- دەگێڕنەوە لە ئیبنو موعینەوە کە فەرموویەتی: (صحیح) ترین ڕشتە بریتیە لە ڕشتەی (ئەعمەش لە ئیبراهیمەوە لە عەلقەمەوە لە عەبدولاّی کوڕی مەسعودەوە).
- دەگێڕنەوە لە ئیبنو ئەبی شەیبەوە کە فەرموویەتی: (صحیح) ترین ڕشتە بریتیە لە ڕشتەی (زوهری لە عەلی کوڕی حوسەینەوە لە حوسەینەوە لە ئیمامی عەلییەوە).
- دەگێڕنەوە لە ئیمامی بوخاریەوە کە فەرموویەتی: (صحیح) ترین ڕشتە بریتیە لە ڕشتەی (ئیمامی مالیك لە نافیع لە ئیبنو عومەرەوە).

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٠، وتدريب الراوي / ٤٤ - ٥٣، والنكت على كتاب ابن الصلاح، ابن حجر العسقلاني / ١ / ٢٦٥، وتوجيه النظر / ١ / ٤٢٠ -٤٢٢، وشرح الزرقاني على البيقوني مع حاشية الأجهوري / ٩٢، والباعث الحثيث / ٢٠. جا زانایان لەم جێگەیەدا تەحقیقیان کردووە وفەرموویانە: بڕیاری لەم شێوە هەروا ڕەها نیە، کە هیچ جۆرە مەرج وکۆتێکی پێوە نەبێت، بەڵکو هەر ڕشتەیەك کە لە ئەوانی تر (صحیح) تر بێت، ئەوە مەرجدار وکۆتدارە بەوەی کە بە فلاّنە هاوەڵی حەزرەت، یان بە خەڵکی فلاّنە ولاّت وناوچە کۆتایی هاتبێت. واتە: لەناو تەواوی ئەو زنجیرانەی کە لە فلاّنە هاوەڵەوە یان لە خەڵکی فلاّنە ولاّتەوە حەدیسیان ڕیوایەت کردووە، ئەو ڕشتەیان لە هەموویان صەحیح ترە. بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: شرح شرح نخبة الفكر / ٢٦٥، وتحقيق أحمد شاكر على اختصار علوم الحديث المسمى بـ(الباعث الحثيث) / ٢٠ — ٢١، وعلوم الحديث في ضوء تطبيقات المحدثين النقاد، الدكتور حمزة المليباري / ١٠٨ — ١٠٩، ومنهج النقد في علوم الحديث، نور الدين عتر / ٢٤٩.

- ده‌گێڕنه‌وه له ئیمام ئه‌بو مه‌نصوری ته‌میمییه‌وه که فه‌رموویه‌تی: (صحیح) ترین ڕشته بریتیه له ڕشته‌ی (ئیمامی شافیعی له ئیمامی مالیك له نافع له ئیبنو عومه‌ره‌وه).
- زانای پایه‌دار صه‌لاحه‌ددینی عه‌لائی وغه‌یری ئه‌ویش فه‌رموویانه: (صحیح) ترین ڕشته بریتیه له ڕشته‌ی (ئیمامی ئه‌حمه‌د له ئیمامی شافیعی له ئیمامی مالیك له نافیع له ئیبنو عومه‌ردوه).

## ئایا ئه‌گه‌ر ڕشته‌ی گێڕاوه‌نه‌وه‌ی حه‌دیسێك (صحیح) بوو، ئه‌وه وا ده‌گه‌یه‌نێت که ده‌قی ئه‌و حه‌دیسه (صحیح)ه؟

زانایان یه‌کده‌نگن له‌وه‌دا که یه‌کێك له مه‌رجه‌کانی حه‌دیسی (صحیح) ئه‌وه‌یه که ڕشته‌ی گێڕانه‌وه‌ی ئه‌و حه‌دیسه (صحیح) بێت، هه‌روه‌ها یه‌کده‌نگیشن له‌وه‌دا که مه‌رج نیه ئه‌گه‌ر ڕشته‌ی گێڕانه‌وه‌ی حه‌دیسێك (صحیح) بوو، ئیتر ده‌قی ئه‌و حه‌دیسه (صحیح) بێت، چونکه له‌لایه‌ك هیچ لازم نیه ئه‌گه‌ر مه‌رج هاته‌جێ، ئیتر مه‌رجبۆگیراویش بێته‌جێ، له‌لایه‌کی تریشه‌وه (صحیح)ی ڕشته‌ی گێڕانه‌وه تاکه مه‌رج نیه بۆ ئه‌وه‌ی که حه‌دیسێك (صحیح) بێت، به‌ڵکو وه‌کو له مه‌رجه‌کاندا باسمان کرد: نابێت ئه‌و حه‌دیسه (شاذّ) یان (معلّل) بێت.(١)

به‌ڵام له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌شدا زانایان فه‌رموویانه: ئه‌گه‌ر هاتوو یه‌کێك له‌و زانا ناوداره متمانه‌داره فه‌رمووده‌ناسانه‌ی که کتێبیان له‌م بواره‌دا داناوه، فه‌رموویان: ڕشته‌ی گێڕانه‌وه‌ی ئه‌و حه‌دیسه (صحیح)ه، وئیتر هیچ ڕه‌خنه‌یه‌کیان لێی نه‌بوو، ئه‌وه وه‌ها ده‌گه‌یه‌نێت که ئه‌و حه‌دیسه (صحیح)ه، چونکه ئه‌صڵ وایه که حه‌دیس هیچ عیلله‌ت و ڕه‌خنه‌یه‌کی له‌سه‌ر نه‌بێت.(٢)

---

(١) بڕوانه: مقدمة ابن الصلاح / ٢٠، والباعث الحثيث / ٣٦، والمقنع في علوم الحديث، ابن الملقن / ٨٩، وتدريب الراوي / ٣٦، وتوضيح الأفكار / ١ / ١٧٧، واليواقيت والدرر / ١ / ٣٤٢، والفروسية، ابن قيم الجوزية / ٢٤٥ – ٢٤٦، وشرح الزرقاني على البيقوني / ٧٢ - ٧٣.

(٢) هه‌مان سه‌رچاوه‌کانی پێشوو.

# ناسینی حەدیسی ( صحیح )

بەڵێ ئێمە لە باسی مەرجەکانی حەدیسی (صحیح)دا، ڕوونمان کردەوە کە حەدیسی (صحیح) پێنج مەرجی سەرەکی هەیە، بەڵام ئەمە وا دەگەیەنێت کە حوکمدان بەسەر حەدیسێکدا کە (صحیح)ە یان نا، بڕیارێکی ئاسان بێت؟ وە ئایا چۆن بزانرێت کە ئەو مەرجانە هەموویان هاتوونەتەجێ یان نا؟

بۆیە زانایانی فەرموودەناس فەرموویانە: لە سێ ڕێگەوە کەسێك دەتوانێت بگاتە ئەوەی کە فلانە حەدیس (صحیح)ە یان (صحیح) نیە، ئەوانیش:

١) ئەگەر ئەو کەسە خۆی لە پلەی زانستیدا گەیشتبێتە ڕادەیەك کە لە توانایدا هەبێت بزانێت حاڵی ڕاوییەکان چۆنە، وچۆن ئەو حەدیسەیان ڕیوایەت کردووە وهێناویانە. جا ئەگەر بینی کە ئەو حەدیسە هەر پێنج مەرجەکەی تێدا هاتبوەجێ، ئەوا خۆی دەتوانێت بڕیار بدات کە ئەو حەدیسە (صحیح)ە. ئەم ڕێگەیە لە سەردەمانی ئێستادا کەم بەرکار دێت.

٢) ئەگەر حەدیسەکە لە یەکێك لەو کتێبانەی حەدیسدا بوو، کە بێجگە لە حەدیسی (صحیح) هیچ حەدیسێکی تریان تێدا کۆ نەکراوەتەوە، وەکو صەحیحی هەردوو پێشەوا بوخاری وموسلیم.

٣) ئەگەر یەکێك لە ئیمامانی فەرموودەناس، کە لە بڕیاردان بەسەر حەدیسدا کەمتەرخەم وناسانکار نەبێت، فەرموویێتی: ئەو حەدیسە (صحیح)ە. کە لێرەدا چەندین کتێبی موعتەبەر وگرنگ لەم بوارەدا دانراون، ولە دنیای ئیسلامیشدا چاپ کراون وبلاو کراونەتەوە، وهیچ بواریش نەماوە بۆ ئەوەی کە بوترێت گۆڕانکاریان تێدا کراوە یان دەکرێت !

وَالحَسَنُ المعْرُوفُ طُرْقًا وَغَدَتْ        رِجَالُهُ لاَ كَالصَّحيحِ اشْتَهَرَتْ

# جۆری دووەم

# حەدیسی (الحَسَن)

واتە: حەدیسی (حسن) بەو حەدیسە دەوترێت کە ڕشتەی گێڕانەوەکەی زانراو وناسراوە، لە سەرەتاکەیەوە تاودکو کۆتاییەکەی، وە هەموو کەسەکانی ئەو ڕشتەیەش هەر وەکو کەسەکانی ڕشتەی حەدیسی (صحیح) وەهان، بەڵام وەکو ئەوان بە بیرتیژی وزەبتکردن بەناوبانگ نین.

ئەوەی کە لەم دێڕە هۆنراوەیەدا هاتووە سەبارەت بە پێناسە کردنی حەدیسی (حسن)، تەنها سێ مەرج لە مەرجەکانی حەدیسی (حسن)ی لەخۆ گرتووە، کە ئەوانیش:

١) ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکە زانراو بێت، وهیچ بچڕانی تێدا نەبێت.

٢) ئەو کەسانەی کە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەدا هاتوون، دەبێت عادل بن.

٣) ئەو کەسانەی کە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەدا هاتوون دەبێت لەبەرکردنیان بەهێز بێت، زەبتکردنیان تەواو بێت.

لەمەوە دەردەکەوێت کە حەدیسی (حسن) لەگەڵ حەدیسی (صحیح)دا لەم سێ مەرجەدا هاوبەشن.

بەڵام وەکو جیاوازی زانایان فەرموویانە لە مەرجی سێیەمدا حەدیسی (حسن) لەگەڵ حەدیسی (صحیح) جۆرە جیاوازیەکیان هەیە، ئەویش ئەوەیە کە کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسی (حسن) وەکو کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسی (صحیح) بەناوبانگ نین لە باش لەبەرکردن وبیرتیژی ولەبیر نەچوونەوە، هەر ئەمەش مەبەستی مامۆستای دانەرە کە فەرموویەتی: کەسەکانی ڕشتەی حەدیسی (حسن) وەکو کەسەکانی ڕشتەی حەدیسی (صحیح) بەناوبانگ نین، واتە لە زەبت کردندا، ئەگینا لە ڕووی عەدالەتەوە هەر وەکو یەك وەهان.

ئەوەی کە ماوە بوترێت لە مەرجەکان، ئەوەیە کە ئەو حەدیسە نابێت (شاذ) یان (معلّل) بێت.

کەواتە دەکرێت کە بڵێین: تەنها خاڵی جیاوازی نێوان حەدیسی (حسن) وحەدیسی (صحیح) ئەوەیە کە: ڕشتەی کەسەکانی گێڕانەوەی حەدیسی (حسن) وەکو ڕشتەی کەسەکانی گێڕانەوەی حەدیسی (صحیح) بیرتیژ ووریا نین لە لەبەرکردن ولەبیر نەچوونەوەدا، ئەگینا لە هەموو مەرجەکانی تردا وەکو یەك وەهان وهیچ جیاوازیان نیە.

کەواتە ئێستا ئەگەر جارێکی تر بگەڕێینەوە بۆ پێناسە کردنەوەی حەدیسی (حسن)، دەکرێت بڵێین: ئەو حەدیسەیە کە کەسانێکی عادلی بیر لاواز وکەم توانا لە لەبەرکردندا، لە ڕشتەیەکی نەبچڕاودا ڕیوایەتیان کردووە وهێناویانە، ونە (شاذ)ە ونە (معلّل)یشە.

## جۆرەکانی حەدیسی ( حسن )

حەدیسی (حسن)یش هەر وەکو حەدیسی (صحیح) زانایان کردوویانە بە دوو جۆرەوە:

١) حسن لذاته: ئەو پێناسەیەی کە پێشتر کردمان بۆ حەدیسی (حسن)، پێناسەی ئەم جۆرە حەدیسەیە.

نموونەی ئەم جۆرە حەدیسە لە سەرچاوەکانی حەدیسی حەزرەتدا زۆرن (دروودی خودای لەسەر بێت)، یەکێك لەوانە ئەو حەدیسەیە کە ئیمامی ئەحمەد وکەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە لە بەحیای کوڕی سەعیدەوە، ئەویش لە بەهزی کوڕی حەکیمەوە، کە باوکی لە باپیرەیەوە گێڕاویەتیەوە کە وتوویەتی بە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت): يَا رَسُولَ اللَّهِ مَنْ أَبَرُّ؟ قَالَ « أُمَّكَ ». قَالَ قُلْتُ ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ « أُمَّكَ ». قَالَ قُلْتُ ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ « أُمَّكَ ». قَالَ قُلْتُ ثُمَّ مَنْ؟ قَالَ « ثُمَّ أَبَاكَ ثُمَّ الأَقْرَبَ فَالأَقْرَبَ ».[1]

---

(١) مسند الإمام أحمد / مسند الكوفيين / حديث بهز بن حكيم عن أبيه عن جده / به ژمارەی ٢٠٠٤٠، وسنن الترمذي / البر والصلة / بر الوالدين / به ژمارەی ١٨٩٧.

ئەم حەدیسە ڕشتەی گێڕانەوەکەی هیچ بچڕانێکی تێدا نیە، هەروەها نە (شاذ)ە ونە (معلّل)یشە، وزانایانیش نە لە دەقەکەیدا ونە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەشیدا هیچ ناکۆکیەکیان نیە. بەڵام بەهزی کوڕی حەکیم لەگەڵ ئەوەش کە کەسێکی ئەوەندە ڕاستگۆ وخۆپارێزە، زۆرێك لە زانایان بە متمانەداریان داناوە، وگەلێك لە ئیمامەکانیش حەدیسیان لێوە ڕیوایەت کردووە، کەچی هەندێك لە زانایان، وەکو شوعبەی کوڕی حەججاج قسەیان لەسەری هەبووە، وهەندێك لە ڕیوایەتەکانیان پێ باش نەبووە، وپێیان وەرنەگرتووە، کە ئەمەش وا ناگەیەنێت کە کەسێکی زیرەك وبیرتیژ ومەزبووت نەبووە، بەڵام وا دەگەیەنێت کە زۆر لە لەبەرکردن وزەبت کردنی حەدیسدا بەهێز وبەتوانا نەبووە وەکو ئەو کەسانەی کە لە ڕشتەی حەدیسە (صحیح)ەکاندا هەن.

بەم پێیە، ئەم حەدیسە بە حەدیسێکی (حسن) دادەنرێت، وەکو زۆرێك لە زانایان بڕیاریان بەسەردا داوە، بەڵکو لە بەرزترین وبالاترین جۆری حەدیسی (حسن)ە، هەرچەندە هەندێکیشیان بە حەدیسی (صحیح لغیره)یان داناوە، چونکە لە چەند ڕێگەی تریشەوە ڕیوایەت کراوە، کە پشتگیری ئەم ڕیوایەتە دەکەن.

لێرەوە دەردەکەوێت کە لێك چوونێکی زۆر هەیە لە نێوان حەدیسی (صحیح) وئەم جۆرە حەدیسەدا، بە جۆرێك کە هەندێك لە زانایان وایان حسێب کردووە کە جۆرێکە لە جۆرەکانی حەدیسی (صحیح)، [1] بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زانایانی فەرموودەناس حەدیسی (حسن) بە سەربەخۆ دادەنێن، وخۆی جۆرێکی سەربەخۆیە، وناچێتە ژێر حەدیسی (صحیح)ەوە.

٢) حسن لغیره: حەدیسێکی لاوازە، بەڵام لە چەند ڕێگەیەکی هاوێنەی خۆیەوە یان باشترەوە ڕیوایەت کراوە، بە مەرجێك کە هۆی لاوازیەکەی بریتی نەبێت لە فاسقی یان درۆزنی ئەو کەسەی کە ڕیوایەتی کردووە.

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٤، ومنهج النقد في علوم الحديث، نور الدين عتر / ٢٦٥ - ٢٦٦.

نموونەی ئەم جۆرە حەدیسە زۆرن لە سەرچاوەکانی حەدیسی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێت)، یەکێك لەوانە ئەو حەدیسەیە کە ئیمامی (ترمذي) ڕیوایەتی کردووە لە هوشەیمی کوڕی بەشیرەوە، ئەویش لە یەزیدی کوڕی ئەبو زیادەوە، ئەویش لە عەبدول ڕەحمانی ئیبنو ئەبی دونیاوە، ئەویش لە بەرائی کوڕی عازیبەوە، بە مەرفوعی لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێت)، کە فەرموویەتی: « حَقٌّ عَلَى الْمُسْلِمِينَ أَنْ يَغْتَسِلُوا يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَلْيَمَسَّ أَحَدُهُمْ مِنْ طِيبِ أَهْلِهِ فَإِنْ لَمْ يَجِدْ فَالْمَاءُ لَهُ طِيبٌ »[(١)]. پاشان فەرموویەتی: ئەم حەدیسە حەدیسێکی (حسن)ە. زانایان فەرموویانە: هوشەیم وەسف کراوە بە (تدلیس)، بەڵام هەمان حەدیس لە ڕێگەی ئەبو یەحیای تەمیمیەوە ڕیوایەت کراوە، وە بەڵگەی تریش هەیە کە پشتگیری بکات، کە ئەبو سەعیدی خیدری وغەیری ئەو ڕیوایەتیان کردووە.[(٢)]

لێرەدا ئەوەی کە پێویست بێت بوترێت ئەوەیە کە: مەرج نیە هەموو حەدیسێکی (ضعیف) بەهۆی زۆری ڕێگا وڕشتەی گێڕانەوەکانیەوە ببێت بە حەدیسێکی (حسن)، بەڵکو کاتێك وا دەبێت کە هۆی لاوازی حەدیسەکە - بۆ نموونە - بگەڕێتەوە بۆ کەم هێزی وکەم توانایی یەکێك لە ڕاویەکان لەڕووی بیرتیژی ولەبەرکردنەوە، ئەگینا لە ڕووی ڕاستگۆیی ومتمانەداریەوە نابێت هیچ قسەیەکی لەسەر بێت، بۆیە زانایان فەرموویانە: ئەگەر لاوازی حەدیس بەهۆی فاسقی یان درۆزنی کەسی ڕاویەوە بوو، ئەوا باوەکو لە چەندین ڕێگەی تریشەوە ڕیوایەت کرابێت، ئەو حەدیسە هەر بە لاواز دادەنرێت، وناخرێتە ڕیزی حەدیسی (حسن)ەوە.[(٣)]

---

(١) سنن الترمذي / أبواب الجمعة / السواك والطيب يوم الجمعة / بە ژمارەی ٥٢٨.

(٢) بڕوانە: النكت على كتاب ابن الصلاح، العسقلاني / ١ / ٣٩٥، واليواقيت والدرر / ٢ / ١٧١ – ١٧٢، وتدريب الراوي / ١٣٠.

(٣) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٠، وفتح المغيث / ١ / ٨٧، والمختصر في علوم الحديث، الشريف الجرجاني / ٢، ومحاضرات في علوم الحديث، د. ماهر ياسين الفحل / ١٣.

# حوکمی حەدیسی ( حسن )

زۆرینە یان تێکڕای زانایان لەسەر ئەوەن کە حەدیسی (حسن)، ئەگەر (لذاته) بوو، ئەوا دەکرێت ئەویش وەکو حەدیسی (صحیح) بکرێت بە بەڵگە، وکاری پێ بکرێت، ئەگەرچی لە پلەشدا لە خوارەوەی حەدیسی (صحیح)ەوەیە.[1]

بەڵام سەبارەت بە بوونی حەدیسی (حسن لغيره) بە بەڵگە وپێوەرگرتن وکارپێکردنی، لەبەر ئەوەی کە خۆی لەخۆیدا حەدیسێکی لاواز بووە، بۆیە زانایان لەم مەسەلەیەدا بوون بە دوو کۆمەڵەوە:

١) زۆرێك لە زانایان فەرموویانە دەبێت جیاوازی بکرێت لە نێوان جۆری حەدیسەکاندا، بە جۆرێك کە: ئەگەر ئەو حەدیسە لە زۆرێك ڕێگاوە ڕیوایەت کرابێت، ئەوا پێی وەردەگیرێت، ئەگینا ئەگەر تەنها لە دوو ڕێگاوە ڕیوایەت کرابوو، ئەوا پێی وەرناگیرێت، وە کاری پێ ناکرێت.

٢) هەندێك فەرموویانە: کە ئێمە بڕیارمان دا ئەو حەدیسە (ضعيف)ە بووە بە حەدیسێکی (حسن)، ئیتر پێویست ناکات جیاوازی بکەین لەوەدا کە ئایا لە دوو ڕێگەوە ڕیوایەت کراوە، یان زیاتر.[2]

---

(١) بڕوانە: الباعث الحثيث / ٣٢، والمنهل الروي، ابن جماعة / ٣٦. زانای پایەبەرز (الحافظ العراقي) لە ئەلفیەکەیدا فەرموویەتی:

٥٦. وَالفُقَهَــاءُ كُلُّهُمْ يَستَعمِلُهْ — وَالعُلَمَــاءُ الجُلُّ مِنهُـمْ يَقْبَــلُهْ

٥٧. وَهُوَ بأقْسَامِ الصَّحِيْحِ مُلْحَقُ — حُجِّيَّــةً وإنْ يَكُـنْ لا يَلْحَــق

(٢) بڕوانە: فتح المغيث / ١ / ٨٦، وتدريب الراوي / ١١٧، وتوضيح الأفكار / ١ / ١١١، واليواقيت والدرر / ١ / ٣٩١ – ٣٩٢، وتوجيه النظر / ١ / ٣٦١، هەروەها بڕوانە خاتیمەی کتێبی: آراء المحدثين في الحديث الحسن لذاته والحسن لغيره، کە دانراوی دکتۆر (خالد الدريس)ە.

# ئەگەر وترا بە حەدیسێك: حسن صحیح. مانای چیە؟

زۆر جار لە هەندێك لە سەرچاوەکانی حەدیسی پێغەمبەردا، ئەم دەستەواژەیە دەبینرێت، بە تایبەتی لە (سنن الترمذي)دا، کە زیاد لە (١٥٠٠) جار بەکار هێنراوە. ئێمەش وەکو باسمان کرد، حەدیسی (صحیح) وحەدیسی (حسن) هەم وەکو پێناسە وهەم وەکو مەرجەکانیشیان، لەیەکتری جیاوازن، ئەگەرچی حەدیسی (صحیح لغیرە) لە ئەصڵدا حەدیسێکی (حسن) بووە، بەڵام ئەمە وا ناگەیەنێت کە درووستە هەردوو ناوەکەی بۆ بەکار بهێنرێت، بەڵکو ئێستا هەر پێی دەوترێت (صحیح)، بۆیە زانایان لە لێکدانەوەی ئەم دەستەواژەی (حسن صحیح)دا چەند بۆچوونێکیان هەیە، ئەگەرچی لە ڕەخنەش بەدوور نین[1]:

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٣، والباعث الحثيث / ٣٧، والنكت على كتاب ابن الصلاح، العسقلاني / ١ / ١٤٩، وتدريب الراوي / ١١٧ - ١٢٠، وشرح شرح نخبة الفكر / ٢٩٨ - ٣٠٤، وتوضيح الأفكار / ١ / ٢١٣، وشرح التبصرة والتذكرة، الحافظ العراقي / ١ / ١٧١ - ١٧٥، وتوجيه النظر / ١ / ٣٨٢ - ٣٩٠، والموقظة في علم مصطلح الحديث / ٢٩ - ٣٣، ومنحة المغيث / ١٩٨ - ٢٠٦، وشرح الزرقاني على البيقوني / ٧٦ - ٨٠، وعلوم الحديث في ضوء تطبيقات المحدثين النقاد، الدكتور حمزة المليباري / ٢٠٧ - ٢٠٨. زانای پایەدار (أحمد محمد شاكر) لە تەحقیقێکدا کە لەسەر ئەم بۆچوونانە کردوویەتی لەسەر کتێبی: اختصار علوم الحديث، فەرموویەتی: شێخ (محمد عبد الرزاق حمزة) فەرموویەتی: ئەوەی کە ئەو زانایانەی تووشی ئەو سەرگەردانیە کردووە، کە هەر یەکەیان وەڵامێکیان داوەتەوە، ئەوەیە کە ئەوانە حەدیسی (حسن)یان بە جۆرێك لە جۆرەکانی حەدیس داناوە وەکو حەدیسی (صحیح)، بۆیە ئەو فەرموودەیەی ئیمامی (ترمذي) هاتۆتە ڕێگەیان، ئیتر ئەوانیش بەو جۆرە وەڵامیان داوەتەوە، ولێکدانەوەیان بۆ کردووە. بەڵام وادەردەکەوێت کە حەدیسی (حسن) بەلای ئیمامی (ترمذي)یەوە کشتگیر ترە لە حەدیسی (صحیح)، بۆیە هەندێك حەدیسی (حسن) هەن، دەکرێت پێیان بوترێت (صحیح)، بەڵام هەندێکی تر هەن، ناکرێت پێیان بووترێت (صحیح)، چونکە بەلای ئەوەوە حەدیسی (حسن) بەمانای ئەو حەدیسە دێت کە کاری خەڵکی پێشینەی لەسەر بووە، لەوانەی کە ئیمامی مالیك لەبارەیانەوە فەرموویەتی: (وَعَلَيْهِ الْعَمَلُ بِبَلَدِنَا). بەڵام ئەو حەدیسەی کە (صحیح) بێت، وکاریشی پێ نەکرێت، ئیتر لەبەر هەر هۆیەك بێت، ئەوە ئیمامی (ترمذي) تەنها پێی دەفەرموێت: حەدیسی (صحیح)، ئەوەش وەکو ئەو حەدیسە وەهایە کە ئیمامی مالیك لە (موطأ)دا ڕیوایەتی کردووە، وپاشان فەرموویەتی: (وَلَيْسَ عَلَيْهِ الْعَمَلُ). بەمەش دەکرێت بڵێین: وەکو بڵێیت ئیمامی (ترمذي) ویستوویەتی لە کتێبەکەیدا هەم ئەو حەدیسانە بهێنێت کە کاری موسوڵمانانی پێشوویان لەسەر بووە، ئیتر (صحیح) بن یان نزمتر لە (صحیح)، وە هەم ئەو حەدیسانەش بهێنێت کە ئەگەرچی (صحیح)یش بن، بەڵام کاری موسوڵمانانی پێشینەیان لەسەر نەبووە.

١) هەندێك فەرموویانە: ئەگەر بە دوو ڕشتە ڕیوایەت کرابێت، ئەوا دەکرێت بە گوێرەی یەکێکیان (حسن) بێت، وبەگوێرەی ئەوی تریان (صحیح) بێت. وە ئەگەر بە یەك ڕشتە ڕیوایەت کرابێت، ئەوا دەکرێت حەدیسەکە بەلای هەندێك لە زانایانەوە (حسن) بێت، وبەلای هەندێکی تریانەوە (صحیح) بێت.

٢) هەندێك فەرموویانە: واتە (حسن)ە بەگوێرەی مەتنی حەدیسەکە، وە (صحیح)ە بەگوێرەی ڕشتەی گێڕانەوەکەی.

٣) هەندێك فەرموویانە: حەدیس لە ڕووی ڕیزبەندی پێوەرگرتن وبەبەڵگە دانان، ڕیزبەندیەکی تایبەتی هەیە، بۆیە ئەگەر وترا: حدیث صحیح، ئەوا پلەی لە پلەی ئەو حەدیسە بەرز ترە کە پێی دەڵێن: حدیث حسن صحیح، وە ئەمیش لەو حەدیسە پلەی بەرز ترە کە تەنها پێی دەوترێت: حدیث حسن.

٤) هەندێك فەرموویانە: مەبەست بە (حسن) مانای زمانەوانیە، واتە: حەدیسێکی جوان وباشە، نەك ئەو مانایەی کە ئێمە باسی دەکەین وزانایان مەبەستیانە.

٥) هەندێك فەرموویانە: دەکرێت ئەو حەدیسە دوو جار لە یەك کەسەوە ڕیوایەث کرابێت، لە جاری یەکەمدا کەسەکە بە کەسی ڕشتەی حەدیسی (صحیح) دانەدەنرا، بەڵام لە جاری دووەمدا بە کەسی ڕشتەی حەدیسی (صحیح) دادەنرا، بەهۆی ئەوەی کە سیفەتی عەدالەت وزەبتی تەواو بووبێت، بۆیە بەو دوو ئیعتیبارە دەکرێت پێی بوترێت: حسن صحیح.

٦) هەندێك فەرموویانە: دەکرێت حەدیسەکە بەلای ئیمامی (ترمذي)ەوە (حسن) بێت، وبەلای ئیمامێکی ترەوە (صحیح) بێت، یان بە پێچەوانەوە.

٧) هەندێك فەرموویانە: ئەو زانایانەی کە ئەم دەستەواژەیان بەکار هێناوە، جیاوازیان نەکردووە لە نێوان (حسن) و(صحیح)دا، وهەردووکیان هەر بە یەك مانا لێکداوەتەوە. کەواتە وەکو تەئکیدی لەفزی وەهایە لە زمانی عەرەبیدا.

وَكُلُّ مَا عَنْ رُتْبَةِ الحُسْنِ قَصُرْ　　فَهْوَ الضَّعِيفُ وَهْوَ أَقْسَامًا كَثُرْ

---

# جۆری سێیەم

# حەدیسی ( الضَعِیف ) وجۆرەکانی

واتە: هەموو ئەو حەدیسانەی کە ناگەنە پلەی حەدیسی (حسن)، پێیان دەوترێت: حەدیسی (ضعیف)، کە ئەویش زۆر جۆری هەیە.

پاش ئەوەی کە مامۆستای دانەر باسی هەریەکە لە حەدیسی (صحیح) و(حسن)ی کرد، ئەوجا هاتە سەر باسی حەدیسی (ضعیف).

نەهاتووە پێناسەی ئەم جۆرە حەدیسە بکات، بەڵکو بەو پێیەی کە هەمیشە ئەم جۆرە حەدیسە لە بەرامبەری هەردوو جۆرەکەی پێشوودا بەکار دەهێنرێت، بۆیە هەر بەوەندە بریەوە کە ئەم حەدیسە، بەو جۆرە حەدیسانە دەوترێت کە ناگەنە پلەی حەدیسی (حسن)، ونیتر باسی حەدیسی (صحیح)ی نەکردووە، چونکە پێویست ناکات، مەعلوم ئەگەر حەدیسێك نەگاتە پلەی حەدیسی (حسن)، ئەوە ناشگاتە پلەی حەدیسی (صحیح)، بۆیە پێویست بە باسکردنی ئەو ناکات.

کەواتە ئێستە ئێمە دەتوانین بڵێین: هەر حەدیسێك کە یەکێك یان هیچکام لە مەرجەکانی حەدیسی (حسن)ی تێدا نەبوو، ئەوە بە حەدیسی (ضعیف) دادەنرێت، ئەگەر پاڵپشت نەکرێت لە ڕێگەی ترەوە، تاوەکو بگاتە پلەی (حسن لغیره)، وەکو باسمان کرد.

کەوابوو دەکرێت ئەو حەدیسە (ضعیف)ە ڕشتەی گێڕانەوەکەی بچڕانی تێدا بێت، یان یەکێك لە کەسەکانی ئەو ڕشتەیە (عادل) نەبێت، یان (ضابط) نەبێت، یان حەدیسەکە (شاذ) یان (معلّل) بێت.

ئەوجا مامۆستا تەنها ئەوەندەی فەرمووە کە حەدیسی (ضعیف) زۆر جۆری هەیە، ئیتر نەیفەرمووە ژمارەیان چەندە ! ئەمەش خۆی بۆ خۆی بێ حیکمەت نیە، چونکە ئەوەی کە گرنگە بۆ حەدیس ئەوەیە کە بزانرێت ئایا ئەو حەدیسە لەڕووی پێ وەرگرتن وکارپێکردنەوە

چی جۆرێکە؟ کاری پێ دەکرێت یان نا؟ ئەویش بەوە دێتەجێ کە بزانرێت ئەو حەدیسە (صحیح)ە یان (حسن)ە یان (ضعیف)ە، ئیتر لەوە بەولاوە، زیادە زانیاریە، خۆ ئەگەر بشزانرێت، بێ گومان چاکترە، بەلاّم پێویست ناکات زۆر کاتی پێوە خەرج بکرێت، وخۆی پێوە خەریك بکرێت، لە کاتێکدا کە مەبەستە گرنگەکە هاتۆتە دی. هەر بۆیە ئیمامی (سیوطي) فەرموویەتی: من ویستم باسی جۆرەکانی حەدیسی (ضعیف) بکەم بە درێژی، پاشان بینیم کە (شیَخ الإسلام) فەرموویەتی: "إنّ ذلك تعب لیس وراءه إرب" واتە:(پێویست بەو ماندووبوونە ناکات) بۆیە وازم لە ڕەش کردنەوەی پەڕەکان هێنا بە باسی ئەو جۆرانە.[(١)]

## حوکمی گێڕانەوە وپشت بەستن بە حەدیسی ( ضعیف )

سەرەتا ئێمە کە باسی حەدیسی (ضعیف) دەکەین، نالّێین: بە دلّنیاییەوە ئەمە حەدیسی پێغەمبەر نیە (درودی خودای لەسەر بێت)! بەلّکو تەنها ئەوەندە هەیە کە ناتوانین بە دلّنیاییەوە بیدەینە پالّ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت)، وبلّێین: بەلّێ حەدیسی پێغەمبەرە (درودی خودای

---

(١) تدریب الراوي / ١٣٣، ئەو (شیخ الاسلام)ەی کە لە فەرمایشتەکەدا هاتووە بریتیە لە شێخی عەسقەلانی، وەك ئیمامی سەخاوی لە کتێبی: التوضیح الأبهر لتذكرة ابن الملقن في علم الأثر / لاپەڕە ٣٤ دا ناوی هێناوە. بەلاّم ئەمە واناگەیەنێت کە زانایانیش باسی جۆرەکانی حەدیسی (ضعیف)یان نەکردووە، بەلّکو هەندێکیان زۆر بە وردی باسی ئەوەی کردووە کە بەهۆی نەهاتنەجێی مەرجەکانی حەدیسی (حسن)، ئیتر دانە دانە، یاخود هەموویان، دەکرێت وەکو ئەگەری عەقلّی نزیکەی (١٢٩) جۆر حەدیسی لاواز درووست ببێت، بەلاّم ئەوەی کە دەگونجێت هەبێت نزیکەی (٨١) جۆرە. هەندێکی تر فەرموویانە: (٦٤) جۆرە. هەندێکی تریش فەرموویانە: (٦٣) جۆرە. هەندێکی تر فەرموویانە: (٥٠) جۆرە. هەندێکی تر فەرموویانە: (٤٢) جۆرە. هەندێکی تر فەرموویانە: (٤١) جۆرە. بڕوانە هەریەکە لەو دوو سەرچاوەی پێشوو، وە ئەم سەرچاوانەی تریش: (شرح التبصرة والتذكرة، وفتح المغیث، ومنحة المغیث) شەرحەکانی ئەلفیەی عێراقی، لە باسی حەدیسی (ضعیف)دا، لە شەرحی هەر پێنج دێڕە هۆنراوەی (٩٠ و٩١ و٩٢ و٩٣ و٩٤)دا، والیواقیت والدرر / ٢ / ١٧٣ – ١٧٤، وتوجیه النظر / ٢ / ٥٤٦ – ٥٤٧، وشرح الزرقاني علی البیقوني مع حاشیة الأجهوري / ٨١ - ٩٠.

لەسەر بێت). بۆیە زۆر پێویستە بە ئەدەب بین لە بەرامبەر باس كردنی ئەم جۆرە حەدیسەدا، ونەیەین یەكسەر هەر لەگەڵ وترا: (ضعیف)ە. ئیتر ئێمە هیچ حیسابێكی بۆ نەكەین، وەكو بڵێیت: ئەو حەدیسە هیچ پەیوەندیەكی بە حەزرەتەوە نیە (دروودی خودای لەسەر بێت) ! چونكە چەندین حەدیس هەن كە هەندێك لە زانایان بە (ضعیف)یان داناوە، كەچی هەندێكی تریان بە (حسن) یان بە (صحیح)یان زانیوە، بەڵكو زیاد لەوەش، هەندێك جار هەر هەمان زانایە بۆ حەدیسێك دەفەرموێت (ضعیف)ە، بەڵام ماوەیەك بەسەر چووە، ئەوجا بۆ هەمان حەدیس فەرموویەتی (حسن)ە یان (صحیح)ە. [1]

هەر لەبەر ئەمەیە كە زانایان زۆر بە ڕوونی وبە ڕاشكاوی باسیان لە حوكمی حەدیسی (ضعیف) كردووە، كە ئایا دەكرێت ڕیوایەت بكرێت، یان نا؟ وە لەم مەسەلەیەدا بوون بە سێ كۆمەڵەوە[2]:

١) هەندێكی كەم لە زانایان فەرموویانە: حەدیسی (ضعیف) بە هیچ جۆرێك نابێت بگێڕدرێتەوە وبكرێت بە بەڵگە وپشتی پێ ببەسترێت.

٢) زۆرینەی زانایان فەرموویانە: ئەو بۆچوونەی یەكەم بەو شێوە ڕەهاییە ڕاست نیە، بەڵكو دەبێت جیاوازی بكرێت لە نێوان ئەو بابەت وباسانەی كە حەدیسەكەیان لەسەر ڕیوایەت دەكرێت. بۆیە فەرموویانە: حەدیس بەو مەرجەی كە هەڵبەستراو (موضوع) نەبێت، دەكرێت چاوپۆشی وئاسانكاری لە گێڕانەوە وبە بەڵگە هێنانەوەی بكرێت، بە مەرجێك كە بابەتەكە باسی سیفەتەكانی خودای پەروەردگار نەبێت، وە

(١) بڕوانە: الموقظة في علم مصطلح الحديث / ٢٨ – ٢٩.

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٦٠، والمقنع في علوم الحديث، ابن الملقن / ١٠٤، والنكت على مقدمة ابن الصلاح، الزركشي / ٣ / ٨٧٣ - ٨٨٣، وتدريب الراوي / ٢٥٦، وتوجيه النظر / ٢ / ٦٥٣ – ٦٥٨، ومنحة المغيث / ٢١٣ – ٢١٧، وأصول الحديث علومه ومصطلحه / ٣٧٣ – ٣٧٤، ومحاضرات في علوم الحديث، د. ماهر ياسين الفحل / ١٣ – ١٤، ومنهج النقد في علوم الحديث، نور الدين عتر / ٢٩١ – ٢٩٤.

باسی حوکمە شەرعیەکان (حەلاڵ و حەرام) نەبێت. بۆیە درووستە ئەگەر ئامۆژگاری کردن بێت، یان چیرۆك گێڕانەوە، یان بۆ کردەوە باشەکان، یان بۆ هاندان لەسەر چاکەکاری، یان ترساندن لەسەر خراپەکاری، وهەر بابەتێکی تر بێجگە لەمانە بە مەرجێك کە لە دوو بابەتەکەی یەکەم نەبێت، لە هەموو ئەم باسانەدا دەکرێت حەدیسی (ضعیف) بگێڕدرێتەوە وپشتی پێ ببەسترێت، چونکە لەم بابەتانەدا لەوانەیە خەڵکی سوود لە گێڕانەوەی حەدیسی (ضعیف) ببینێت.

٣) ئیمامی ئەحمەد وئەبو داوودی سەجستانی فەرموویانە: لە بابەتی حەلاڵ وحەرامیشدا هەر بە حەدیسی (ضعیف) وەردەگیرێت، ئەگەر بێجگە لەو حەدیسە بەڵگەیەکی تر بەدەستەوە نەبوو بۆ ئەو مەسەلە.

بەلاّم زانایانی کۆمەڵەی دووەمیش هەروا بە ڕەهایی ئەو بڕیارەیان نەداوە، بەڵکو چەند مەرجێکیان بۆ ئەو قسەیە داناوە، کە بریتین لە:

- نابێت دەقی حەدیسەکە (منکر) بێت، یان زۆر (ضعیف) بێت، وەکو ئەوەی کە یەکێك لە راویەکان بە درۆزن بەناوبانگ بێت.
- دەبێت حەدیسەکە لە ژێر یەکێك لە ڕێسا گشتیەکانی شەریعەتی ئیسلامیدا جێگەی ببێتەوە، واتە نابێت پێچەوانەی هیچ ڕێسا وئەساسیاتێکی ئەم ئاینە پیرۆزە رابوەستێت.
- دەبێت بە گومانەوە بگێڕدرێتەوە لەسەر ئەوەی کە حەدیسی پێغەمبەرە. واتە: نابێت بوترێت: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی، یان هەر تەعبیرێکی تر کە وەها بگەیەنێت ئەو حەدیسە بە دڵنیاییەوە حەدیسی پێغەمبەرە.

پێشەوایانی فەرموودەی شەریف
دەفەرموون کەوا حەدیسی (ضعیف)
بۆ سیفاتی خوا ڕیوایەت ناکرێ
حەلاڵ وحەرام بەو ئیسپات ناکرێ

بـەلاّم لـە بــارەی تـەرغیب وتەرهیب
یــان ئـامـۆژگاری وئیرشـاد وتەهزیب
یــان بـۆ کـردەوەی باشـی ئادەمـیان
دەکرێت بهێنرێ وەك بەڵگــە وبەیان
خـــاوەن ئــەم ڕایــە لەنـاو زانـایـان
ئیبنی مــەهدیــە ونــاو عبد الرحمن
هـــەروا پێشەوای مـەزهەب حەنبەلی
پایـــەداریـــان کـــا (الله العليّ)
فەرموویان کەوا چەند مــەرجێك دەبێ
لـەنەو حـەدیسا یەك یــەك بێنـە جێ
نـابێت مـونکــەر بێ یان لاواز بێ زۆر
یــا دژبێ لەگەڵ ڕێسای دین وەك خۆر
یـاخود بـــە جـۆرێك بوتــرێ کـەوا
قـەولی حـــەزرەتە، ووا مانا بـــدا
(قـــال الرســـولُ کـــذا) مـــەیێژە
(رُوِيَ عَنْـــهُ) ڕاســـتـــە، وا بـێژە

# جۆری چوارەم
# حەدیسی (المَرْفُوع)

واتە: هەر حەدیسێك كە درابێتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، پێی دەوترێت: (المرفوع).

لەو پێناسەیەی سەرەوە بۆ حەدیسی (مرفوع) دەردەكەوێت كە مامۆستای دانەر پێی وایە كە حەدیسی (مرفوع) هەر كەسێك بیداتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، گرنگ نیە، بەڵكو گرنگ ئەوەیە كە بوترێت: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) وای فەرموو، یان وەهای كرد، یان وەها كرا لە خزمەتیدا وئەویش ئیقراری كرد، یان ئەخلاقی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) بەو شێوە بووە، یان سیفاتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) بەم شێوە بووە، ئیتر ئەم قسانە هاوەڵێكی حەزرەت خۆی بیكات، یان تابیعییەك یان هەر كەسێكی تر بێجگە لەوان. هەروەها گرنگ نیە كە ڕشتەی گێڕانەوەی ئەو حەدیسە بەیەكەوە بەستراو بێت، یان بچڕانی تێدا بێت، كە ئەم بۆچوونە ڕای زۆرینەی زانایانە لە بارەی حەدیسی (مرفوع)ەوە.

بۆیە دەكرێت بڵێین: ئەم جۆرە حەدیسە دەكرێت كە (صحيح) یان (حسن) بێت، ئەگەر ڕشتەی گێڕانەوەكەی بچڕانی تێدا نەبوو، یان (ضعيف) بێت ئەگەر بچڕانی تێدا بوو، بەڵكو دەشكرێت كە درۆ وهەڵبەستراو بێت بەدەم پێغەمبەرەوە.

بەڵام زانای بەناوبانگ بە (الخطيب البغدادي) بە مەرجی گرتووە، كە ئەو كەسەی حەدیسەكە دەداتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، دەبێت یەكێك بێت لە هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ ڕازی بێت). [1] واتە نابێت ڕشتەی گێڕانەوەكەی بچڕانی تێدا بێت، ویەكێك لە شوێنكەوتوان بیداتە پاڵ حەزرەت.

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٧، والباعث الحثيث / ٣٩، والغاية في شرح الهداية في علم الرواية، السخاوي / ١٥٩، وفتح المغيث / ١ / ١١٦، وتوجيه النظر / ١ / ١٧٦، وتوضيح الأفكار / ١ / ٢٣٠، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ١٨١، وشرح شرح نخبة الفكر / ٥٤٦، وشرح الزرقاني على البيقوني / ٩٥.

بۆیە بەلای بۆچوونی یەکەمەوە، حەدیسی (مرفوع) ئەم جۆرە حەدیسانە دەگرێتەوە: (المتّصل والمرسل والمنقطع والمعضّل والمعلّق)، چونکە مەرج نیە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکە بچڕانی تێدا نەبێت، بەلاّم بەلای بۆچوونی دووەمەوە حەدیسی (مرسل) ناگرێتەوە، چونکە ئەم جۆرە حەدیسە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا ڕاستەوخۆ لە یەکێك لە تابیعییەکانەوە دەگات بە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، بەبێ ئەوەی کە ناوی هیچ هاوەڵێکی تێدا ببرێت.

هۆی ناونانی ئەم جۆرە حەدیسە بە (مرفوع) ئەوەیە کە دراوەتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، بەمەش پلەی لە پلەی هەموو وتە وکردەوە وسیفات ورەوشتی هەموو کەسێکی تر بەرز ترە.

# جۆرەکانی حەدیسی (مرفوع)

حەدیسی (مرفوع) بە چەند جۆرێك دابەش دەکرێت، هەر دابەش کردنێکیان بە ئیعتیبارێکی تایبەتی، لەوانە:

١) دابەشکردنی بۆ (مرفوع)ی قەولی وفیعلی وتەقریری ووەصفی. وەك ئەوەی کە ڕاویەکە بڵێت: حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) وەهای فەرموو، یان حەزرەتم بینی (دروودی خودای لەسەر بێت) کە وەهای دەکرد، یان بڵێت: بە ئامادەبوونی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، کارێکی لەم جۆرە ئەنجام درا، ئەویش ئیقراری کرد ورێی باش بوو، یان بڵێت: شێوازی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) بەم شێوە بوو، یان جوانترین ڕەوشتی هەبوو، ئیتر بەم شێوە.

٢) دابەشکردنی بۆ (مرفوع)ی صەریح وحوکمی. صەریح وەك ئەو نموونانەی پێشوو، کە لە هەموویاندا بە ڕاشکاوانە حەدیسەکە دراوەتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت). بەلاّم (مرفوع)ی حوکمی ئەوەیە کە بە ڕاشکاوانە تێیدا نیە کە ئەوە حەدیسی حەزرەتە (دروودی خودای لەسەر بێت)، بەلاّم ئەوەندە هەیە کە ناشکرێت بدرێتە پاڵ ئەو

کەسەی کە ڕیوایەتی کردووە، چونکە بابەتەکە بواری ئیجتیهاد وقسەلەسەرکردنی تێدا نیە، بەڵکو هەر دەبێت لە شەرعەوە وەربگیرێت، وەکو ئەوەی کە یەکێك لە هاوەڵان بفەرموێت: فەرمانمان پێ کرا بە کردنی فلانە کار، یان بە نەکردنی،[1] یان بفەرموێت: ئیمە لە سەردەمی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێت) ئاوامان دەکرد، یان هەر کەسێك فلانە کار بکات، ئەوە بەهەشت جێگەیەتی.

(١) وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی بوخاری لە (أم عطية)وە ڕیوایەتی کردووە کە فەرموویەتی: (أُمِرْنَا أَنْ نُخْرِجَ الْعَوَاتِقَ وَذَوَاتِ الْخُدُورِ). البخاري / كتاب العيدين / باب خروج النساء والحيض إلى المصلى / بە ژمارەی ٩٣١. یان فەرمویەتی: (نُهِينَا عَنْ اتِّبَاعِ الْجَنَازَةِ وَلَمْ يُعْزَمْ عَلَيْنَا). البخاري / كتاب الجنائز / باب اتباع النساء الجنائز / بە ژمارەی ١٢١٩.

# جۆری پێنجەم

## حەدیسی (المَقْطُوع)

واتە: ئەوەش کە درابێتە پاڵ یەکێك لە تابیعییەکان، پێی دەوترێت: (المقطوع)

ئەمەش جۆرە دابەشکردنێکی تری حەدیسە، بەلاَم لەو ڕووەوە کە ئایا دراوەتە پاڵ کێ؟

مامۆستا لەم دوو نیوە دێڕەدا تەنها باسی دوانیانی کردووە، کە ئەوانیش: (مرفوع ومقطوع)ن. کە یەکەمیان ئەوەیە کە دراوەتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، وە دووەمیشیان ئەوەیە کە دراوەتە پاڵ یەکێك لە تابیعیەکانی پاش سەردەمی ئەو، بەلاَم باسی ئەو جۆرە حەدیسەی نەکردووە کە دەدرێتە پاڵ یەکێك لە هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ ڕازی بێت)، کە ئایا ئەو چی پێ دەوترێت؟

زانایان فەرموویانە: هەر حەدیسێك کە بدرێتە پاڵ یەکێك لە هاوەڵان، پێی دەوترێت: موقوف. جا مامۆستا دواتر لە دێڕێکدا ئاماژەی بەم جۆرەش کردووە، کە ئێمەش زیاتر لە جێگەی خۆیدا باسی دەکەین وڕوونی دەکەینەوە، وەك دەفەرموێت:

وَمَا أَضَفْتَهُ إِلَى الأَصْحَابِ مِنْ	قَوْلٍ وَفِعْلٍ فَهْوَ مَوْقُوفٌ زُكِنْ

تابیعی بەو کەسە دەڵێن کە بە خزمەتی هاوەڵی حەزرەت گەیشتبێت، وئیمانی بە حەزرەت هێنابێت، و بەو ئیمانەشەوە کۆچی دوایی کردبێت. وەکو: قەیسی کوڕی ئەبی حازیم، وسەعیدی کوڕی موسەییەب، وقاسیمی کوڕی موحەممەد، وعوروەی کوڕی زوبەیر، وخاریجەی کوڕی زەید، وئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدولڕەحمان، وعوبەیدولاَی کوڕی عەبدولاَی کوڕی عوتبە، وسولەیمانی کوڕی یەسار، ومەسروقی کوڕی ئەجدەع، وعەطائی کوڕی ئەبو ڕەباح، وعامیری شەعبی، وموجاهیدی کوڕە جەبر، وشێخ (حسن)ی بەصری، قەتادە،و ئەعمەش، وئیبنو سیرین، ئیبنو شەهابی زوهری، ویەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری، و.......هتد.

جا ئەوەی كە دراوەتە پاڵ یەكێك لەوانە[1] زانایان ناویان ناوە بە: مقطوع. چونكە لە پلەدا لە خوار (موقوف) و(مرفوع)ەوەیە وناگات بە ئەوان.

## جۆرەكانی حەدیسی ( مقطوع )

حەدیسی (مقطوع) دوو جۆری هەیە:

- (مقطوع)ی قەولی، وەكو هەر وتەیەك كە بدرێتە پاڵ یەكێك لەوانەی كە ناومان هێنان.
- (مقطوع)ی فیعلی، وەكو هەر كردارێك كە یەكێك لەوانە كردبێتی، وكەسێكیش بیگێڕێتەوە وبیداتە پاڵیان.

## جیاوازی نێوان ( مقطوع ومنقطع )

زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن كە ئەو دوو جۆرە حەدیسە جیاوازن لەیەكتر، چونكە (مقطوع) بە حەدیسێك دەڵێن كە درابێتە پاڵ یەكێك لە شوێنكەوتووان، بەڵام (منقطع) بە حەدیسێك دەوترێت كە ڕشتەی گێڕانەوەكەی بچڕانی تێدابێت.

بەڵام هەندێك لە زانایانی وەكو ئیمامی شافیعی و(أبو القاسم الطبراني) و(الدار قطني) و(الحميدي) لە نوسینەكانیاندا وا دەردەكەوێت كە جیاوازی لە نێوانیاندا ناكەن، بەڵكو هەردووكیان هەر بە یەك جۆر دادەنێن.[2]

---

(١) ئەگەرچی زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن كە ئەم جۆرە تەنها تایبەت نیە بە دانەپاڵی یەكێك لە شوێنكەوتووان، بەڵكو كەسانی دوای ئەوانیش هەر دەگرێتەوە. بڕوانە: نخبة الفكر / ٢١، واليواقيت والدرر / ٢ / ٢٢٤ – ٢٢٥.

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٨، والنكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ٨٤، وتوضيح الأفكار / ١ / ٢٤١، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ١٨٦، وتدريب الراوي / ١٥١.

وَ المسْنَدُ المتَّصِلُ الإِسْنَادِ مِنْ رَاوِيهِ حَتَّى المصْطَفَى وَ لَمْ يَبِنْ

# جۆری شەشەم

# حەدیسی (المُسْنَد)

واتە: حەدیسی (مسند): ئەو حەدیسەیە کە ڕشتەی گێڕانەوەکەی، لەو کەسەوە کە دەیگێڕێتەوە، تا دەگاتە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، بچڕانی تێدا نیە.

ئەم پێناسەیەی مامۆستا هەمان ئەو پێناسەیەیە کە ئیمامی حاکمی نەیسابووری پێی وەرگرتووە، کە فەرموویەتی: بەو حەدیسە دەوترێت کە یەکێك لە مامۆستایەکی خۆی بیستبێت، وئەویش لە مامۆستایەکی خۆیەوە، ئیتر هەر بەم شێوە تا دەگاتە یەکێك لە هاوەڵانی حەزرەت، وئەویش لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێت).[1]

بەڵام ئەم حەدیسە پێناسەی تری بۆ کراوە بێجگە لەم پێناسەیە، لەوانە[2]:

- خەطیبی بەغدادی فەرموویەتی: ئەو حەدیسەیە کە دەگاتە کۆتاییەکەی. واتە ڕشتەی گێڕانەوەکەی بچڕانی تێدا نیە تاوەکو دەگاتە ئەو کەسەی کە دەدرێتە پاڵی.
- (ابن عبد البَرّ) فەرموویەتی: ئەو حەدیسەیە کە لە حەزرەتەوە گێڕێردراوەتەوە، ئیتر ئایا بە ڕشتەیەکی نەبچڕاو بێت یان بچڕاو.

جیاوازی نێوان ئەم پێناسانە لەم چەند خاڵەدا دەردەکەوێت:

١) بەگوێرەی پێناسەی یەکەم، دەبێت حەدیسەکە بدرێتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، وڕشتەی گێڕانەوەکەشی بچڕانی تێدا نەبێت.

---

(١) بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ٥٦.

(٢) بڕوانە: الكفاية في علم الرواية / ٢١، والتمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد / ١ / ٢١ – ٢٢، ومقدمة ابن الصلاح / ٢٥ – ٢٦، والباعث الحثيث / ٣٨، ورسوم التحديث في علوم الحديث، برهان الدين أبو إسحاق إبراهيم بن عمر الشهير بالجعبري / ٦٤، وتوضيح الأفكار / ١ / ٢٣٤ – ٢٣٥، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ١٨٢.

٢) بەگوێرەی پێناسەی دووەم، دەبێت ڕشتەی گێڕانەوەکەی بچڕانی تێدا نەبێت، ئیتر جیاوازی نیە کە بدرێتە پاڵ حەزرە یان کەسێکی تر.

٣) بەگوێرەی پێناسەی سێیەم، دەبێت حەدیسەکە بدرێتە پاڵ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت)، ئیتر ئایا لە ڕێگەی ڕشتەیەکی نەبچڕاو یان بچڕاو.

بایەخ وگرنگی ئەم جیاوازیانەش لەم چەند خاڵەدا دەردەکەوێت:

١) بەگوێرەی پێناسەی یەکەم، دەبێت حەدیسەکە لەو جۆرە حەدیسە (مرفوع)انە بێت، کە ڕشتەی گێڕانەوەکەیان بچڕانی تێدا نیە.

٢) بەگوێرەی پێناسەی دووەم، گرنگ ئەوەیە کە ڕشتەکە بچڕانی تێدا نەبێت، ئیتر ئایا حەدیسەکە (مرفوع)ە یان (موقوف)ە یان (مقطوع).

٣) بەگوێرەی پێناسەی سێیەم هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ حەدیسی (مرفوع)دا نیە – بەلای زۆرینەی زانایانەوە –.

## حوکمی حەدیسی ( مسند )

حەدیسی (مسند)یش وەکو سێ جۆرەکەی تری پێش خۆی (مرفوع وموقوف ومقطوع) دەگونجێت کە (صحیح) بێت یان (حسن) یان (ضعیف). چونکە مەرج نیە کە بوترێت ئەو حەدیسە حەدیسی پێغەمبەرە، وڕشتەی گێڕانەوەکەشی پێکەوە بەستراوە وبچڕانی تێدا نیە، ئیتر ئەو حەدیسە (صحیح) بێت، یان (حسن) بێت، چونکە حەدیس بە گوێرەی هاتنەجێ ونەهاتنەجێی مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) و(حسن)د وەسفدار کردنی دەگۆڕێت، کە ئایا (صحیح)ە یان (حسن)ە یان (ضعیف).

# جۆری حەوتەم

# حەدیسی (المُتَّصِل)

واتە: هەر حەدیسێك كە لە ڕێگەی بیستنی هەریەكە لە ڕاویەكانەوە ڕشتەی گێڕانەوەكەی بگاتەوە بە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، ئەوە پێی دەوترێت: متّصل.

ئەم پێناسەیەی مامۆستای دانەر وەهای لێ وەردەگیرێت، كە ئەم جۆرە حەدیسە تەنها حەدیسی (مرفوع) دەگرێتەوە، كە دراوەتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، ئیتر نە حەدیسی (موقوف) ونە حەدیسی (مقطوع) ناگرێتەوە.

بەڵام هەندێك لە زانایان فەرموویانە: پێویست ناكات كە حەدیسەكە بدرێتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، بەڵكو دەكرێت كە بدرێتە پاڵ یەكێك لە هاوەڵان، بەڵكو لەوە زیاتریش هەندێكی تر فەرموویانە: دەكرێت كە بدرێتە پاڵ یەكێك لە تابیعییەكانیش. (١) هەر بۆیە وایان بەباش زانیوە كە ئەو دێڕە هۆنراوەیەی سەرەوە بگۆڕدرێت بەم شێوەیەی خوارەوە:

وَ مَا بِسَمْعِ كُلِّ رَاوٍ يَتَّصِلْ إِسْنَادُهُ لِلْمُنْتَهَى فَالْمُتَّصِلْ

بۆیە بەلای مامۆستاوە تەنها حەدیسی (مرفوع) دەكرێت پێی بوترێت: متّصل، بەڵام بەلای زانایانی ترەوە دەكرێت حەدیسی (مرفوع) و (مقطوع)یش پێیان بوترێت: متّصل.

هەروەها بەوەی كە مامۆستا فەرموویەتی: دەبێت هەریەكە لە ڕاویەكان لەوەی پێش خۆیی بیستبێت، ئەمە مانای وەهایە كە ئەگەرچی ئەو حەدیسە بە هەركام لە ڕێگاكانی تری وەرگرتنی حەدیسیش وەرگیرابێت، بەڵام لەبەر ئەوەی كە لە ڕێگەی بیستنەوە نیە، كەوابوو ناكرێت پێی بوترێت: متّصل. (٢)

---

(١) بڕوانە: شرح الزرقاني على البيقوني مع حاشية الأجهوري / ١٠٠ – ١٠١.

(٢) بڕوانە: حاشية الأجهوري على شرح الزرقاني على البيقوني / ١٠٠.

## حوکمی حەدیسی ( متّصل )

ئەم جۆرەش وەکو جۆرەکانی پێشتر کە باسمان کردن، دەکرێت کە (صحیح) بێت، وە دەشکرێت کە (حسن) بێت، وە دەشکرێت کە (ضعیف) بێت، ئەویش بەگوێرەی هاتنەجێ ونەهاتنەجێی مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) وحەدیسی (حسن).

## جیاوازی نێوان ( متّصل ومسند )

ئەگەر بە باشی بڕوانینە پێناسەی هەردووکیان، بەو جۆرەی کە مامۆستای دانەر کردوونی، دەبینین کە جیاوازیەکی سەرەکی هەیە لە نێوانیاندا، ئەویش ئەوەیە کە بەڵێ حەدیسی (متّصل) هەر حەدیسی (مسند)ە بەڵام مەرجێکی سەرەکی هەیە بۆ ئەوەی کە پێی بوترێت: (متّصل)، ئەویش ئەوەیە کە ڕێگەی وەرگرتنی ئەو حەدیسە لە هەریەکە لە ڕاویەکانەوە دەبێت لە ڕێگەی بیستنەوە بێت، بە پێچەوانەی حەدیسی (مسند) کە ئەم مەرجەی تێدا نەگیراوە، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە ڕشتەی گێڕانەوەکە بچڕانی تێدا نەبێت، ئیتر ئایا بەڕێگەی بیستن بێت یان هەرکام لە ڕێگاکانی تر.

کەواتە دەتوانین بڵێین: هەموو حەدیسێکی متّصل پێشی دەوترێت: مسند، چونکە گشتگیر ترە، بەڵام هەموو حەدیسێکی مسند پێی ناوترێت: متّصل، چونکە تایبەت ترە.

مسَلْسَلٌ قُلْ مَا عَلَى وَصْفٍ أَتَى		مِثْلُ أمَــا وَ اللهِ أَنْبَــانِي الفَتَى
كـــذَاكَ قَــدْ حَـدَّثَنِيهِ قَــائِمَــا		أوْ بَعْــدَ أنْ حَدَّثَنِي تَبَسَّمَـا

# جۆری هەشتەم

## حەدیسی (المُسَلْسَل)

واتە: بڵێ حەدیسی (مسلسل) ئەو حەدیسەیە کە لەسەر یەك وەصف هاتووە، وەکو: (وَاللهِ أَنْبَأنِي الفَتَى)، هەروەها وەکو: (قَدْ حَدَّثَنِيهِ قَائِما) یان وەکو: (بَعْدَ أنْ حَدَّثَنِي تَبَسَّمَا).

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین کە هەرکاتێك کە باسی ئەم جۆرە حەدیسە کرا، ئەوە باسی سیفەتێکی دیاریکراوی رِشتەی گێرِانەوەی حەدیسەکە دەکرێت، بە جۆرێك کە یەکە یەکەی ئەو کەسانەی کە لە رِشتەکەدا هەن، بە دارِشتنێکی دیاری کراو حەدیسەکە دەگێرِنەوە، وەکو ئەوەی کە مامۆستا خۆی نموونەی بۆ هێناوەتەوە بە: (وَاللهِ أَنْبَأنِي الفَتَى)، کە یەکە بە یەکەی راویەکان کاتێك کە حەدیسێك بگێرِنەوە، ئەم تەعبیرەیان بەم دارِشتنە بەکار هێناوە. یان خۆیان صیفەتێکی دیاریکراویان هەبووە، یان لەسەر حاڵەتێکی تایبەتی بوون، وەکو ئەو دوو نموونەکەی تر، کە فەرمووی: (قَدْ حَدَّثَنِيهِ قَائِما) و (بَعْدَ أنْ حَدَّثَنِي تَبَسَّمَا)، کە هەریەکە لە راویەکان کاتێك کە حەدیسێك بگێرِنەوە، هەڵدەسنە سەر پێ ورِادەوەستن، یان دوای ئەوەی کە حەدیسەکە دەگێرِنەوە وزەردەخەنەیەکی بۆ دەکەن.

هەروەها هەر نموونەیەکی تر کە لە گێرِانەوەی حەدیسدا هەبێت، وتەیەکی تایبەتی، یان سیفەتێکی تایبەتی تێدا بێت، و لەگەڵ هەر یەکە لە راویەکاندا ئەو وتە یان ئەو سیفەتە دووبارە ببێتەوە، ئەوە ئەو حەدیسە وەسفدار دەکرێت بەوەی کە (مسلسل)ە. وەکو ئەوەی کە هەموو راویەکان لە شێوازی گێرِانەوەی حەدیسەکەدا بڵێن: سوێند بە خودا کە فلانە کەس ئەو حەدیسەی بۆ گێرِامەوە، ئیتر هەر بەو شێوەیە تاوەکو دەگاتەوە بەو کەسەی کە دراوەتە پاڵی، یان هەموو راویەکان لە کاتی گێرِانەوەی حەدیسەکەدا پەنجەیان بەکار هێناوە بۆ ژماردن، یان مامۆستا و قوتابیەکەی پەنجەکانی دەستیان بکەن بەناو یەکدا وهەڵیان بپێکن،

یان ڕیشی خۆیان بگرن، یان باسی شوێن یان کاتی گێڕانەوەی حەدیسەکە دەکەن، یان هەر شێواز وحاڵەتێکی تر.

بۆ نموونە لە گێڕانەوەی ئەو حەدیسە (صحیح)ەی کە ئیمامی بوخاری وموسلیم وکەسانی تریش ڕیوایەتیان کردووە سەبارەت بەو پیاوەی کە لە یەکێك لە ڕۆژەکانی ڕەمەزاندا لەگەڵ خێزانەکەیدا جووت بوو بوو، حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرمووی دەبێت کەفارەتەکەی بدات........ ئەویش وتی: (فَوَاللَّهِ مَا بَيْنَ لاَبَتَيْهَا أَهْلُ بَيْتٍ أَفْقَرُ مِنْ أَهْلِ بَيْتِي) [1]. واتە دەی سوێندبێ بە خودا لە نێوان ئەم دوو شاخە ڕەشەدا (کە مەبەستی شاری مەدینەی پیرۆز بووە) کەسێکی تێدا نیە لە من هەژارتر بێت. ئیتر حەزرەتیش (دروودی خودای لەسەر بێت) ئەوەندە بە قسەی ئەو پیاوە پێکەنی تاوەکو ددانەکانی دەرکەوتن. ئەگەر هەموو ئەو کەسانەی کە ئەم حەدیسەیان گێڕاوەتەوە پێکەنیبن تاوەکو ددانیان دەرکەوتبێت، ئەوا بەم حەدیسە دەوترێت: (مسلسل)، کە هەموو ڕاویەکان حاڵەتێکی تایبەتیان هەبوو لە کاتی گێڕانەوەیدا، ئەویش ئەودیە کە پێکەنیوون.

نموونەیەکی تر لەسەر ئەوەی کە هەر یەکە لە ڕاویەکان لە کاتی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا وتەیەکیان دووبارە کردۆتەوە، وەکو ئەو حەدیسە (صحیح)ەی کە ئیمامی ئەحمەد وئەبوداوود وئیبنو حیببان ڕیوایەتیان کردووە کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی بە (معاذ)ی کوڕی جەبەل: ئەی (معاذ)، سوێن بێ بە خودا کە خۆشم دەوێیت، وەسیەت بۆ دەکەم کە لە پاش هەموو نوێژێك لە بیرت نەچێت کە بڵێیت: « اللَّهُمَّ أَعِنِّي عَلَى ذِكْرِكَ وَشُكْرِكَ

(١) البخاري / الصوم / باب إذا جامع في رمضان ولم يكن له شيء فتصدق عليه فليكفر / بە ژمارەی ١٨٣٤، ومسلم / الصيام / باب تغليظ تحريم الجماع في نهار رمضان على الصائم ووجوب الكفارة / بە ژمارەی ٢٦٥١، وأحمد / مسند المكثرين من الصحابة / مسند أبي هريرة / بە ژمارەی ٧٢٨٨.

وَحُسْنِ عِبَادَتِكَ »[1]. جا دەگێڕنەوە کە ئەم حەدیسە کە ڕیوایەت کراوە، هەموو ڕاویەکان بەوەی پاش خۆیان وتووە: (إنِّي أحبك) واتە: بەڕاستی من تۆم خۆش دەوێت.[2]

کەواتە ئێستە ئەگەر پێناسەیەکی وردی حەدیسی (مسلسل) بکەین، دەتوانین بڵێین: ئەو جۆرە حەدیسەیە کە کەسانی ڕشتەی گێڕانەوەکەی، یەك لەدوای یەك، لە کاتی گێڕانەوەیدا، یان خۆیان لەسەر سیفەتێك یان حاڵەتێکی دیاری کراو بوون، یان ئەو حەدیسەی کە گێڕاویانەتەوە.[3] ئیتر ئەو حاڵەت وصیفەتە دیاری کراوە قسەیەك بێت، یان کردەوەیەك بێت، یان هەردووکیان بێت.

## سوودەکانی حەدیسی ( مسلسل )

حەدیسی (مسلسل) چەند سوود وقازانجێکی هەیە، لەوانە:

١)دەبێت بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ڕشتەی گێڕانەوەی ئەو حەدیسە بەیەکەوە پەیوەستە وبچڕانی تێدا نیە. وەکو ئەوەی کە هەموو ڕاویەکان یەك لەدوای یەك بڵێن: من لە فلانە کەسم بیست.

٢)حەدیسەکە دوور دەخاتەوە لە (تدلیس)

٣)دەبێتە هۆی شوێنکەوتنی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) لە وتار وکردارەکانیدا.

٤)بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ڕاویەکان زۆر وریا وبیر تیژن، چونکە سەرەڕای ئەوەی کە ڕشتەی ڕیوایەتی حەدیسەکە ودەقی حەدیسەکەیان لەبەر کردووە، هەستاون بە لەبەر کردن وئاگالێبوونی ئەو حاڵەتە تایبەتەش کە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەدا هەبووە.

---

(١) أحمد / مسند المكثرين من الصحابة / مسند الأنصار / حديث معاذ بن جبل / بە ژمارەی ٢٢١٧٢، وأبو داود / الصلاة / باب في الاستغفار / بە ژمارەی ١٥٢٤، وابن حبان / كتاب الصلاة / باب صفة الصلاة / ذكر ما يستحب للمرء أن يستعين بالله جل وعلا في دعائه في عقيب الصلاة على قتال أعدائه / بە ژمارەی ٢٠٢٠.

(٢) بۆ نموونەی زیاتر لەسەر حەدیسی (مسلسل) بڕوانە هەریەکە لە: الشذا الفياح من علوم ابن الصلاح / ٢ / ٤٥٦ - ٤٥٩، وتدريب الراوي / ٤٦١، واليواقيت والدرر / ٢ / ٢٨١ - ٢٨٤، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٩١، وشرح شرح نخبة الفكر / ٦٥٧ - ٦٥٩، وفتح المغيث / ٣ / ٥٢ - ٥٤.

(٣) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٦١، والمنهل الروي / ٥٧.

٥)لە ڕێگەیەوە دەزانرێت کە ئەو حەدیسە لە کوێوە هاتووە وبەرەو کوێ دەڕوات، کە ئەمەش سوودێکی زۆری هەیە بۆ شەرعزانان لە بارەی پێشخستنی کارکردن بە حەدیسێك لەسەر حەدیسێکی تر. بۆ نموونە ڕێك دەکەوێت کە دوو کەس یان زیاتر لە ڕاویەکان هەمان ناویان هەیە، وەکو: عیمران، کە ناو بووە بۆ هەریەکە لە: (عمران القصير) و(أبو رجاء العطاردي) و(عمران ابن حصين)، کە هاوەڵی حەزرەت بووە. یان وەکو ناوی سولەیمان، کە ناو بووە بۆ هەریەکە لە: (سليمان ابن أحمد الطبراني) و(سليمان ابن أحمد الواسطي) و(سليمان ابن عبد الرحمن الدمشقي) کە ناسراوە بە: (ابن بنت شرحبيل).

٦)دەبێت بە هۆی بەهەڵەدا نەچوون، سەبارەت بە هەندێك لە ڕاویەکان، وەکو ئەوەی کە دوو کەس هەمان ناویان هەبێت، بەڵام یەکێکیان لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا مامۆستایە وئەوی تریان قوتابی، وەکو ئیمامی بوخاری کە کەوتوەتە نێوان دوو کەس، کە هەردووکیان ناویان موسلیمە، مامۆستاکەی بریتی بووە لە: (مسلم ابن إبراهيم الفراهيدي)، بەڵام قوتابیەکەی بریتی بووە لە: (مسلم بن الحجاج القشيري) خاوەنی صەحیحی موسلیم.

٧)دەبێت بەهۆی لابردنی گومان ولێتێکچوون سەبارەت بەو کەسانەی کە ناوی خۆیان وباوك وباپیرەیان هەمان ناوە، وەکو: (حسن)ی کوڕی (حسن)ی کوڕی (حسن)ی کوڕی ئیمامی عەلی. ئێستا ئەگەر کەسێك نەزانێت ئەمانە کوڕ وباوکن، ئەو کاتە واتێدەگات کە ئەو ڕشتەیە دووبارە بوونەوەی تێدایە. یان ڕێك دەکەوێت کە کەسێك ناوی خۆی وباوکیش چەند جارێك لە ڕشتەی باپیرەکانیدا دووبارە دەبێتەوە، وەکو ناوی: (أبو اليمن الكندي) کە بریتیە لە: زيد بن الحسن بن زيد بن الحسن بن زيد بن الحسن.[١]

(١) بڕوانە: فتح المغيث / ٣ / ٥٦.

## حوکمی حەدیسی ( مسلسل )

لەوانەیە لەو باسەی پێشووماندا کەسێك وەها گومان ببات کە ئەگەر حەدیسێك مسلسل بوو ئەوا دەبێت (صحیح)یش بێت، بەڵام وەها نیە، بەڵکو هەر وەکو لە پێناسەکەیدا ڕوونمان کردەوە، ئەم حەدیسە تەنها ئەوەمان تێ دەگەیەنێت کە حاڵ وسیفەتی ڕاویەکان لەکاتی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا چۆن بووە، ئەگینا دەکرێت ئەو حەدیسە (صحیح) بێت یان (صحیح) نەبێت، ئەویش بەپێی هاتنەجێ ونەهاتنەجێی مەرجەکانە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەصڵی ئەو گومانە خۆی هەڵەیە ونابێت ببرێت، زانایان فەرموویانە: زۆر بە کەمی ڕێك دەکەوێت کە ئەو وەصفی (تسلسل)ە لە حەدیسدا (ضعیف) نەبێت. واتە بە زۆری ئەو (تسلسل)ەی کە لە ڕشتەی حەدیسەکاندا هەیە (ضعیف)ە، کە ئەمەش وەها ناگەیەنێت کە حەدیسەکە (ضعیف) بێت، چونکە وەك ئەو نموونەیەی کە هێنامانەوە زانایان بە (صحیح)یان داناوە، ولە هەمان کاتیشدا (مسلسل)ە، بەڵام زۆر جار ئەو حەدیسانەی کە بە (مسلسل)ی هاتوون، (ضعیف)یشن لەو ڕێگەوە کە لێیەوە هاتوون، ئەگینا لە ڕێگەی تردەوە – بێجگە لەو ڕێگە – دەکرێت کە (صحیح) بن.(١)

## صەحیحترین حەدیسی ( مسلسل )

ئیمامی (سیوطي) لە شێخی عەسقەلانیەوە نەقڵ دەکات کە فەرموویەتی: (صەحیحترین (سلسلة) لە دنیا، بریتیە لە (سلسلة)ی خوێندنەوەی سورەتی (الصف).(٢)

ئیمامی (ترمذي) وغەیری ئەویش گێڕاویانەتەوە کە عەبدوڵای کوڕی سەلام فەرموویەتی: کۆمەڵێك لە هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ ڕازی بێت) دانیشتبووین، و لە نێوان

(١) بروانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٦١، والموقظة في علم مصطلح الحديث، الإمام الذهبي / ٧، ومنهج النقد في علوم الحديث / ٣٥٧.

(٢) بروانە: تدريب الراوي/٤٦٣. هەروەها ئیمامی سەخاویش هەمان بۆچوونی هەیە. بروانە: فتح المغيث/٣/٥٤.

خۆماندا باس وخواسمان بوو، وتمان: لَوْ نَعْلَمُ أَيَّ الْأَعْمَالِ أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ لَعَمِلْنَاهُ. واتە خۆزگە دەمانزانی چی کردەوەیەك لەلای خودا لە هەموو کردەوەکان خۆشەویست ترە، بۆ ئەوەی بمانکردایە. ئەوەبوو کە خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: { سَبَّحَ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ }، تاوەکو کۆتایی سورەتەکە، ئەوجا عەبدولاّی کوڕی سەلام فەرمووی: حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) هەمووی بۆ خۆندینەوە. جا هەموو ئەو کەسانەی کە لە ڕشتەی گێڕانەوەی ئەم حەدیسەدا هەن، یەك لەدوای یەك سوورەتەکەیان خوێندوەتەوە بۆ ئەوەی دوای خۆیان.[1]

---

(١) سنن الترمذي / تفسير القرآن عن رسول الله / ومن سورة الصف / بە ژمارەی ٣٢٣١، والسنن الكبرى للبيهقي / كتاب السير / باب فِي فَضْلِ الْجِهَادِ فِي سَبِيلِ اللَّهِ / بە ژمارەی ١٨٩٧٠، والحاكم في المستدرك / كتاب التفسير / تفسير سورة الصف / بە ژمارەی ٣٨٠٦، پاشان فەرموویەتی: هذا حديث صحيح على شرط الشيخين و لم يخرجاه. زانای پایەبەرز (عبد الفتاح أبو غدة) دوای ئەوەی کە بە کتێبی (الموقظة)ی ئیمامی (الذهبي)دا چووەتەوە وساغی کردۆتەوە، هەستاوە پێنج باسی لە کۆتایی کتێبەکەدا زیاد کردووە، وەکو تەواوکەر، ناوی ناون (خمس تتمات في أبحاث حديثية هامة). جا لە سەرەتای باسی دووەمدا زۆر بە جوانی ئەم حەدیسە ڕوون دەکاتەوە، وئەوەش دەفەرموێت کە ئەویش خۆی لە ڕێگەی چەند مامۆستایەکییەوە ئەو حەدیسەی پێگەیشتووە. بڕوانە: الموقظة في علم مصطلح الحديث / التتمة الثانية / ١٠٣ – ١٠٥.

# جۆری نۆیەم

## حەدیسی (العَزِیز)

واتە حەدیسی عەزیز بەو حەدیسە دەوترێت کە دوو کەس یان سێ کەس گێڕابێتیانەوە.

مامۆستای دانەر لە سەرەتای هۆنراوەکەیدا حەدیسی دابەش کردبوو بە گوێرەی (صحیح)ی و(ضعیف)ی، یان کارپێکردن وبە بەڵگە هێنانەوە، بۆ لای حەدیسی: صحیح، حسن، ضعیف. ئەوجا لێرەوە دەیەوێت بچێتە سەر دابەشکردنێکی تر، ئەویش بە گوێرەی ژمارەی ئەو کەسانەی کە حەدیسەکەیان گێڕاوەتەوە، واتە ئەو حەدیسە لە چەند ڕێگەوە گەیشتووە بە ئێمە؟

فەرموودەناسان[1] بە گوێرەی زۆری وکەمی ئەو ڕێگایانەی کە حەدیسیان لێوە هاتووە، هەستاون بە دابەشکردنی حەدیس بۆ لای:

١) المتواتر. ئەو حەدیسەیە کە ژمارەیەکی زۆری وەها، چین لەدوای چین گێڕاویانەتەوە، کە بە گوێرەی عادەت ناکرێت ئەوانە لەسەر درۆ کۆببنەوە، وە حەدیسەکەش تایبەتە بە شتێکی بەرجەستە وهەستپێکراو.

٢) الآحاد. ئەو حەدیسەیە کە ژمارەیەکی کەم کەس گێڕاویانەتەوە.

ئەوجا هاتوون حەدیسی ئاحادیشیان دابەش کردووە بۆ لای:

١) المشهور: ئەو حەدیسەیە کە لە چینی یەکەمدا زیاد لە سێ کەس گێڕاویانەتەوە، بەڵام ژمارەیان ناگاتە ژمارەی ئەو کەسانەی کە حەدیسی (متواتر) ڕیوایەت دەکەن. کە لە باسی دوای ئەم باسەدا بە درێژی ڕوونی دەکەینەوە.

٢) العزیز: ئەو حەدیسەیە کە دوو یان سێ کەس گێڕاویانەتەوە. کە ئێستا بە درێژی باسی دەکەین.

---

(١) بڕوانە: نخبة الفکر، ابن حجر العسقلاني / ١٣.

٣) الغريب: ئەو حەدیسەیە کە تەنها یەك کەس گێڕاویەتیەوە. کە لە جێگەی خۆیدا بە درێژی باسی داکەین، کاتێك کە دەگەین بەو نیوە دێڕەی کە مامۆستا تیایدا دەفەرموێت:

| | |
|---|---|
| ............................ | وَقُــلْ غَرِيبٌ مَـــا رَوَى رَاوٍ فَقَــطْ |
| حـــەدیســـی پیرۆز لەلای زانـــایـــان | دابــــەش کـراوە، وهاتـۆتـە بـەیـان |
| بـــەپێی ژمارەی طەریقی نیسنـــــاد | بـــۆ (متواتر) وە لــــەبـــۆ (آحاد) |
| (آحاد)یش لەبۆ سێ جۆر بــە تــەرتیب | (مشهور وعزيز) سێیەمیـــان (غريب) |

ئەوجا لە پێناسەکەی مامۆستای دانەر بۆ حەدیسی (عزیز)، چەند شتێك وەردەگیرێت:

- وەها دەردەکەوێت کە مەرج نیە ئەم جۆرە حەدیسە حەدیسی (مرفوع) بێت، بەڵکو دەگونجێت کە (موقوف) یان (مقطوع)یش بێت. واتە مەرج نیە کە تەنها درابێتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، بەڵکو دەکرێت کە درابێتە پاڵ یەکێك لە هاوەڵان یان یەکێك لە تابیعییەکان.
- وەها دەردەکەوێت کە مامۆستا لەسەر بۆچوونی ئەو زانایانەیە (شێخی شارەزووری) کە فەرموویانە: ئەگەر دوو کەس یان سێ کەسیش حەدیسەکەیان گێڕابێتەوە، ئەوا هەر بە حەدیسی (عزیز) دادەنرێت، بە پێچەوانەی بۆچوونی ئەو زانایانەوە (شێخی عەسقەلانی) کە فەرموویانە: تەنها ئەو حەدیسە بە حەدیسی (عزیز) دادەنرێت کە دوو کەس ڕیوایەتیان کردبێت، ئەگینا ئەگەر بوو بە سێ کەس یان زیاتر، ئەوا پێی دەوترێت: (مشهور).(١)
- دیار نیە کە ئایا مەرجە بۆ ئەوەی بە حەدیسێك بوترێت: (عزیز)، دەبێت ئەو حەدیسە لە هەموو چینەکانی ڕاویەکاندا دوو کەس یان سێ کەس هەبن، حەدیسەکە ڕیوایەت بکەن، وەکو زۆرینەی زانایان فەرموویانە؟ یان نەخێر تەنها لە چینی

(١) بڕوانە: تدريب الراوي / ٤٥٤، وشرح شرح نخبة الفكر / ١٩٨.

یەکەمدا ئەو مەرجە پێویستە، وئیتر لە چینی دوای ئەودا یەك بن یان دوو یان سێ یان زیاتر، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، و هەر پێی دەوترێت: (عزیز).[1]

## حوکمی حەدیسی (عزیز)

ئەم حەدیسەیش وەکو جۆرەکانی پێش خۆی، دەکرێت کە (صحیح) بێت ودەشکرێت کە (صحیح) نەبێت، ئەویش بەگوێرەی ئەوەی کە مەرجەکانی تێدا هاتوونەتە جێ یان نا.

بەلاّم هەندێك زانایان لە باسی ئەم جۆرە حەدیسەدا هاتوون باسی شتێکی تریشیان کردووە، کە من پێم وایە باسەکە زۆر لە جێگەی خۆیدایە، ئەگەرچی پەیوەندیشی بە باسێکی ترەوە هەیە کە پێشتر بە درێژی ڕوونمان کردوەتەوە، باسەکەش ئەوەیە:

ئایا بۆ ئەوەی کە حەدیس (صحیح) بێت، مەرجە کەوا عەزیز بێت؟ بە واتایەکی ڕوون تر: ئایا پێویستە حەدیسی (صحیح) لە هەموو چینەکانی ڕاویەکانیدا دوو یان سێ کەس گێڕابێتیانەوە، یان مەرج نیە؟

زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە: نەخێر مەرج نیە حەدیسی (صحیح) عەزیز بێت،[2] هەروەکو لە تەعبیری مامۆستای دانەریشەوە وا وەردەگیرێت، کە فەرموویەتی: (یرویه عدل ضابط) کە بە تاك هێناونی، بەلّکو ئەگەر لە تەواوی چینەکانیشدا یان لە هەرکام لە چینەکاندا تەنها یەك کەس ڕیوایەتی کردبوو، ئەوا هەر بە (صحیح) دادەنرێت، بەمەرجێك تەواوی ئەو مەرجانەی کە لە باسی مەرجەکانی حەدیسی (صحیح)دا باسمان کردن، هاتبنە جێ.

---

(١) بڕوانە: اليواقيت والدرر /١/٢٨٠، وشرح الزرقاني على البيقوني مع حاشية الأجهوري /١٠٨-١٠٩.

(٢) بڕوانە: نخبة الفكر /١٣، وە ئەو شەرحانەی کە لەسەری کراون، وەکو: نزهة النظر في توضيح نخبة الفكر /٥١-٥٤، واليواقيت والدرر/١/٢٨٢، وشرح شرح نخبة الفكر /١٩٨.

# نموونەی حەدیسی (عزیز)

زانایان نموونەیان بۆ ئەم جۆرە حەدیسە بەو حەدیسە (صحیح)ە هێناوەتەوە کە ئیمامی بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە، کە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت) فەرموویەتی: « لاَ يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّى أَكُونَ أَحَبَّ إِلَيْهِ مِنْ وَالِدِهِ وَوَلَدِهِ وَالنَّاسِ أَجْمَعِينَ »[1]

ئەوجا فەرموویانە: ئەم حەدیسە لە ناو هاوەڵانی حەزرەتدا (خودایان لێ ڕازی بێت)، ئەبو هورەیرە وئەنەس ڕیوایەتیان کردووە، ئەوجا لە ئەنەسیشەوە، قەتادە وعەبدولعەزیزی کوڕی صوهەیب ڕیوایەتیان کردووە، وە لە قەتادەشەوە، شوعبە وسەعیدی کوڕی ئەبو عورووبە ڕیوایەتیان کردووە، وە لە عەبدولعەزیزیشەوە، ئیسماعیلی کوڕی عولەییە وعەبدولوارث ڕیوایەتیان کردووە، لەوانیشەوە کۆمەڵێکی تر ڕیوایەتیان کردووە.[2]

(١) البخاري / كتاب الإيمان / حب الرسول / بە ژمارەی ١٥، ومسلم / الإيمان / باب وجوب محبة الرسول.... / بە ژمارەی ١٧٨، لە صەحیحی موسلیمدا بەم جۆرە هاتووە: ولده ووالده.

(٢) بڕوانە هەریەکە لە: نزهة النظر / ٥٤، وفتح المغيث / ٣ / ٣٣، وتدريب الراوي / ٤٥٤ - ٤٥٥، واليواقيت والدرر / ١ / ٢٩٠ - ٢٩١.

# جۆری دەیەم

## حەدیسی (المَشْهُور)

واتە: حەدیسی مەشهوور ئەو حەدیسەیە کە زیاد لە سێ کەس ڕیوایەتیان کردووە.

هەر وەکو لە باسی حەدیسی عەزیزدا ڕوونمان کردەوە، مامۆستای دانەر ئەو بۆچوونەیانی هەڵبژاردووە کە پێی وایە حەدیسی عەزیز ئەوەیە کە دوو یان سێ کەس ڕیوایەتیان کردبێت، وە حەدیسی مەشهووریش ئەوەیە کە لە سێ کەس زیاتر ڕیوایەتی کردبێت، بەڵام نابێت ژمارەی کەسەکان بگاتە ڕادەی ژمارەی کەسەکانی حەدیسی (متواتر).

ئەم مانایەی کە بۆ حەدیسی مەشهوورمان کرد، ئەوەیە کە زانایانی فەرموودەناس کردوویانە، کە ناوێکی تریشیان لێناوە، ئەویش ئەوەیە کە پێی دەڵێن: (مُسْتَفِیض).

بەڵام بەلای زانایانی ئوصولەوە، حەدیسی مەشهوور جۆرێك نیە لە جۆرەکانی حەدیسی (آحاد)، بەڵکو بەلای ئەوانەوە حەدیس دابەش دەکرێت بۆ سێ جۆر: (متواتر ومشهور وآحاد)، واتە: حەدیسی مەشهوور دەکەن بە جۆرێکی سەربەخۆ لە بەرامبەر حەدیسی (متواتر وآحاد)، وە پێناسەشی بەم جۆرە دەکەن: ئەو حەدیسەیە کە لە سەرەتای گێڕانەوەیدا بە ئاحادی هاتووە، پاشان لە سەدەی دووەم وسێیەمدا تەشەنەی کردووە وبلاّو بوەتەوە، و ئیتر بەم شێوە خەڵکیش باوەڕیان پێ کردووە، وکاریان پێ کردووە.

هەروەها مانایەکی تریش هەیە بۆ حەدیسی مەشهوور، ئەویش مانا زمانەوانیەکەیەتی، واتە: لەناو خەڵکیدا وا باوە کە حەدیسە، ئیتر مەرج نیە کە لە ڕاستیشدا هەر حەدیس بێت، بەڵکو دەگونجێت حەدیسی (صحیح)یش بێت، وە دەشگونجێت کە هەڵبەسراوبێت بە دەمی

حەزرەتەوە،[1] ئەوەتا زانایان چەند وتەبەکی بەناوبانگیان بۆ هێناوین، کە وا باوە لەناو خەڵکیدا پێیان دەڵێن: حەدیسی حەزرەت، کەچی هەر ئەصڵیشیان نیە، لەوانە:

- " مَنْ بَشَّرَنِي بِخُرُوجِ آذارَ بَشَّرْتُهُ بالجَنَّةِ "
- " يومُ نَحْرِكُم يومُ صَوْمِكُم "
- " النَّظافةُ مِنَ الإيمانِ "
- " حُبُّ الوَطَنِ مِنَ الإيمانِ "
- " خَيْرُ الأَسْماءِ ما حُمِّدَ وعُبِّدَ "[2]

---

(١) زانای ناودار أبو الفرج ابن الجوزي کتێبێکی داناوە بەناوی: (الموضوعات) زۆرێك لەو بەناو حەدیسانەی تێدایە کە لەناو خەڵکیدا وا باون کە حەدیسن، بەلام لە ئەصڵدا هەڵبەسراون بەدەمی حەزرەتەوە. هەروەها چەندین کتێبی تر لەم بارەیەوە نووسراون، کە هەندێکیان ئەصڵن، وهەندێکیشیان کورت کراوەن، وهەندێکی تریشیان کۆکراوەن، لەوانە:

- التذكرة في الأحاديث المشتهرة، لبدر الدين محمد بن عبد الله الزركشي.
- اللآلئ المنثورة في الأحاديث المشهورة، مما ألفه الطبع، وليس له أصل في الشرع لابن حجر العسقلاني.
- المقاصد الحسنة في بيان كثير من الأحاديث المشتهرة على الألسنة، للحافظ السخاوي.
- الدرر المنتثرة في الأحاديث المشتهرة، لجلال الدين عبدالرحمن السيوطي.
- تمييز الطيب من الخبيث فيما يدور على ألسنة الناس من الحديث، لعبدالرحمن بن علي بن الديبع الشيباني.
- البدر المنير في غريب أحاديث البشير النذير، لعبد الوهاب بن أحمد الشعراني.
- تسهيل السبيل إلى كشف الالتباس عما دار من الأحاديث بين الناس، لمحمد ابن أحمد الخليلي.
- إتقان ما يحسن من الأحاديث الدائرة على الألسن، لنجم الدين محمد بن محمد الغزي.
- كشف الخفا ومزيل الإلباس عمّا يدور من الحديث على ألسنة الناس، للعجلوني.
- أسنى المطالب في أحاديث مختلفة المراتب، لمحمد بن درويش الشهير بالحوت البيروتي.

(٢) ئەم وتەیە بەم دەقە درووست نیە بدرێتە پاڵ حەزرەت، ئەگینا چەندین حەدیسی تر هاتوون کە مانا وواتای ئەم وتەیە دوویات دەکەنەوە، وەکو لە چەندین سەرچاوەی فەرموودەکانی حەزرەتدا هاتووە، کە حەزرەت فەرموویەتی: (( إِنَّ أَحَبَّ أَسْمَائِكُمْ إِلَى اللَّهِ عَبْدُ اللَّهِ وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ ))، یان دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (( إِذَا سَمَّيْتُمْ فَعَبِّدُوا )). بڕوانە: صحيح مسلم / الآداب / باب النهي عن التكني وبيان ما يستحب من الأسماء، وسنن أبي داود / الأدب / باب في تغيير الأسماء، وسنن الترمذي / الأدب / باب ما جاء ما يستحب من الأسماء.

# جۆرەکانی حەدیسی (مشهور)

کاتێك کە باس لە حەدیسی مەشهوور دەکرێت، ئەوا بەپێی ئەو لایەن وکۆمەڵانەی کە حەدیسەکە مەشهوورە بەلایانەوە، دەکرێت بوترێت: ئەم حەدیسە چەند جۆرێکی هەیە، لەوانە: [1]

١)هەندێکیان تەنها مەشهوورن لەلای زانایانی حەدیس بە تایبەتی، وەکو: ئەو حەدیسەی کە ئیمامی بوخاری وموسلیم لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە، سەبارەت بە شەهیدانی بیری مەعوونە، کە فەرموویەتی: قَنَتَ النَّبِيُّ - صلى الله عليه وسلم - بَعْدَ الرُّكُوعِ شَهْرًا يَدْعُو عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَيَقُولُ «عُصَيَّةُ عَصَتِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ»[2]

٢)هەندێکیشیان مەشهوورن لەلای فەرموودەناسان وزانایان وخەڵکیش، وەکو حەدیسی: «الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ» [3]

٣)هەندێکیشیان مەشهوورن بەلای شەرعزانەکانەوە، وەکو حەدیسی: «لاَ ضَرَرَ وَلاَ ضِرَارَ»[4] وە حەدیسی: «أَبْغَضُ الْحَلاَلِ إِلَى اللَّهِ الطَّلاَقُ»[5]

٤)هەندێکیشیان مەشهوورن بەلای زانایانی (أصول الفقه)ەوە، وەکو حەدیسی: «رُفِعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ وَالنِّسْيَانَ وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»[6]

---

(١) بروانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٥٥، واليواقيت والدرر / ١ / ٢٧٩، وفتح المغيث / ٣ / ٣٦، وتدريب الراوي / ٤٤٦ - ٤٤٨، وتوجيه النظر / ١ / ٤٢٥ - ٤٢٦، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٨٠ - ٨١، ومنهج النقد في علوم الحديث / ٤١ - ٤١١.

(٢) البخاري / كتاب المغازي / باب غزوة الرجيع ورعل وذكوان وبئر معونة / بە ژمارەی ٣٨٦٨، ومسلم / المساجد / باب اسْتِحْبَابِ الْقُنُوتِ فِي جَمِيعِ الصَّلاَةِ إِذَا نَزَلَتْ بِالْمُسْلِمِينَ نَازِلَةٌ / بە ژمارەی ١٥٧٩.

(٣) البخاري / كتاب الإيمان / باب المسلم من سلم المسلمون من لسانه ويده / بە ژمارەی ١٠، ومسلم / الإيمان / باب بيان تفاضل الإسلام وأي أموره أفضل / بە ژمارەی ١٧١.

(٤) ابن ماجة / الأحكام / باب من بنى في حقه ما يضر بجاره / بە ژمارەی ٢٣٤٠.

(٥) ابن ماجة / كتاب الطلاق / باب حدثنا سويد بن سعيد / بە ژمارەی ٢٠١٨.

(٦) أخرجه الطبراني عن ثوبان / كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال/ الفصل الثاني في أحكام التوبة / ٤ / ٩٨ / بە ژمارەی ١٠٣٠٢.

٥)هەندێکیشیان مەشهوورن بەلای زانا نەحویەکانەوە، وەکو حەدیسی: «نِعْمَ العبدُ صُهَيْبُ، لَوْ لَمْ يَخَفِ اللهَ لَمْ يَعْصِهِ»(١)

٦)هەندێکیشیان مەشهوورن بەلای زۆرینەی خەڵکیەوە، وەکو حەدیسی: «مَنْ دَلَّ عَلَى خَيْرٍ فَلَهُ مِثْلُ أَجْرِ فَاعِلِهِ». (٢)

## حوکمی حەدیسی (مشهور)

لەوانەیە کەسێك وا گومان بیات کە ئەم جۆرە حەدیسە هەمیشە (صحیح)ە، چونکە وترا مەشهوورە، ئیتر زیاتر بیری مرۆڤ بۆ لای ئەوە دەچێت کە (صحیح) بێت، بەلاّم وا نیە ! چونکە وەك لە مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) و(حسن)دا ڕوونمان کردەوە، ژمارەی ئەو کەسانەی کە حەدیسەکە دەگێڕنەوە بە مەرج نەگیراوە، بەڵکو ئەوەی گرنگە تەنها سیفاتی ئەو کەسانەیە کە حەدیسەکە دەگێڕنەوە، ئایا عادل وضابطن یان نا، یان ئایا ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکە بچڕانی تێدایە یان نا؟ وە ئایا حەدیسەکە شاذ ومعلّل نیە؟ ئیتر ئێمە لێرەوە دەتوانین بڕیار بەسەر (صحیح)ی ونا(صحیح)ی ئەو حەدیسەدا بدەین، بۆیە دەگونجێت هەموو ئەو کەسانەی کە حەدیسەکەیان گێڕاوەتەوە عادل نەبن، یان هەر مەرجێکی تر نەهاتبێتەجێ، ئیتر ئەو حەدیسە ناتوانرێت پێی بوترێت (صحیح).

وە لەو نموونانەش کە هێنامانەوە لەسەر حەدیسی مەشهوور، بۆمان دەردەکەوێت کە، ئەم جۆرە حەدیسەش وەکو جۆرەکانی پێشووتر دەگونجێت کە حەدیسێکی (صحیح) بێت، یان (حسن) بێت، یان (ضعیف)، بگرە دەشگونجێت کە هەڵبەسراو بێت بە دەمی حەزرەتەوە.

---

(١) هەندێك دەڵێن: ئەمە وتەی ئیمامی عومەرە، هەندێکیش دەیدەنە پاڵ حەزرەت. زانایانیش فەرموویانە: ئەم حەدیسە هیچ ئەصڵی نیە. بڕوانە: الأسرار المرفوعة في الأخبار الموضوعة، لملا علي القاري / بە ژمارەی ٥٦٤، واللآلي المنثورة في الأحاديث المشهورة، الزركشي / ١٦٩، وكشف الخفاء، العجلوني / ٢ / ٢٨٩، حەدیسی ژمارە ٢٨٣٠، وتدريب الراوي / ٤٤٨.

(٢) البخاري في الأدب المفرد / المعروف / باب الدال على الخير / حەدیسی ژمارە ٢٤٢، ومسلم / الإمارة/ فضل إعانة الغازي في سبيل الله بمركوب وغيره، ورواه ابن حبان والترمذي وقال: هذا حديث حسن صحيح.

# جۆری یانزەیەم

## حەدیسی ( المُعَنْعَن )

واتە: حەدیسی (معنعن) وەکو ئەوە کە بوترێت: عن سعید عن کرم.

مامۆستای دانەر لە سەرەتای ئەم هۆنراوەیەدا بە دێڕێك خۆی بەستەوە بەوەوە کە ناوی هەر حەدیسێکی هێنابێت، هەستاوە بە پێناسە کردنیشی، وەك فەرمووبووی:

........................ وَكُــلُّ وَاحِــدٍ أَتَى وَحَــدَّهْ

بەلاَم وەکو دەبینین لێرەدا تەنها ناوی حەدیسەکەی هێناوە، ونموونەیەکیشی بۆ هێناوەتەوە، کەچی پێناسەی حەدیسەکەی نەکردووە، جا وەك بڵێیت: ئەو بەڵێنەی کە خستبوویە ئەستۆی خۆیەوە، ئێستا خۆی لێ لادەدا وجێبەجێی ناکات !

بۆ وەلاَمی ئەم گومانە دەکرێت بڵێین: یەکێك لە جۆرەکانی پێناسە کردن ئەوەیە کە بە نموونە هێنانەوەبێت، بەڵکو زۆر جار لەوانەیە کە کەسی سەرەتایی ئەوەندەی کە لە نموونە تێدەگات، کەمتر لە پێناسە تێبگات ! چونکە یەکێك لە تایبەتمەندیەکانی پێناسە ئەوەیە کە لە ڕووی ماناوە داگرەوە وڕێگر (جامع ومانع) بێت، وە لە ڕووی دارشتنیشەوە کورت وچڕ (مختصر) بێت، وبە کەمترین وشە ماناکەی بگەیەنێت، کە ئەمەش وا دەکات زۆر جار تێگەیشتن لەو پێناسەیە بۆ کەسی سەرەتایی کارێکی ئاسان نەبێت، بۆیە زۆر جار دەبینین کە زانایان لە پێناسە کردندا پەنا بۆ ئەم ئوسلووبە ئاسانە دەبەن، وتەنها بە نموونە هەوڵ دەدەن کە شتە پێناسەکراوەکە لە عەقڵ وتێگەیشتنی کەسی بەرامبەر نزیك بکەنەوە، بۆیە دەڵێین: مامۆستا بەڵێنەکەی خۆی هێناوەتە جێ، وپێناسەی حەدیسەکەی کردووە، بگرە بە شێوازێکی ئاسانتر لەوەی کە پێناسەی جۆرەکانی تری پێ کردبوو، کە پێویستیان بە زیادە ڕوونکردنەوە هەبوو، وەکو بینیمان. سەرەڕای ئەوەی کە کاری هۆندنەوەی هۆنراوە زۆر جار، ئەو بڕیار دەدات بەسەر کەسی هۆنەردا، کە چۆن وشەکان پێکەوە دەنێت وڕێکیان دەخات،

وله قالبی ئەو بەحرە شیعریەی کە هۆنراوەکەی لەسەر دادەنێت جێگەی وشەکان دەکاتەوە ومەبەستەکەی خۆشی پێ دەپێکێت.

ئەوجا ئەگەر بگەڕێینەوە سەر پێناسەکردن وناساندنی ئەم جۆرە حەدیسە، ئەوا دەبێت بزانین زانایان چۆنیان پێناسە کردووە.

زانایان فەرموویانە: بەو حەدیسە دەوترێت کە کەسێك دەیگێڕێتەوە، وە لە گێڕانەوەکەشیدا تەنها ئەوەندە دەڵێت: لە فلانە کەسەوە.......هتد، ئیتر نە باسی ئەوە دەکات کە حەدیسەکەی لەو کەسە بیستووە، یان ناڵێت: بۆی گێڕامەوە، یان هەواڵی پێدام.[1]

واتە کەسی ڕاوی تەنها ئەوەندە دەڵێت: عن فلان..، ئیتر ناڵێت: (حدثني) یان (أخبرني) یان (سمعت).

کەواتە هۆی ناونانی ئەم جۆرە حەدیسە بەم ناوەوە ڕوون وئاشکرایە، کە هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ڕاویەکە لە ڕیوایەتەکەدا وشەی (عن) یەك جار بەکار دەهێنێت، یان چەند بارەی دەکاتەوە، هەروەك چۆن حەدیسێکی تریشیان ناوناوە بە (مؤنّن) تەنها لەبەر ئەوەی کە ڕاویەکە لە گێڕانەوەی حەدیسەکەدا وشەی (أنّ) بەکار دەهێنێت.[2]

## ئایا حەدیسی (معنعن) بە (مُتَّصِل) دادەنرێت، یان بە (مُنْقَطِع)؟

وەکو لە پێناسەکەدا باسمان کرد، ئەو کەسەی کە ئەم جۆرە حەدیسە ڕیوایەت دەکات، تەنها ئەوەندە دەڵێت: لە فلانە کەسەوە، ئیتر ئاماژە بەوە نادات، ئایا بۆی گێڕاوەتەوە، یان خۆی لێی بیستووە. ئەمەش وای کردووە کە زانایان ناکۆك بن لەسەر بڕیاردان بەسەر ئەم حەدیسەدا، ئایا بە (متصل) دادەنرێت، یان بە (منقطع)،[3] کە بێ گومان ئەمەش شوێنەواری

(١) بڕوانە هەریەکە لە: شرح التبصرة والتذكرة /١/٢١٩، والشذا الفياح /١/١٦١، وفتح المغيث /١/١٧٩.

(٢) بڕوانە: الغاية في شرح الهداية / ١٧٤.

(٣) بڕوانە: شرح النووي على مسلم / ١ / ٣٢، وتدريب الراوي / ١٧٢، والمنهل الروي / ٤٨، وتوضيح الأفكار / ١ / ٢٩٩ – ٣٠٥، والمقنع في علوم الحديث / ١٤٨ – ١٤٩، وتوجيه النظر / ١ / ١٨٨ – ١٨٩.

تایبەتی لەسەر پەیدا دەبێت سەبارەت بە حوکمی ئەم جۆرە حەدیسە، کە ئایا دەگونجێت کە (صحیح) بێت، یان هەمیشە (ضعیف)ە؟ وەك لە باسی داهاتوودا ڕوونی دەکەینەوە.

- هەندێکی کەم فەرمووویانە: تاوەکو دەرنەکەوێت کە لێی بیستووە، یان هەواڵی پێداوە وبۆی گێڕاوەتەوە، ئێمە ناکرێت پێی بڵێین: (متصل)، بۆیە هەر بە (منقطع)ی دادەنێین.
- زۆرینەی زانایان فەرمووویانە: ئێمە تەماشا دەکەین، ئەگەر چەند مەرجێك هەن، هاتبنەجێ ئەوا بە (متصل)ی دادەنێین، ئەگینا بە (منقطع)، کە مەرجە سەرەکیەکانیش ئەمانەن:

١) دەبێت ئەو کەسەی کە وتوویەتی: (عن فلان)، (مدلّس) نەبێت، واتە لە گێڕانەوەی حەدیسەکەدا شێوازێك لە شێوازەکانی (تدلیس) بەکار نەهێنێت.

٢) دەبێت بگونجێت کە ئەو کەسەی کە وتوویەتی: (عن فلان)، گەیشتبێت بەو فلانّە کەسەی کە حەدیسەکەی لیّ گێڕاوەتەوە.

بەڵام هەندێك لە زانایان سەرەڕای ئەم دوو مەرجە سەرەکیە، مەرجی تریشیان داناوە، کە ئەوانیش:

- ئیمامی بوخاری وهەندێکی تر لە زانایان فەرمووویانە: دەبێت بە ڕاستی ئەو دوو کەسە بەیەکتر گەیشتبن، نەك تەنها بگونجێت کە بەیەك گەیشتبن.[1]

---

(١) لەم مەسەلەیەدا ئیمامی بوخاری وموسلیم ناکۆکن لەوەی کە ئایا تەنها گونجانی بەیەك گەیشتن مەرجە (واتە لە یەك سەردەم وکاتدا ژیابن)، وەکو ئیمامی موسلیم فەرموویەتی، یان دەبێت بەڕاستی بەیەك گەشتبن، وەکو ئیمامی بوخاری فەرموویەتی. جا زانای پایەبەرز (محمد بن عمر بن محمد بن عمر رشید الفهري) کە مەشهوورە بە (ابن رُشَیْد السَّبْتِي) کتێبێکی سەبارەت بەم ناکۆکیە نووسیوە وناوی ناوە: (السنن الأبین والمورد الأمعن في المحاکمة بین الإمامین في السن) کە بۆچوونەکەی ئیمامی بوخاری پیّ پەسەند ترە، وتەرجیحی ئەو بۆچوونەی داوە بەسەر بۆچوونەکەی ئیمامی موسلیمدا. ئەم کتێبە لەلایەن: (مکتبة الغرباء الأثریة - المدینة المنورة) بە چاپی یەکەم لە ساڵی ١٤١٧ی کۆچی بە یەك بەرگ بڵاّو کراوەتەوە، وە لەلایەن (صلاح بن سالم المصراتي)یەوە تەحقیق کراوە. هەروەها زانای ناودار (عبد الفتاح أبو غدة)ش لە باسی سێیەم لەو پێنج باسەی کە وەك تەواوکەرێك لە پاشکۆی کتێبی (الموقظة)ی ئیمامی (الذهبي)دا بڵاّوی کردوونەتەوە، زۆر بە وردی باسی بۆچوونەکەی ئیمامی موسلیمی کردووە، وڕەخنەی لیّ گرتووە. بڕوانە: الموقظة في علم مصطلح الحدیث / التتمة الثالثة / ١١٥ – ١٤٠.

- شێخ (مظفر)ی سەمعانی فەرمووبەتی: دەبێت ئەو دوو کەسە بۆ ماوەیەکی درێژ بەیەکەوە بووبن.
- ئەبو عومەری دانی فەرموویەتی: دەبێت ڕاویەکە بەوە ناسراوبێت کە حەدیسی لەو فلاٽە کەسەوە گێڕاوەتەوە.

## حوکمی حەدیسی ( معنعن )

وەکو لە باسەکەی پێشوودا ئاماژەمان پێدا، بڕیاردان بەسەر ئەم جۆرە حەدیسەدا کە ئایا (متّصل)ە یان (منقطع)ە، شوێنەوارێکی گرنگی لێ پەیدا دەبێت سەبارەت بە حوکمی ئەو حەدیسە، کە ئایا (صحیح)ە یان (صحیح) نیە؟ چونکە وەکو پێشتر ڕوونمان کردەوە، یەکێك لە مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) ئەوەیە کە ڕشتەی گێڕانەوەکەی بچڕانی تێدا نەبێت، بۆیە لێرەدا جارێکی تر دەگەڕێینەوە سەر ئەو مەرجە، و بە هۆی ئەویشەوە دەتوانین بڕیار بدەین بەسەر حەدیسی (معنعن)دا کە (صحیح)ە یان (صحیح) نیە.

جا ئەو کەسانەی کە دەڵێن: بە (منقطع) دادەنرێت، دەڵێن: هەموو حەدیسێکی (معنعن) (ضعیف)ە. بەلاّم ئەوانەی کە دەڵێن: بە (متّصل) دادەنرێت، بەو مەرجانەی کە لە پێشەوە باسمان کردن، دەڵێن: هەر حەدیسێکی (معنعن) ئەگەر بێجگە لە نەبچڕانی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکە، چوار مەرجەکەی تری حەدیسی (صحیح)ی تێدا هاتبووە جێ، ئەوا بە (صحیح) دادەنرێت، یان ئەگەر مەرجەکانی تری حەدیسی (حسن)ی تێدا هاتووە جێ ئەوا بە (حسن) دادەنرێت، ئەگینا هەرکام لەو مەرجانەی تێدا نەبوو، ئەوا بە (ضعیف) دادەنرێت.

نموونەی ئەم جۆرە حەدیسە لە کتێبە حەدیسیەکاندا زۆرە، وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی ئەبو داوود وئیبنو ماجە وکەسانی تریش بۆمان دەگێڕنەوە، ودەفەرموون: حَدَّثَنَا عُثْمَانُ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ حَدَّثَنَا مُعَاوِيَةُ بْنُ هِشَامٍ حَدَّثَنَا سُفْيَانُ عَنْ أُسَامَةَ بْنِ زَيْدٍ عَنْ عُثْمَانَ بْنِ

عُرْوَةَ عَنْ عُرْوَةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَت قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم-:« إِنَّ اللَّهَ وَمَلاَئِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلَى مَيَامِنِ الصُّفُوفِ »[1]

(١) أبو داود / الصلاة / باب من يستحب أن يلي الإمام في الصف وكراهية التأخر / به ژمارەی ٦٧٦، وابن ماجة / إقامة الصلاة والسنة فيها / باب فضل ميمنة الصف / به ژمارەی ١٠٠٥، وابن حبان / كتاب الصلاة / باب فرض متابعة الإمام / به ژمارەی ٢١٦٠.

# جۆری دوانزەیەم

## حەدیسی ( المُبْهَم )

واتە حەدیسی (مبهم) ئەو حەدیسەیە کە ناوی یەکێك لە ڕاویەکانی نەبرابێت، ودیاری نەکرابێت کە کێیە.

هەندێك جار ڕێك دەکەوێت کە ناوی کەسێك نابرێت لەو کەسانەی کە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێکدا هەن، بۆ نموونە دەوترێت: پیاوێك بۆی گێڕامەوە، یان گوێم لە پیاوێك بوو، یان کەسێك وتی، یان هەر تەعبیرێکی تر. ڕێکیش دەکەوێت کە کەسێك بە نادیاری لە دەقی حەدیسێکدا باس دەکرێت، وەکو ئەوەی کە بوترێت: پیاوێك هاتە خزمەتی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، یان عەرەبێکی دەشتەکی هاتە ژوورەوە، یان کەسێك پرسیاری کرد، یان هەر تەعبیرێکی تر، کە هەموو ئەم تەعبیرانە وهاوشێوەکانیان دەبن بەهۆی پەیدا بوونی نادیاریەك یان لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا، یان لە دەقی حەدیسەکەدا.

جا ئەوەی کە زۆر گرنگە لەم باسەدا ئەوەی یەکەمیانە، کە نادیاری لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا هەبێت، چونکە کاریگەری ڕاستەوخۆی دەبێت لەسە (صحیح)ی ونا(صحیح)ی حەدیسەکە، چونکە یەکێك لە مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) ئەوەیە کە ئەو کەسانەی کە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا هەن، دەبێت عادل وضابط بن، خۆ بێ گومان ئەگەر نەزانرێت ئەو کەسانە کێن، ناشزانرێت کە ئایا عادل وضابطن یان نا.

بۆیە دەبینین مامۆستای دانەریش کە باسی ئەم جۆرە حەدیسەی کردووە، بەوە پێناسەی کردوە: ئەو حەدیسەیە کە یەکێك لە ڕاویەکانی دیاری نەکرا بێت وناو نەبرابێت.

بەڵاّم ئەم باسەش نابێت هەروا بە ڕەهایی وەربگیرێت، کە گوایە دیارنەبوون ونەناسرانی یەکێك لە ڕاویەکانی حەدیسێك ببێت بە هۆی (ضعیف)ی ئەو حەدیسە، بۆیە زانایان فەرموویان: هەندێك نادیاری کاریگەیان دەبێت، وە هەندێکیشیان کاریگەریان نابێت.

- ئەو نادیاریەی کە کاریگەری دەبێت، وەکو ئەوەی کە کە کەسێك لە ڕشتەی ڕاویەکاندا ناو نەبرابێت، وئەو کەسەش تەنها کەس بێت کە لە ڕێگەیەوە ئەو حەدیسە ڕیوایەت کرابێت، وە کەسەکەش یەکێك نەبێت لە هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ ڕازی بێت). بۆ نموونە ئەگەر وترا: حدثني رجل عن زيد عن عمر عن خالد.
- ئەو نادیاریەش کە کاریگەری نابێت، وەکو ئەوەی کە کەسە نادیارەکە تاکە کەس نەبێت لە گێڕانەوەی حەدیسەکەدا، بۆ نموونە ئەگەر بوترێت: حدثني زيد ورجل آخر. یان ئەو کەسەی کە ناوی نەبراوە یەکێکە لە هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ ڕازی بێت)، زانایان فەرموویانە: نادیاری وناونەبرانی هاوەڵی حەزرەت لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسدا کاریگەری لەسەر (صحیح)ی حەدیسەکە ناکات، چونکە هاوەڵان هەموویان عادلن.

## هۆیەکانی ناو نەبردنی کەسێك لە ڕشتەی ڕاویەکانی حەدیسدا

ناونەبردنی کەسێك لە ڕاویەکانی حەدیس دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆکارێك، لەوانە[1]:

- دەگونجێت تەنها لەبەر کورت کردنەوە بێت.
- دەگونجێت ئەو کەسە ناوەکەی لەبیر چووبێت.
- دەگونجێت گومانی هەبێت لە ناسینیدا، وبۆی دەستنیشان نەکرێت.
- دەگونجێت لێی ڕازی نەبێت، بۆیە نایەوێت ناوی بهێنێت.
- دەگونجێت زانایانی حەدیس لێی ڕازی نەبن، بۆیە ئەمیش ناوی ناهێنێت.
- دەگونجێت لەبەر هەر هۆیەك لە هۆیەکانی تەدلیس بیەوێت بیشارێتەوە وناوی نەهێنێت.

(١) بڕوانە: لسان المحدثين (مُعجم مصطلحات المحدثين): محمد خلف سلامة / ٢ / ٦٠.

# کەسێك ناو نەبرێت، بەلاّم بوترێت: کەسێکی متمانەدارە

## (التعديل على الإبهام)

وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان پێدا، ناونەبردنی کەسێك لە رشتەی گێرانەوەی حەدیسێکدا کاریگەری دەبێت لەسەر (صحيح)ی ونا(صحيح)ی ئەو حەدیسە، چونکە ئەگەر ناو نەبرێت، چۆن بزانرێت کە عادل وضابطە یان نا؟

بەلاّم هەندێك جار لەگەلّ ئەوەی کە ناوی کەسەکە نەبراوە، بەلاّم وتراوە: (أخبرنا بعض أصحابنا)، (أخبرنا بعض أهل العلم)، (أخبرنا الثقة)، (أخبرنا الثقة من أصحابنا)، (أخبرنا الثقة من أهل العلم)، یان هەر عیبارەتێکی تر کە وای لیّ وەربگیرێت ئەو کەسە نادیارە جێگەی متمانەیە، بەتایبەتی لە موسنەدی ئیمامی شافعیدا ئەم عیبارەتانە زۆر دەبینرێن، ئایا ئەو حەدیسەی کە بەم جۆرە ریوایەت کراوە، پێی وەردەگیرێت، یان نا؟

زانایان لە وەلاّمی ئەم پرسیارەدا بوون بە سیّ بەشەوە[1]:

١) هەندێکیان فەرموویانە: بەلیّ پێی وەردەگیرێت، ووەکو ئەوە وەهایە کە ناوی کەسەکە هێنرابێت.

٢) زۆربەی زانایان فەرموویانە: نەخێر پێی وەرناگیرێت، چونکە هەر جۆرە وەسفێك بکرێت، نابێتە مایەی ئەوەی کە کەسەکە بەدیار بخات ولە نادیاری دەری بهێنێت. سەرەرای ئەوەی کە دەکرێت ئەو کەسە بەلای ئەوەوە جێگەی متمانە بێت، بەلاّم بەلای کەسانی ترەوە وەها نەبێت.

---

(١) بروانه: شرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣٤٦ - ٣٤٨، والشذا الفياح / ١ / ٢٤٤ — ٢٤٥، واليواقيت والدرر / ١ / ٤٨٩ — ٤٩٠، وجرح الرواة وتعديلهم . الأسس والضوابط / رسالة دكتوراه / إعداد محمود عيدان أحمد الدليمي / بإشراف الدكتور زياد محمود رشيد العاني / جامعة بغداد . كلية العلوم الاسلامية / الفصل الثالث: المحاور التي يدور عليها الجرح والتعديل / ٨٣ وما بعدها، ومنهج النقد في علوم الحديث، نور الدين عتر / ١٠٤.

٣) هەندێکیش جیاوازیان کردووە لە نێوان دوو حاڵەتدا، وفەرموویانە: ئەگەر ئەو کەسەی کە وەسفی ڕاویەکەی کردوە بەوەی کە متمانەدارە، یەکێك بوو لەو ئیمامانەی کە زۆر بە پارێزەوە پشکنین دەکەن وورد دەبنەوە لە کەسایەتی ڕاویەکان، وتەنها لە کەسی متمانەدارەوە حەدیس دەگێڕنەوە، ئەوا بە قسەکەی وەردەگیرێت، ئەگینا ئەگەر کەمتەرخەمی دەکرد، و لە کەسانی لاوازیشەوە حەدیسی دەگێڕایەوە، ئەوا پێی وەرناگیرێت.

## چۆن بزانین کەسە ناونەبراوەکە کێیە؟

زانایان[١] باسی چەند ڕێگەیەکیان کردووە، کە دەکرێت لێیانەوە بزانرێت کەسە ناونەبراوەکەی حەدیسی (مبهم) کێیە، کە بریتین لە:

١) لە هەندێك ڕیوایەتدا ناوی هاتووە، واتە ئەو کەسەی کە ناوی نەبراوە لەو ڕیوایەتەدا، دەگەڕێین بە شوێنیدا لە ڕیوایەتێکی تردا، ئیتر ئایا لە هەمان ئەو سەرچاوەدا بێت کە حەدیسەکەی لێوە هێنراوە، یان لە سەرچاوەیەکی تر.

ئیمامی موسلیم حەدیسێکمان بۆ دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە کە فەرموویەتی: أَتَى النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- رَجُلٌ أَعْمَى فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنَّهُ لَيْسَ لِى قَائِدٌ يَقُودُنِى إِلَى الْمَسْجِدِ. فَسَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- أَنْ يُرَخِّصَ لَهُ فَيُصَلِّىَ فِى بَيْتِهِ فَرَخَّصَ لَهُ فَلَمَّا وَلَّى دَعَاهُ فَقَالَ « هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ بِالصَّلاَةِ ». فَقَالَ نَعَمْ. قَالَ « فَأَجِبْ ».[٢]

ئەوجا هەر ئەم حەدیسە ئیمامی ئەبو داوود وئیبنو ماجە بۆمان دەگێڕنەوە لە عەبدوڵای کوڕی ئوم مەکتومەوە، کە ئەو بووە پرسیاری کردوە لە حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت). عَنِ

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٢٨، والشذا الفياح / ٢ / ٧٦٠، وتدريب الراوي / ٦٢١، والمنهل الروي / ١٣٦، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٢٨٨.

(٢) مسلم / المساجد / باب يجب إتيان المسجد على من سمع النداء / بە ژمارەی ١٥١٨.

ابْنِ أُمِّ مَكْتُومٍ أَنَّهُ سَأَلَ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ إِنِّي رَجُلٌ ضَرِيرُ الْبَصَرِ شَاسِعُ الدَّارِ وَلِي قَائِدٌ لاَ يُلاَئِمُنِي فَهَلْ لِي رُخْصَةٌ أَنْ أُصَلِّيَ فِي بَيْتِي قَالَ « هَلْ تَسْمَعُ النِّدَاءَ ». قَالَ نَعَمْ. قَالَ « لاَ أَجِدُ لَكَ رُخْصَةً ».(١)

کەواتە ئەو کەسە ناونەبراوەی حەدیسەکەی ئیمامی موسلیم بریتیە لە عەبدولای کوڕی ئوم مەکتوم.

ئیمامی نەسانی دەفەرموێت: أَخْبَرَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ عَلِيٍّ قَالَ حَدَّثَنَا سُرَيْجُ بْنُ يُونُسَ قَالَ حَدَّثَنَا هُشَيْمٌ عَنِ ابْنِ شُبْرُمَةَ قَالَ حَدَّثَنِي الثِّقَةُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ بِعَيْنِهَا قَلِيلُهَا وَكَثِيرُهَا وَالسُّكْرُ مِنْ كُلِّ شَرَابٍ.(٢)

پاشان لە ڕیوایەتی دواتردا ڕوونی دەکاتەوە ودەفەرموێت: أَخْبَرَنَا أَحْمَدُ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الْحَكَمِ قَالَ حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ ح وَأَنْبَأَنَا الْحُسَيْنُ بْنُ مَنْصُورٍ قَالَ حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ حَنْبَلٍ قَالَ حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ جَعْفَرٍ قَالَ حَدَّثَنَا شُعْبَةُ عَنْ مِسْعَرٍ عَنْ أَبِي عَوْنٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ شَدَّادٍ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ حُرِّمَتِ الْخَمْرُ بِعَيْنِهَا قَلِيلُهَا وَكَثِيرُهَا وَالسُّكْرُ مِنْ كُلِّ شَرَابٍ.

ئێستە لەم دوو ڕیوایەتەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو کەسە متمانەدارەی کە لە حەدیسی یەکەمدا هاتووە، بریتیە لە (أبي عون) وەکو لە حەدیسەکەی دووەمدا هاتووە.

هەروەها ئیمامی بەیهەقی دەفەرموێت: أَخْبَرَنَا أَبُو سَعِيدِ بْنُ أَبِي عَمْرٍو حَدَّثَنَا أَبُو الْعَبَّاسِ الأَصَمُّ حَدَّثَنَا بَحْرُ بْنُ نَصْرٍ حَدَّثَنَا ابْنُ وَهْبٍ أَخْبَرَنِي ابْنُ أَبِي الزِّنَادِ عَنْ أَبِيهِ قَالَ حَدَّثَنِي الثِّقَةُ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ أَنَّهُ قَالَ: لاَ تَحْمِلُ الْعَاقِلَةُ عَمْدًا وَلاَ صُلْحًا وَلاَ اعْتِرَافًا وَلاَ مَا جَنَى الْمَمْلُوكُ.(٣)

بەلآم پێش ئەم ڕیوایەتە ڕیوایەتێکی تری هێناوە، کە دەفەرموێت: قَالَ أَبُو عُبَيْدٍ قَدِ اخْتَلَفُوا فِي تَأْوِيلِ قَوْلِهِ وَلاَ عَبْدًا فَقَالَ لِي مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَنِ إِنَّمَا مَعْنَاهُ أَنْ يَقْتُلَ الْعَبْدُ حُرًّا يَقُولُ

(١) أبو داود / الصلاة / باب في التشديد في ترك الجماعة / بە ژمارەی ٥٥٢، وابن ماجة / كتاب المساجد والجماعات / باب التغليظ في التخلف عن الجماعة / بە ژمارەی ٧٩٢.

(٢) النسائي / كتاب الأشربة / ذكر الأخبار التي اعتل بها من أباح شراب السكر / بە ژمارەی ٥٦٨٤.

(٣) السنن الكبرى / كتاب الديات / باب من قال لا تحمل العاقلة / بە ژمارەی ١٦٧٩٨.

فَلَيْسَ عَلَى عَاقِلَةِ مَوْلاَهُ شَيْءٌ مِنْ جِنَايَةِ عَبْدِهِ وَإِنَّمَا جِنَايَتُهُ فِي رَقَبَتِهِ وَاحْتَجَّ فِي ذَلِكَ بِشَيْءٍ رَوَاهُ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ الْحَسَنِ حَدَّثَنِي عَبْدُ الرَّحْمَنِ بْنُ أَبِي الزِّنَادِ عَنْ أَبِيهِ عَنْ عُبَيْدِ اللَّهِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ: لاَ تَعْقِلُ الْعَاقِلَةُ عَمْدًا وَلاَ صُلْحًا وَلاَ اعْتِرَافًا وَلاَ مَا جَنَى الْمَمْلُوكُ.

لەم دوو ڕیوایەتەوە دەردەکەوێت کە کەسە متمانەدارەکەی ڕیوایەتی یەکەم، بریتیە لە (عبيد الله بن عبد الله)، کە لە ڕیوایەتی دووەمدا ناوەکەی هاتووە.

٢) گەڕانەوە بۆ ئەو کتێبانەی کە لە سیرەدا نووسراون، بەتایبەتی ئەو بەشەیان کە باسی کەسە ناونەبراو ونەناسراوەکان دەکات، بۆ ئەوەی بزانین لەوێ ناوی ئەو کەسە براوە یان نا، ئەگەرچی لەوانەیە زۆرینەی ئەو کەسانە لەو کتێبانەدا ناویان نەبرابێت.[١]

٣) گەڕانەوە بۆ ئەو کتێبانەی کە سەبارەت بەو کەسە ناونەبراوانەی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیس دانراون.[٢]

---

(١) نموونەی ئەم کتێبانە وەکو:

- (تهذيب الكمال في أسماء الرجال) للحافظ جمال الدين أبي الحجاج يوسف المزي.
- (تهذيب التهذيب) لابن حجر العسقلاني. کە پوختەی ئەو کتێبەی پێشووە.
- (تقريب التهذيب) لابن حجر العسقلاني. کە کورتەی کتێبەکەی خۆیەتی.
- ( تعجيل المنفعة بزوائد رجال الأئمة الأربعة ) لابن حجر العسقلاني.
- (الإيثار بمعرفة رواة الأثارلمحمد بن حسن الشياني عن أبي حنيفة) لابن حجر العسقلاني.
- ( زوائد الرجال على تهذيب الكمال ) للسيوطي.
- ( إكمال تهذيب الكمال في أسماء الرجال ) لابن الملقن.

(٢) نموونەی ئەم کتێبانەش وەکو:

- ( الأسماء المبهمة في الأنباء المحكمة ) للخطيب البغدادي.
- ( إيضاح الإشكال في من أبهم اسمه من النساء والرجال ) للحافظ أبو الفضل بن طاهر.
- ( الغوامض والمبهات ) لابن بشكوال.
- ( الإشارات إلي بيان الأسماء المبهمات ) للإمام النووي.
- ( الإفصاح عن المعجم من الغامض و المبهم ) للحافظ أبو بكر محمد بن أحمد بن علي المصري القسطلأني.
- ( لمستفاد من مبهمات المتن والإسناد ) للشيخ ولي الدين أبو زرعه أحمد بن عبد الرحيم العراقي.

وَ كُلُّ ما قَلَّتْ رِجَالُهُ عَلاَ		وَ ضِدُّهُ ذَاكَ الَّذِي قَدْ نَزَلاَ

# جۆری سیانزەیەم وچواردەیەم

# حەدیسی (العالِي والنازِل)

واتە: هەر حەدیسێك کە ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا هەن کەم بێت، ئەوە حەدیسی (عالِي)ە. وە پێچەوانەکەشی پێی دەوترێت: (نازل).

سەرەتا بوونی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیس وفەرموودە یەکێکە لە تایبەتمەندیەکانی ئەم ئوممەتی ئیسلامە، ولە هیچ نەتەوە وئاینێکی پێشتردا بوونی نەبووە، کە ئەمەش بۆ ئێمە بووە بە بەشێك لە ئاینەکەمان، ودەبێت زۆر هەوڵ بدرێت لەسەر پاراستن وناگالێبوونی. خوای گەورە پاداشتی زانایانی پێشینەی ئیسلام بداتەوە کە هەموو فەرموودە وحەدیسەکانیان لە ڕێگەی ڕشتەی پاك وخاوێنەوە بە ئێمە گەیاندووە، کە ئێمە ئێستا لە خزمەتیاندایین، وبە ئاسانی دەزانین کە کامە حەدیسی حەزرەتە (درووودی خودای لەسەر بێت)، وکامە وتە وفەرمایشتی هاوەڵانە وکامە فەرمایشتی موجتەهید وزانایانە.

ئەو خواناسانەی پێشینە زۆر هەوڵیان داوە وگەڕاون وماندوو بوون بەشوێن دۆزینەوەی فەرموودەکانی حەزرەت وهاوەڵاندا، خۆ ئەگەر هەوڵ وکۆششی ئەوان نەبووایە، ئێستە هەرکەس هەرچی بویستایە دەیوت ووتبووی.

هەر بۆیە ئەو خواناسە پایەبەرزانە زۆر مەبەستیان بووە کە بگەڕێن بە شوێن حەدیسێکدا کە بە کەمترین ژمارەی کەسەکانی ڕشتەی ڕیوایەت بگاتەوە بە خاوەنەکەی، کە بێ گومان ئەمەش بێ حیکمەت نەبووە، بەڵکو گرنگ ترین پاڵنەر بۆ ئەو کارە ئەوە بووە کە هەتاوەکو ژمارەی کەسەکان کەمتر بێت، ئەگەری درووست بوونی تێبینی لەسەر ڕشتەکە کەمتر دەبێت، وە بە پێچەوانەشەوە تاوەکو ژمارەی کەسەکان زیاتر بێت، ئەگەری درووست بوونی تێبینی وپرسیار لەسەریان زۆر دەبێت. بۆ نموونە ئەگەر تەنها سێ کەس لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێکدا ناویان هاتبێت، ئەوا ئێمە تەنها بە شوێن پرسیارکردندا دەگەڕێین

سه‌باره‌ت به‌و سێ كه‌سه‌، به‌ڵام ئه‌گه‌ر بوون به‌ چوار یان زیاتر، ئه‌وا ده‌بێت پرسیاره‌كان زیاتر بن، كه‌ ئه‌مه‌ش كاریگه‌ریه‌كی ناڕاسته‌وخۆی ده‌بێت له‌سه‌ر (صحیح)ی ونا(صحیح)ی ئه‌و حه‌دیسه‌.

ئیمامی ئه‌حمه‌د فه‌رموویه‌تی: "طلبُ الإسنادِ العالي سُنَّةٌ عمَّنْ سلفَ". واته‌: گه‌ڕان به‌شوێن ڕشته‌ی (عالي)دا له‌ كار وكرده‌وه‌ی پێشینه‌كانه‌.

هه‌روه‌ها پرسیاریان كردووه‌ له‌ یه‌حیای كوڕی موعین له‌ كاتی سه‌ره‌مه‌رگیدا: ئایا ئاره‌زووی چی ده‌كه‌یت؟ ئه‌ویش فه‌رمووی: "بَيْتٌ خَالٍ، وَإِسْنَادُ عَالٍ"(١)

ئه‌وه‌ی كه‌ مامۆستای دانه‌ر له‌م دێڕه‌ هۆنراوه‌یه‌دا ئاماژه‌ی پێداوه‌، ته‌نها ئه‌وه‌نده‌یه‌ كه‌ ئه‌گه‌ر ژماره‌ی ڕاویه‌كان كه‌متر بن، ئه‌وا به‌ نیسبه‌ت بۆ ئه‌وه‌ی كه‌ ژماره‌ی ڕاویه‌كان زۆر ترن، پێی ده‌وترێت: عالي وئه‌وی تریان پێی ده‌وترێت: نازل. ئیتر دیار نیه‌ ئایا ژماره‌ی ڕاویه‌كان كه‌متر بن تاوه‌كو ده‌گاته‌ حه‌زره‌ت (درودی خودای له‌سه‌ر بێت)، یان كه‌متربن، چۆن؟ پێوه‌ری كه‌می وزۆری لێره‌دا ده‌بێت چی بێت؟ یان ئایا ته‌نها یه‌ك جۆر عالی ونازلمان هه‌یه‌، یان زیاتر؟

جا له‌به‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ وشه‌ی عالی ونازل دوو وشه‌ن به‌ نیسبه‌ت یه‌كتری ماناكه‌یان ده‌رده‌كه‌وێت، چونكه‌ تاوه‌كو شتێك نه‌بێت پێی بوترێت: عالی، ناكرێت به‌ شتێكی تر بوترێت: نازل، هه‌روه‌ها به‌ پێچه‌وانه‌شه‌وه‌، ئه‌گه‌ر شتێك نه‌بێت پێی بوترێت: نازل، ئه‌وا به‌ شتێكی تر ناوترێت عالی.

ئێمه‌ش بۆ ڕوون كردنه‌وه‌ی مانای عالی ونازل فه‌رمایشتی زانایان ده‌هێنین له‌م باره‌وه‌ كه‌ فه‌رموویانه‌:

- عالی هه‌ندێك جار له‌ ڕووی كه‌می ژماره‌ی كه‌سه‌كانی ڕشته‌ی گێڕانه‌وه‌ی حه‌دیسێكه‌وه‌ دیاری ده‌كرێت كه‌ كام ڕیوایه‌ت عالیه‌ وكامه‌ش نازله‌. واته‌: هه‌تاوه‌كو ژماره‌ی ڕاویه‌كانی حه‌دیسێك كه‌متر بێت، ئه‌وا ئه‌و حه‌دیسه‌ به‌ عالی داده‌نرێت، به‌ نیسبه‌ت هه‌مان حه‌دیس كه‌

(١) بڕوانه‌: مقدمة ابن الصلاح / ١٥٠.

لە ڕێگەیەکی ترەوە ڕیوایەت کراوە وژمارەی ڕاویەکان تێیدا زیاترە. بۆ نموونە: ئەگەر لە گێڕانەوەی حەدیسێکدا وترا: عن مالك عن نافع عن ابن عمر. بەلاَم لە ڕێگەیەکی ترەوە لە ڕیوایەتی هەمان حەدیسدا وترا: عن الشافعي عن مالك عن نافع عن ابن عمر. ئەوا یەکەم ڕیوایەت عالیە ودوەمیان نازلە. ئەوەی کە مامۆستای دانەر ئاماژەی پێداوە ئەم جۆرە عالی ونازلەیە.

● هەندێك جار لە ڕووی بەهێزی سیفاتی ڕاویەکانەوە لە ڕووی عەدالەت وزەبتەوە دیاری دەکرێت کە کام ڕیوایەت عالیە وکامەش نازلە. واتە: لەم حاڵەتەدا تەماشای ژمارەی ڕاویەکان ناکەین، بەڵکو تەماشای سیفاتی ڕاویەکان دەکەین، جا ئەگەر سیفاتی ڕاویەکانی ڕشتەی حەدیسێك لە سیفاتی ڕاویەکانی ڕشتەی هەمان حەدیس —بەلاَم لە ڕێگەیەکی ترەوە— بەرز تر بێت، ئەوا بەوەی یەکەم دەوترێت عالی وبەوەی تریش دەوترێت نازل، ئیتر بێ ئەوەی کە تەماشای ژمارەی ئەو کەسانە بکرێت لە دوو ڕشتەکەدا حەدیسەکەیان ڕیوایەت کردووە، کامیان زۆرترە وکامیان کەمترە. ئەم جۆرە عالی ونازلە زیاتر گرنگی بۆ کاتی کارپێکردن وبەبەڵگە هێنانەوە وپێوەرگرتنی حەدیسەکە ڕەچاو دەکرێت، چونکە بێ گومان تاوەکو کەسەکان لە ڕووی عەدالەت وزەبتەوە بەهێز تربن، ئەوا حەدیسەکە لەو ڕێگەیەوە بەهێزتر دەبێت، وباشتر بەکار دەهێنرێت بۆ کارپێکردن. بۆیە لەم جۆرەیاندا دەکرێت کە حەدیسێك بە ڕشتەیەکی سێ کەسی ڕیوایەت کرابێت، نازل بێت بە نیسبەت هەمان حەدیس کە لە ڕشتەیەکی چوار کەسیەوە ڕیوایەت کرابێت، ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی کە کەسانی ڕشتەی دووەم لە ڕووی عەدالەت وزەبتەوە لە کەسانی ڕشتەی یەکەم بەهێزترن. (١)

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٥٤، وفتح المغيث / ٣ / ٢٥ – ٢٦، والغاية في شرح الهداية / ٧٦، وشرح الزرقاني على البيقوني / ١٣٨ – ١٣٩. بۆیە یەکێك لە زانایان لەم بارەیەوە فەرموویەتی:

لَيسَ حُسْنُ الْحَدِيْثِ قُرْبَ رِجَالٍ	عِنْدَ أَرْبَـابِ عِلْمِهِ النُّقَّـادِ
بلْ عُلُوُّ الْحَـدِيْثِ بينَ أُولي الـ	حِفْظِ والإتقانِ صِحَّةُ الإِسْنَادِ

پاشان زانایان بە شێوەیەکی گشتی حەدیسی عالی ونازلیان بە گوێرەی زۆری وکەمی ژمارەی کەسەکان، دابەش کردووە بۆ پێنج بەشی سەرەکی، کە ئەوانیش:

١) بەپێی نزیکی ودووری لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێت)، کە پێیان دەوترێت: (العلو المطلق) و(النزول المطلق)، ئەمەش بە کەمی وزۆری ژمارەی کەسەکانی زنجیرەی گێڕانەوەی حەدیسەکە دەبێت، لە حەزرەتەوە تاوەکو دەگاتە دوایین ڕاوی.

٢) بەپێی نزیکی ودووری لە یەکێك لە پێشەوایانی فەرموودەوە، کە زۆر بەناوبانگن. وەکو: ابن جريج والزهري والأوزاعي ومالك وشعبة والشافعي وهاووێنەی ئەمان، ئیتر بەبێ ڕەچاو کردنی ژمارەی ئەو کەسانەی کە لە نێوان ئەو ئیمامانەو حەزرەتدان.

٣) بەپێی نزیکی ودووری لە یەکێك لە کتێبە جێباوەڕەکانی حەدیسی حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، وەکو هەردوو صەحیحی بوخاری وموسلیم وسونەنەکان وموسنەدی ئیمامی ئەحمەد، کە ئەمەیان زانایان پێی دەڵێن: علو التنزيل.[1]

٤) نزیکی ودوورییەك بە گوێرەی لەپێشی کاتی مردنی یەکێك لە ڕاویەکان لەوی تریان. بۆ نموونە ئەگەر دوو کەس لە یەك مامۆستا حەدیسێك ڕیوایەت بکەن، ئەوا کام لەو دوو کەسە لە پێشدا

(١) زانایان ئەم جۆرەیان دابەش کردووە بۆ چوار جۆری تر، کە ئەوانیش:

- الموافقة: کە بریتیە لە گەیشتن بە یەکێك لە مامۆستاکانی ئەو کەسەی کە کتێبەکەی داناوە (وەکو ئیمامی بوخاری بۆ نموونە)، بەلاّم نەك لە ڕێگەی ئەوەوە، بەلکو لە ڕێگەیەکی ترەوە وبە ژمارەیەکی کەمتر.
- البدل: کە بریتیە لە گەیشتن بە یەکێك لە مامۆستای مامۆستاکانی ئەو کەسەی کە کتێبەکەی داناوە، لە ڕێگەیەکی ترەوە وبە ژمارەیەکی کەمتر.
- المساواة: واتە: یەکسانی ژمارەی کەسەکانی زنجیرەی ئەو کەسەی کە حەدیسەکە ڕیوایەت دەکات، لەگەڵ ئەو ئیمامەی کە کتێبەکەی داناوە.
- المصافحة: واتە: یەکسانی ژمارەی کەسەکانی زنجیرەی ڕاویەکە، لەگەڵ ژمارەی کەسەکانی زنجیرەی یەکێك لە قوتابیەکانی ئەو ئیمامەی کە کتێبەکەی داناوە.

جا بۆ زیاتر تێگەیشتن لەمانای هەریەکە لەم چوار جۆرە بە نموونەوە، بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح /١٥٠-١٥٣، والشذا الفياح /٢/٤٢٤-٤٢٨، ونزهة النظر /١٤٨-١٤٩، وشرح شرح نخبة الفكر /٦٢٢-٦٢٩، وشرح التبصرة والتذكرة /٢/٦٣-٦٧، وتدريب الراوي / ٤٣٨-٤٤٠، واليواقيت والدرر /٢/٢٤٠-٢٤٧، والغاية في شرح الهداية /٧٣-٧٤، وشرح الزرقاني على البيقوني مع حاشية الأجهوري /١٣١-١٣٣.

مردبوو، ئەوەیان بە عالی دادەنرێت، و ئەوی تریان بە نازل. ئیمامی نەواوی فەرموویەتی: هەر حەدیسێك بە ڕشتەیەكی سێ كەسی لە ئیمامی بەیهەقیەوە بیگێڕمەوە، وئەویش لە ئیمامی حاكمەوە، بەرز ترە لەو حەدیسەی كە بە ڕشتەیەكی سێ كەسی لە ئەبو بەكری كوڕی خەلەفەوە، ئەویش لە حاكمەوە گێڕابێتیەوە، چونكە بەیهەقی بەر لە ئەبوبەكر كۆچی دوایی كردووە.[1]

٥) نزیكی ودووری لەڕووی لەپێشی كاتی بیستن. بۆ نموونە ئەگەر دوو كەس لە یەك مامۆستا حەدیسێك ڕیوایەت بكەن، ئەوا كامیان زووتر لە مامۆستاكەی بیستبوو، ئەوەیان بە عالی دادەنرێت وئەوی تریان بە نازل. ئیمامی سیوطي فەرموویەتی: زیاتر ئەمە لە كاتێكدا دەبێت كە كەسی دووەم لە كاتی پیری وبەساڵاچوونی مامۆستاكەدا حەدیسەكەی لێ بیستبێت، ئەگینا دەگونجێت كە ڕیوایەتی كەسی دووەم بەهێز تر بێت، بەتایبەتی كاتێك كە مامۆستاكە لەو قوناغەی گێڕانەوەی حەدیسەكە بۆ كەسی دووەم زەبتی تەواوتر بێت وەك لەكاتی گێڕانەوەی بۆ كەسی یەكەم.[2] بەڵام ئەم جۆرە عالیە ئەوەیە كە بە گوێرەی سیفەتە، وەكو لە پێشەوە ڕوونمان كردەوە.

## حوكمی حەدیسی (عالی)

بە لێكدانەوەیەكی سەرەتاییانە وەها بە بیردا دێت، كە حەدیسی عالی لە حەدیسی نازل لەپێش ترە لەڕووی پێوەرگرتن وكارپێكردنەوە، چونكە بە كەمترین ژمارەی كەسەكان دەگاتەوە بە خاوەنی حەدیسەكە، وە تاوەكو ژمارەی كەسەكانیش كەمتر بن، ئەگەری درووست بوونی خەلەل وپرسیار وتێبینی لەسەر ڕشتەكە كەمتر دەبێت، كەواتە دەبێت زیاتر حەدیسی عالی لەپێشتر بێت. بەڵام هەموو كاتێك وانیە !

چونكە وەكو لە لێكدانەوەی مانای عالی ونازلدا ڕوونمان كردەوە، بەتایبەتی لە مانای عالی ونازل بەپێی سیفاتی ئەو كەسانەی كە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەكەدا هەن، ئایا لە ڕووی عەدالەت وزەبتەوە كەسەكانی كام ڕشتەیان لە كەسەكانی ئەوی تریان بەهێز ترن؟

هەر بۆیە وتمان: دەكرێت حەدیسێك عالی بێت بەپێی كەمی ژمارەی كەسەكانی ڕشتەی گێڕانەوەكەی، بەڵام نازل بێت، چونكە ڕاویەكانی لە ڕووی عەدالەت وزەبتەوە بێ هێزترن.

---

(١) بڕوانە: التقريب بشرح تدريب الراوي / ٤٤٠.

(٢) بڕوانە: تدريب الراوي: ٤٤١.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە مەرج نیە هەموو حەدیسێکی عالی لەڕووی کارپێکردن وپێوەرگرتنەوە لە پێش حەدیسی نازلەوە بێت،[1] چونکە تەوەرەی سەرەکی کارپێکردن وپێوەرگرتنی حەدیس بریتیە لە بوونی مەرجەکانی حەدیسی (صحيح) و(حسن) لەو حەدیسەدا، خۆ ئەگەر مەرجەکان هاتبوونەجێ ئەوا کار بە حەدیسەکەش دەکرێت، ئەگینا کاری پێ ناکرێت ورەد دەکرێتەوە.

کەواتە دەتوانین بڵێین: حەدیسی عالی ونازل وەکو حەدیسەکانی پێشووتر دەکرێت (صحيح) بن، وە دەشکرێت (حسن) بن، وە دەشکرێت (ضعيف) بن.

---

(١) عەبدوڵای کوڕی موبارەك فەرموویەتی: لیسَ جَوْدةُ الحديثِ قربَ الإسنادِ بلْ جَوْدةُ الحديثِ صحةُ الرجالِ. وە زانای پایەبەرز (الحافظ أبو طاهر السِّلَفِيّ الأصبهاني) فەرموویەتی: الأصلُ الأخذُ عن العلماءِ فنزولُهم أَوْلَى من العُلُوِّ عن الجهلةِ على مذهبِ المحقِّقِينَ من النَقَلَةِ، والنازلُ حينئذٍ هو العالي في المعنى عندَ النظرِ والتحقيقِ. بڕوانە: الشذا الفياح / ٢ / ٤٣٣، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٧١، وشرح شرح نخبة الفكر / ٦٣١.

وَمَا أَضَفْتَهُ إِلَى الأَصْحَابِ مِنْ　　　قَوْلٍ وَفِعْلٍ فَهْوَ مَوْقُوفٌ زُكِنْ

# جۆری پانزەیەم

## حەدیسی (الْمَوْقُوف)

واتە: هەر وتە وکرداریك بیدەیتە پاڵ هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ رازی بێت)، ئەوە حەدیسی (موقوف)ە، کە بەلای فەرموودەناسانەوە ناسراوە.

ئەمە جۆری سێیەمی حەدیسە بە گوێرەی دانەپاڵی بۆلای خاوەنەکەی، دوو جۆرەکەی تری بریتی بوون لە: مرفوع ومقطوع، کە لە جێگەی خۆیدا بە درێژی باسمان لێوە کردن، وە وتیشمان: جۆری سێیەم پێی دەوترێت: موقوف، ولە جێگەی خۆیدا رِوونی دەکەینەوە.

جا هەروەکو لە پێناسەکەوە دەردەکەوێت، حەدیسی (موقوف) دوو جۆرە:

١) (موقوف)ی قەولی: وەکو ئەوەی کە بوترێت: ئیمامی ئەبو بەکر یان عومەر یان عوثمان یان عەلی یان هەر یەکێکی تر لە هاوەڵان، وەهای فەرموو.

٢) (موقوف)ی فیعلی: وەکو ئەوەی کە بوترێت: یەکێك لە هاوەڵان وەهای کرد.

نموونەی ئەم جۆرە حەدیسە لەو کتێبانەدا زۆرن کە پێیان دەوترێت: (مصنّف)، وەکو (مصنّف عبد الرزاق، ومصنّف ابن أبي شيبة).

(عبد الرزاق) دەفەرموێت: عَنْ يَحْيَى بنُ أَبِي كَثِيرٍ، عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْبَيْلَمَانِيِّ، قَالَ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ فِيمَا يُوصِي بِهِ عُمَرَ: مَنْ أَدَّى الزَّكَاةَ إِلَى غَيْرِ وُلاَتِهَا لَمْ تُقْبَلْ مِنْهُ صَدَقَتُهُ، وَلَوْ تَصَدَّقَ بِالدُّنْيَا جَمِيعًا.[١]

(ابن أبي شيبة) دەفەرموێت: حَدَّثَنَا إِسْمَاعِيلُ ابْنُ عُلَيَّةَ، عَنْ أَيُّوبَ، قَالَ: سَأَلْتُ نَافِعًا عَنِ الْمَاءِ السُّخْنِ؟ فَقَالَ: كَانَ ابْنُ عُمَرَ يَتَوَضَّأُ بِالْحَمِيمِ.[٢]

(١) مصنف عبد الرزاق/ كتاب الزكاة/ باب موضع الصدقة ودفع الصدقة في مواضعها/ بە ژمارەی ٦٩٣٤.

(٢) مصنف ابن أبي شيبة / كتاب الطهارة / في الوضوء بالماء السخن / بە ژمارەی ٢٥٧.

# چەند تێبینیەك لەسەر پێناسەکەی مامۆستای دانەر

١) ئەوەی کە لەم پێناسەیەوە دەردەکەوێت، ئەوەیە کە تەنها وتە وکرداری یەکێك لە هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ ڕازی بێت) پێیان دەوترێت: (موقوف)، ئیتر دیار نیە ئایا بە تەقریری هاوەڵان دەوترێت (موقوف) یان نا؟

زانایان بە شێوەیەکی گشتی فەرموویانە: بەڵێ تەقریری هاوەڵانیش هەر وەکو وتە وکردارەکانیان بە (موقوف) دادەنرێت.[1] چونکە کاتێك کە باس لە حەدیس دەکرێت، ئەوا هەموو جۆرە وتە وکردار وتەقریرێك دەگرێتەوە، ئیتر درابێتەپاڵ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت) یان یەکێك لە هاوەڵان یان یەکێك لە شوێنکەوتووان.

بۆیە منیش پێم وایە مامۆستای دانەریش هەر هەمان بۆچوونی هەیە، بەڵام پێ دەچێت کە باسی تەقریری نەکردووە، تەنها لەبەر ئەوە بێت کە هۆنراوەیەکی کورتی داناوە، ئەمەش وای کردووە کە بە ئاسانی نەیتوانیوە هەرچی وشەیەك کە پێویست بووبێت لە هۆنراوەکەدا جێگەی بکاتەوە، خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە، دەبوو بیفەرموایە: من قول وفعل وتقرير زكن، کە ئەمەش دەبوو بە هۆی نەنگی لە کێشی هۆنراوەکەدا.

٢) لە پێناسەکەوە وەها دەردەکەوێت کە هەموو وتە وکردارێك کە بدرێنە پاڵ هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ ڕازی بێت) پێیان دەوترێت: (موقوف). بەڵام ئەم قسەیە نابێت بەم ڕەهاییە وەربگیرێت ! چونکە وەکو لە باسی (مرفوع)ی حوکمیدا ڕوونمان کردەوە، هەندێك جار وتەیەك یان کردارێك دەدرێتە پاڵ یەکێك لە هاوەڵان، ولەگەڵ ئەوەشدا حوکمی (مرفوع)ی هەیە، واتە وەکو ئەوە وایە کە درابێتە پاڵ حەزرەت (درودی خودای لەسەر بێت).

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٧، والمقنع / ١١٤، والغاية في شرح الهداية / ١٦٣، والتوضيح الأبهر / ٣٧، والنكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ٥١٢، والمنهل الروي / ٤٠، وشرح شرح نخبة الفكر / ٦٠٧، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٤٠، وشرح الزرقاني على البيقوني مع حاشية الأجهوري / ١٤٠.

٣) لە پێناسەکەوە وەها دەردەکەوێت کە بۆ ئەوەی حەدیسێك بە (موقوف) دابنرێت، دەبێت بدرێتە پاڵ یەکێك لە هاوەڵان، ئیتر ئەوتراوە ئایا دەبێت بە ڕشتەیەکی نەبچڕاو بگات بەو هاوەڵە؟ یان ئەگەر بچڕاویش بێت، گرنگ نیە، وهەر بە (موقوف) دادەنرێت؟

- زۆرینەی زانایان فەرموویانە: گرنگ نیە کە ڕشتەکە پێکەوە بەستراو ونەبچڕاو بێت، بەڵکو ئەگەر بچڕاویش بێت، ئەو حەدیسە هەر بە (موقوف) دادەنرێت، چونکە خاڵی سەرەکی لە پێناسەی حەدیسی (موقوف)دا ئەوەیە کە بدرێتە پاڵ یەکێك لە هاوەڵان، ئیتر گرنگ نیە کە بە ڕشتەیەکی نەبچڕاو بێت یان بچڕاو.[1]
- ئیمامی حاکیم فەرموویەتی: سەرەڕای ئەوەی کە دەبێت درابێتە پاڵ یەکێك لە هاوەڵان، پێویستیشە کە بە ڕشتەیەکی نەبچڕاو بگاتەوە بە خاوەنەکەی، ئەگینا بە (موقوف) دانانرێت.[2]

## حوکمی حەدیسی ( موقوف )

ئەم جۆرە حەدیسەش هەر وەکو جۆرەکانی پێشووتر دەکرێت کە (صحیح) بێت، وە دەشکرێت کە (حسن) بێت، وە دەشکرێت کە (ضعیف) بێت.

بەڵام کە وترا (صحیح)ە یان (حسن)ە، ئەمە وەها ناگەیەنێت کە پێی وەربگیرێت وبکرێت بە بەڵگە، بەڵکو دەبێت جیاوازی بکرێت لەوەدا کە ئایا ئەو حەدیسە حوکمی حەدیسی (مرفوع)ی هەیە یان نا؟

---

(١) بروانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٧، والمنهل الروي / ٤٠، وشرح شرح نخبة الفكر / ٦٠٥، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٤٠، والمقنع / ١١٤، والغاية في شرح الهداية / ١٦٣، وشرح الزرقاني على البيقوني / ١٤٠. زانای ئایەبەرز (الحافظ العراقي) لە ئەلفیەکەیدا فەرموویەتی:

١٠١. وَسَمِّ بالمَوْقُوفِ مَا قَصَرْتَهُ     بِصَاحِبٍ وَصَلْتَ أَوْ قَطَعْتَهُ

(٢) بروانە: معرفة علوم الحديث، أبو عبد الله محمد بن عبد الله الحاكم النيسابوري / ٥٩. شێخی عەسقەلانی لەسەر ئەم بۆچوونە فەرموویەتی: "وهو شرط لم يوافقه عليه أحد والله أعلم" / واتە: لەم مەرجەدا کەس هاودەنگ نیە لەگەڵیدا. بروانە: النكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ٥١٢. وە ئیمامی سەخاویش فەرموویەتی: "وشذ الحاكم فاشترط عدم الانقطاع". واتە: ئیمامی حاکیم لە کۆمەڵەی زانایان دەرچووە، کە بەمەرجی داناوە ڕشتەکە نەبچڕاو بێت. بروانە: فتح المغيث / ١ / ١٢١.

خۆ ئەگەر حوکمی حەدیسی (مرفوع)ی هەبوو، ئەوا کاری پێ دەکرێت وبە بەڵگەش دەهێنرێتەوە،[1] وەکو ئەوەی کە یەکێك لە هاوەڵان تەفسیری ئایەتێك بکات کە پەیوەندی بە هۆی دابەزینی ئایەتەکەوە هەبێت،[2] یان لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا کاتێك دەگات بە هاوەڵەکە بوترێت: یرفع الحديث أو: يبلغ به أو: ينميه أو: رواية،[3] یان یەکێك لە هاوەڵان بفەرمویێت:

- كُنَّا لا نَرَى بَأْساً بِكَذَا فِي حَيَاةِ رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم) أو وَهُوَ فِيْنَا، أو بَيْنَ أَظْهُرِنَا.
- كَانُوا يَفْعَلُونَ أو يَقُولُونَ أو يُقَالُ كَذا فِي عَهْدِ رَسُولِ اللهِ (صلى الله عليه وسلم).
- أُمِرْنَا بِكَذا أو نُهِينَا عَنْ كَذا أو مِنَ السُّنَّةِ كَذا، أو أُمِرَ بِلالُ أَنْ يَشْفَعَ الأَذانَ.

بەڵام ئەگەر حوکمی (مرفوع)ی نەبوو، ئەوا زانایان تێیدا ناکۆکن:[4]

- ئیمامی شافیعی وهەندێك لە زانایان پێیان وایە کە بەبەڵگە بەکار ناهێنرێت وپێی وەرناگیرێت.
- هەندێکی تر فەرموویانە: پێی وەردەگیرێت ودەکرێت بە بەڵگە.

---

(١) بروانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٨ – ٣٠، والغاية في شرح الهداية / ١٦٠ – ١٦١، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٤٠ - ١٤٥، والمنهل الروي / ٤٠ – ٤٢، وفتح المغيث / ١ / ١٢٦ – ١٣٣.

(٢) بۆ نموونە: جابری کوڕی عەبدوڵا فەرموویەتی: كَانَتِ الْيَهُودُ تَقُولُ إِذَا أَتَى الرَّجُلُ امْرَأَتَهُ مِنْ دُبُرِهَا فِي قُبُلِهَا كَانَ الْوَلَدُ أَحْوَلَ فَنَزَلَتْ ( نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ). صحيح مسلم / النكاح / باب جواز جماعه امرأته في قبلها من قدامها ومن ورائها / بە ژمارەی ٣٦٠٨.

(٣) بۆ نموونە: ئیمامی موسلیم دەفەرموێت:........ عَنْ أَبِي الزِّنَادِ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- وَفِى حَدِيثِ زُهَيْرٍ يَبْلُغُ بِهِ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم-. وَقَالَ عَمْرٌو رِوَايَةً « النَّاسُ تَبَعٌ لِقُرَيْشٍ فِي هَذَا الشَّأْنِ مُسْلِمُهُمْ لِمُسْلِمِهِمْ وَكَافِرُهُمْ لِكَافِرِهِمْ ». صحيح مسلم / الإمارة / باب الناس تبع لقريش / بە ژمارەی ٤٨٠٤.

(٤) بروانە: المنهل الروي / ٤٢، وتوضيح الأفكار / ١ / ٢٣٩، ومنهج النقد في علوم الحديث / ٣٢٨. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر ئەم بابەتە دەتوانیت بگەڕێیتەوە سەر باسی (قول الصحابي) لە کتێبە ئوصولیەکاندا، کە زۆر بە وردی باسیان لێوە کردووە.

# جۆری شانزەیەم

# حەدیسی ( المُرْسَل )

واتە: حەدیسی (مرسل) ئەو حەدیسەیە کە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا هاوەڵەکەی حەزرەتی تێدا لابراوە.

زانایان ڕای جیاوازیان هەیە لە چۆنێتی ناساندن وپێناسەکردنی حەدیسی (مرسل)دا(١):

١)هەندێکیان (کە مامۆستای دانەریش یەکێکە لەوان) دەفەرموون: ئەو حەدیسەیە کە – دراوەتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، و- لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا هاوەڵەکەی حەزرەتی تێدا لابراوە.

٢)هەندێکی تر دەفەرموون: ئەو حەدیسەیە کە یەکێك لە تابیعییە گەورەکان لە حەزرەتی گێڕاوەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێت).

٣)هەندێکی تر دەفەرموون: ئەو حەدیسەیە کە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا بچڕانی تێدایە، ئیتر لە هەرکوێی ڕشتەکەدا بێت. ئەمەیان ڕای شەرعزانان وئوصولیەکان وهەندێکیش لە فەرموودەناسانە، وەکو خەطیبی بەغدادی.

٤)زۆرینەی فەرموودەناسان دەفەرموون: ئەو حەدیسەیە کە یەکێك لە شوێنکەوتوان، یان یەکێك لەو کەسانەی کە بە منداڵی بە خزمەتی حەزرەت گەیشتوون (دروودی خودای لەسەر بێت)، گێڕاویانەتەوە وداویانەتە پاڵ حەزرەت (دروودی خودای لەسەر بێت)، بەبێ ئەوەی باسی ئەوە بکەن کە لە کێیان بیستووە، یەکێك لە هاوەڵان یان یەکێك لە شوێنکەوتووان.

---

(١) بروانە: مقدمة ابن الصلاح / ٣١ – ٣٢، وجامع التحصيل في أحكام المراسيل، أبو سعيد العلائي / ٣٠ – ٣١، والكفاية في علم الرواية / ٢١، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٥٢ – ١٥٣، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٥٥ – ٥٥٧، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٠٣ – ٢٠٥، وتوضيح الأفكار / ٢ / ٢٥٨ – ٢٦١، والمنهل الروي / ٤٢ – ٤٣.

ئەوەی کە جێگەی سەرنج وتێبینییە لەسەر پێناسەکەی مامۆستای دانەر، ئەوەیە کە دەستنیشانی کردووە کە کێ لە ڕشتەکەدا نەماوە ولابراوە، بەوەی کە یەکێکە لە هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ ڕازی بێت)، بەڵام هەر وەکو پێشتر ئاماژەمان پێداوە، هاوەڵانی حەزرەت (خودایان لێ ڕازی بێت) هەموویان عادیلن، بۆیە دەبێت ناونەبران ولابردنی ئەوان لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێکدا هیچ زیانێك نەدات لە (صحیح)ی ئەو حەدیسە، کەچی حەدیسی (مرسل) وەکو دواتر باسی دەکەین، زۆرینەی زانایان بە (ضعیف)ی دادەنێن.

خۆ ئەگەر مامۆستای دانەریش بە پێناسەی چوارەمی وەریگرتایە، هەر وەکو زۆرینەی فەرمووده‌ناسان پێیان وەرگرتووە، ئیتر ئەم سەرنج وتێبینییە لەسەر پێناسەکەی درووست نەدەبوو، بەڵکو بەپێی ئەم پێناسەیە ئەو کەسەی کە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا نەماوە ولابراوە، دەکرێت کە ئەویش یەکێك بێت لە شوێنکەوتووان، بەڵکو زیاد لەوەش زانایان فەرموویانە: دەکرێت دوو یان زیاتر لە تابیعییەکان لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێکدا هەبن.(١)

بۆیە ئەگەر پێناسەکە بەم جۆرە بوایە، ئەوا زۆر زیاتر دەگونجا کە (ضعیف) بێت، وهیچ نەگونجان ودژایەتیەکیش درووست نەدەبوو لەگەڵ ئەوەی دواتر دێینە سەری، کە زۆرینەی زانایان فەرموویانە: ئەم جۆرە حەدیسە (ضعیف)ە.

---

(١) ئیمامی نەسائی حەدیسێکمان بۆ ڕیوایەت دەکات لەسەر فەزڵ وگەورەیی سورەتی ئیخلاص (قل هو الله أحد)، کە شەش کەس لە شوێنکەوتووان لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا هەن، پاشان دەفەرموێت: هیچ ڕشتەیەکم لەمە درێژتر نەبینیوە. کە حەدیسەکەش ئەمەیە: أَخْبَرَنَا مُحَمَّدُ بْنُ بَشَّارٍ قَالَ حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّحْمَنِ قَالَ حَدَّثَنَا زَائِدَةُ عَنْ مَنْصُورٍ عَنْ هِلاَلِ بْنِ يِسَافٍ عَنْ رَبِيعِ بْنِ خُثَيْمٍ عَنْ عَمْرِو بْنِ مَيْمُونٍ عَنِ ابْنِ أَبِي لَيْلَى عَنِ امْرَأَةٍ عَنْ أَبِي أَيُّوبَ عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- قَالَ « (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ) ثُلُثُ الْقُرْآنِ ».سنن النسائي / صفة الصلاة / الفضل في قراءة قل هو الله أحد / بە ژمارەی ٩٩٦. ئیمامی سیوطی لەسەر ئەم حەدیسە لە شەرحی سونەنی نەسائیدا فەرموویەتی: شەش کەس لە شوێنکەوتووان لەم ڕشتەدا هەیە، یەکەمیان مەنصوورە، وە ژنەکەش خێزانی ئەبو ئەییوبە.

## ئەو كەسانەی كە زۆرترین حەدیسی (مرسل)یان لێوە ڕیوایەت كراوە

زانایان فەرموویانە: خەڵكی شاری مەدینەی پیرۆز زیاتر ئەم جۆرە حەدیسە لە سەعیدی كوڕی موسەییەب ڕیوایەت دەكەن، خەڵكی شاری مەككەی پیرۆزیش لە عەطائی كوڕی ئەبی ڕەباح، وە خەڵكی وڵاتی میصریش لە سەعیدی كوڕی ئەبی هیلال، وە خەڵكی –وڵاتی– شامیش لە مەكحوولی دیمەشقی، وە خەڵكی شاری بەصرەش لە (حسن)ی كوڕی ئەبی (حسن)، وە خەڵكی شاری كووفەش لە ئیبراهیمی نەخعی.(١)

پاشان فەرموویانە: بێجگە لەم زانایانە كەسانێكی تریش لە شوێنكەوتووان ئەم جۆرە حەدیسەیان لێ ڕیوایەت كراوە، بەڵام بە ڕێژەیەكی كەمتر. وە لەناو ئەوانیشدا لە هەموویان (صحیح) تر بریتیە لەو حەدیسانەی كە سەعیدی كوڕی موسەییەب ڕیوایەتی كردوون، چونكە باوكی سەعید یەكێك بوە لەو هاوەڵانەی حەزرەت كە لە ژێر دارەكەی (بیعة الرضوان)دا بەشداری كردبوو، وە سەعید خۆشی چاوی بە تەواوی دە كەسە بە بەهەشت مژدەپێدراوەكان كەوتبوو، بێجگە لە ئیمامی ئەبوبەكر، كە لەناو شوێنكەوتواندا هیچ كەسێك نیە كە چاوی بەمانە گشتیان كەوتبێت، بێجگە لە سەعید وقەیسی كوڕی ئەبی حازم، پاشان سەعید شەرعزان وموفتی خەڵكی حیجازە، وە یەكەم كەسە لەو حەوت شەرعزانەی كە ئیمامی مالیك پێی وایە یەكدەنگی ئەوان یەكدەنگی تەواوی خەڵكە.(٢)

- هەرسێ ئیمام (البیهقي وعبد الرزاق وأبو داود) بۆمان دەگێڕنەوە لە سەعیدی كوڕی موسەییبەوە كە فەرموویەتی: أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم)، قَالَ:«لاَ يَخْرُجُ أَحَدٌ مِنَ الْمَسْجِدِ بَعْدَ النِّدَاءِ إِلاَّ مُنَافِقٌ. إِلاَّ رَجُلٌ يَخْرُجُ لِحَاجَتِهِ وَهُوَ يُرِيدُ الرَّجْعَةَ إِلَى الْمَسْجِدِ».(٣)

---

(١) بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ٦٧، والنكت على مقدمة ابن الصلاح / ٢ / ٥٣٦، وتوجيه النظر / ١ / ٤٠٠. حەسەنی كوڕی ئەبی حەسەن واتە شێخ حەسەنی بەصری.

(٢) بڕوانە هەمان سەرچاوەكانی پێشوو.

(٣) سنن البيهقي الكبرى / كتاب الحيض / باب ما جاء من التشديد في ترك الجماعة من غير عذر / بە ژمارەی ٤٧١٨، ومصنف عبد الرزاق / كتاب الصلاة / باب الرجل يخرج من المسجد / بە ژمارەی ١٩٤٦، والمراسيل لأبي داود / لاپەڕە ٨٤، بە ژمارەی ٢٥.

• هەردوو ئیمام (ابن أبي شيبة وأبو داود) بۆمان دەگێڕنەوە لە سەعیدی کوڕی موسەیەبەوە کە فەرموویەتی: أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم)، قَالَ: يَقْتُلُ الْمُحْرِمُ الذِّئْبَ.(١)

ئەوجا بەهۆی گرنگی وبایەخی تایبەتی ئەم جۆرە حەدیسە زانایان هەستاون چەند کتێبێکیان لەسەر داناوە، چی بە کۆکردنەوەی حەدیسەکان، یان بە باس لێوە کردنی بە شێوەیەکی گشتی، لەوانە:

١) المراسيل لأبي داود السجستاني، صاحب السنن.

٢) المراسيل لابن أبي حاتم الرازي.

٣) تحفة التحصيل في ذكر رواة المراسيل، للحافظ أبي زرعة العراقي.

٤) جامع التحصيل في أحكام المراسيل، لأبي سعيد العلائي.

## حوکمی حەدیسی (مرسل)

زانایان لە باسی بەبەڵگە هێنانەوەی ئەم جۆرە حەدیسەدا چەند بۆچوونێکیان هەیە، کە گرنگترینیان ئەمانەن: (٢)

• بۆچوونی یەکەم: حەدیسی مرسل حەدیسێکی (ضعيف)ە، وناکرێت وەکو بەڵگە بەکار بهێنرێت. کە ئەمە بۆچوونی زۆرینەی فەرمووده‌ناسان، وزۆرێکیش لە شەرعزانان

---

(١) مصنف ابن أبي شيبة / كتاب المناسك / في قتل الذئب للمحرم / بە ژمارەی / ١٥٧١٤ و ١٥٧١٥، والمراسيل لأبي داود / لاپەڕە ١٤٦، بە ژمارەی ١٣٧. بۆ نموونەی زیاتر لەسەر هەریەکێك لەو تابیعیانەی کە ناومان بردن، بڕوانە ئەو سەرچاوانەی کە ناومان بردن.

(٢) بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هەموو بۆچوونەکان، بڕوانە هەریەکە لە: مقدمة ابن الصلاح / ٣٢، والباعث الحثيث:٤٢ – ٤٣، والكفاية في علم الرواية / ٣٨٤ -....، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٥٤ – ١٥٥، والنكت على مقدمة ابن الصلاح / ٢ / ٤٨٦ – ٤٩٥، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٠٥ – ٢١١، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٥٩، ومنهج النقد في علوم الحديث / ٣٧١ – ٣٧٢، قواعد التحديث من فنون مصطلح الحديث / ٢٢٠.

وئوصولییەکانە. بەڵگەشیان ئەوەیە کە ئەو کەسەی کە لە ڕشتەکەدا لابراوە ونەماوە، نازانرێت کێیە، بۆیە دەکرێت یەکێك لە هاوەڵان بێت، ودەشکرێت کە یەکێك لە شوێنکەوتووان بێت، جا ئەگەر یەکێك بوو لە شوێنکەوتووان، ئەوا دەکرێت کەسێکی متمانەداربێت، وە دەشکرێت کە جێگەی متمانە نەبێت.

- بۆچوونی دووەم: حەدیسی مرسل پێی وەردەگیرێت، بە مەرجێك کە لە یەکێك لە گەورە تابیعییەکانەوە ڕیوایەت کرابێت، وەچەند خاڵێکیش ڕەچاو بکرێن لە حەدیسەکە وڕاوییەکەیدا:

خاڵەکانی ئەصڵی حەدیسەکە، بریتین لەوەی کە ئەو حەدیسە بە یەکێك لەم چوار ڕێگە پاڵپشت کرابێت:

١) دەبێت لە ڕێگەیەکی ترەوە بە بێ بچران ڕیوایەت کرابێت.

٢) دەبێت لە ڕێگەی کەسێکی ترەوە ڕیوایەت کرابێت، بەڵام نەك لە مامۆستای ئەوەی یەکەمەوە.

٣) دەبێت فەرمایشتی یەکێك لە هاوەڵانیش لەگەڵ ئەو حەدیسەدا ڕێك بکەوێت.

٤) دەبێت ڕاو فەتوای زۆرینەی زانایانیش لەگەڵ ئەو حەدیسەدا بێت.

خاڵەکانی تایبەت بە ڕاوی حەدیسەکە: ئەگەر ڕاویەکە ناوی ئەو کەسەی هێنا کە لە ڕشتەکەدا لایبردبوو، ئەوا:

١)دەبێت ڕاویەکە خۆی جێگەی متمانە بێت.

٢)دەبێت بەوە ناسراوبێت کە ڕیوایەتی حەدیس ناکات لە کەسی متمانەدار نەبێت.

٣)دەبێت ئەو کەسەی کە ناوی نەبردووە ولایبردووە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکە کەسێکی نەناسراو نەبێت، وەیەکێك نەبێت لەو کەسانەی کە زانایان لە بواری گێڕانەوەی حەدیسدا حەزیان پێ ناکەن وپێیان ناخۆشە حەدیسیان لێ بگێڕنەوە.

ئەمە بۆچوونی ئیمامی شافیعییە.

- بۆچوونی سێیەم: حەدیسی مرسل پێی وەردەگیرێت، وبەبەڵگە دەهێنرێتەوە، بەمەرجێك كە ئەو كەسەی ڕیوایەتی دەكات كەسێكی متمانەدار بێت، ئەمەش بۆچوونی ئیمامی ئەبو حەنیفە ومالیكە وریوایەتیش كراوە لە ئیمامی ئەحمەدەوە، وە زۆرینەی زانایانی پێشینەش هەر هەمان بۆچوونیان هەیە.

# باسی (مرسل الصحابي)

زانایانی (أصول الفقه) باسی جۆرە حەدیسێكی مرسل دەكەن وپێی دەڵێن: (مرسل الصحابي).

مەبەستیان ئەو حەدیسەیە كە یەكێك لەو هاوەڵانە گێڕاویانەتەوە لە حەزرەتەوە (دروودی خودای لەسەر بێت)، كە خۆیان لێیان نەبیستووە، ئیتر لەبەر ئەوەی كە منداڵ بوون، یان درەنگ موسوڵمان بوون، یان لە كاتی ئەو باسەدا لە خزمەتی حەزرەتدا (دروودی خودای لەسەر بێت) نەبوون. نموونەی ئەم جۆرە حەدیسە زۆرن، لە عەبدوڵای كوڕی عەباس وعەبدوڵای كوڕی زوبەیر، وهاوەڵانی تردوە كە تەمەنیان كەم بووە لەماوەی ژیانی حەزرەتدا (درووی خودای لەسەر بێت).

ئیمامی ئەحمەد ونەسائی وئیبنو حیببان بۆمان دەگێڕنەوە لە عەبدوڵای كوڕی عەبباسەوە كە فەرموویەتی: مَرِضَ أَبُو طَالِبٍ فَأَتَتْهُ قُرَيْشٌ وَأَتَاهُ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) يَعُودُهُ وَعِنْدَ رَأْسِهِ مَقْعَدُ رَجُلٍ فَقَامَ أَبُو جَهْلٍ فَقَعَدَ فِيهِ فَقَالُوا إِنَّ ابْنَ أَخِيكَ يَقَعُ فِي آلِهَتِنَا قَالَ مَا شَأْنُ قَوْمِكَ يَشْكُونَكَ قَالَ يَا عَمِّ أُرِيدُهُمْ عَلَى كَلِمَةٍ وَاحِدَةٍ تَدِينُ لَهُمْ بِهَا الْعَرَبُ وَتُؤَدِّي الْعَجَمُ إِلَيْهِمْ الْجِزْيَةَ قَالَ مَا هِيَ قَالَ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ فَقَامُوا فَقَالُوا أَجَعَلَ الْآلِهَةَ إِلَهًا وَاحِدًا قَالَ وَنَزَلَ { ص وَالْقُرْآنِ ذِي الذِّكْرِ فَقَرَأَ حَتَّى بَلَغَ إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ }.[1]

---

(١) مسند أحمد ابن حبل / ومن مسند بني هاشم / مسند عبد الله بن العباس بن عبد المطلب عن النبي / به ژمارەی ٢٠٠٨، وسنن النسائي الكبرى / كتاب التفسير / سورة الصافات / به ژمارەی ١١٤٣٦، وصحيح ابن حبان / كتاب التأريخ / باب إخباره صلى الله عليه و سلم عما يكون في أمته من الفتن والحوادث / به ژمارەی ٦٦٨٦.

ئیمامی بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە لە عوروەی کوڕی زوبەیرەوە، ئەویش لە دایکە عائیشەوە کە فەرموویەتی: أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) مِنْ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ.....[1]

وتەی ڕاست کە تەواوی یان زۆرینەی زانایان لەسەرینی ئەوەیە: ئەم جۆرە حەدیسانە حوکمی حەدیسی موسنەدیان هەیە، چونکە ئەو کەسەی کە لە ڕشتەی ئەم جۆرە حەدیسانەدا دیار نیە ولابراوە، یەکێکە لە هاوەڵان، وە ئەوانیش ناوهێنان وناونەهێنانیان یەکسانە، چونکە هەموویان عادیل ومتمانەدارن. هەر بۆیە زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەم جۆرە حەدیسە دەکرێت بە بەڵگە وپشتی پێ دەبەسترێت.[2]

(١) صحيح البخاري / المقدمة / بدء الوحي / باب كيف كان بدء الوحي إلى رسول الله / بە ژمارەی ٣.

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٣٢، والنكت على مقدمة ابن الصلاح / ٢ / ٥٢٦، وقفو الأثر / ١ / ٦٧، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢١٣، والباعث الحثيث / ٤٢، وتوضيح الأفكار / ١ / ٢٨٧، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٦١، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٦٣ - ١٦٤، والمنهل الروي / ٤٥ – ٤٦، والمقنع / ١٣٨، وشرح الزرقاني على البيقوني مع حاشية الأجهوري / ١٤٩.

# جۆری حەڤدەیەم

## حەدیسی (الغَرِیب)

واتە: بلّێ: حەدیسی (غریب) ئەو حەدیسەیە كە تەنها یەك كەس ڕیوایەتی كردووە.

ئەمە ئەو جۆرەی تری حەدیسی ئاحادە كە لە باسی حەدیسی مەشهور وعەزیزدا ناماژەمان پێدا، وتمان مامۆستا لە جێگەیەكی تردا نیوە هۆنراوەیەكی بۆ تەرخان كردووە.

لەم پێناسەی مامۆستاوە وەها دەردەكەوێت كە هەر حەدیسێك لە سەرەتای ڕشتەی گێڕانەوەكەیدا یەك كەس ڕیوایەتی كردبێت، یان سەرەتا كۆمەڵێك بن، ودواتر یەك كەس ڕیوایەتی كردبێت، ئەوە هەر بە حەدیسی غەریب دادەنرێت، هەروەكو چۆن زۆرینەی زانایانیش هەمان بۆچوونیان هەیە.

هەر بۆیە زانایان ئەم جۆرە حەدیسەیان دابەش كردووە بۆ دوو جۆر: (١)

- غەریبی ڕەها (كە پێشی دەوترێت: الفرد): بەو حەدیسە دەڵێن كە تەنها یەك كەس لە حەزرەتەوە ڕیوایەتی كردووە، ودواتریش لە تەواوی چینەكانی ڕشتەی گێڕانەوەكەیدا هەر دەگونجێت كە یەك كەس ڕیوایەتی كردبێت. بۆ نموونە یەكەم حەدیسێك كە لە صەحیحی بوخاریدا ڕیوایەت كراوە بریتیە لە حەدیسی: « إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ ». ئەم حەدیسە تەنها ئیمامی عومەر لە حەزرەتەوە ڕیوایەتی كردووە، وە لە ئیمامی عومەریشەوە تەنها عەلقەمەی كوڕی وەقاصی لەیثی ڕیوایەتی كردووە، وە لەویشەوە تەنها موحەممەدی كوڕی ئیبراهیمی تەیمی ڕیوایەتی كردووە، وە لەویشەوە تەنها یەحیای كوڕی سەعید ڕیوایەتی كردووە.
- غەریبی نیسبی: بەو حەدیسە دەڵێن كە لە سەرەتای گێڕانەوەكەیدا زیاد لە یەك كەس ڕیوایەتیان كردووە، بەڵام دواتر لە جێگەیەكی ڕشتەكەیدا دەبێت بە یەك كەس. ئەم جۆرە حەدیسە لە كتێب وسەرچاوەكاندا زۆر بەرچاو دەكەوێت، بە تایبەتی لە (المعجم الأوسط)ی ئیمامی طبراني، ئەوەتا دەفەرموێت: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ إِبْرَاهِيمَ الرَّازِيُّ، حَدَّثَنَا إِبْرَاهِيمُ بْنُ مُحَمَّدٍ الْمُؤَدِّبُ، حَدَّثَنَا أَبُو عِيسَى بْنُ مُوسَى الْغُنْجَارُ، عَنْ أَبِي حَمْزَةَ السُّكَّرِيِّ، عَنِ الأَعْمَشِ، عَنْ أَيُّوبَ السَّخْتِيَانِيِّ، عَنِ مُحَمَّدِ ابْنِ سِيرِينَ، عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: لا تُسَمُّوا الْعِنَبَ الْكَرْمَ. پاشان فەرموویەتی: لَمْ يَرْوِهِ هذا الحَدِيثَ عَنِ الأَعْمَشِ، إِلَّا أَبُو حَمْزَةَ، تَفَرَّدَ بِهِ الْغُنْجَارُ. (٢)

---

(١) بڕوانە: نزهة النظر / ٦٤، وتوجيه النظر / ١ / ٤٩٠.

(٢) المعجم الأوسط / ٧ / ٧٢/ بە ژمارەی ٦٨٨٨.

هەروەها زانایان لە لایەکی ترەوە ئەم جۆرە حەدیسەیان دابەش کردووە بۆ چەند جۆرێکی تر، کە ئەوانیش:

١) غریب سنداً ومتناً: ئەو حەدیسەیە کە تەنها یەك کەس ڕیوایەتی کردووە، کە ئەم جۆرەیان پێی دەوترێت (الفرد المطلق). ئیمامی حاکم وکەسانی تریش نموونەیان بۆ ئەم جۆرە حەدیسە بەو حەدیسە هێناوەتەوە کە فەرموویانە: حَدَّثَنَا خَلاَّدُ بْنُ يَحْيَى حَدَّثَنَا أَبُو عُقَيْلٍ: يَحْيَى بْنُ الْمُتَوَكِّلِ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ سُوقَةَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ عَنِ النَّبِيِّ -صلى الله عليه وسلم- أَنَّهُ قَالَ:«إِنَّ هَذَا الدِّينَ مَتِينٌ فَأَوْغِلْ فِيهِ بِرِفْقٍ، وَلاَ تُبَغِّضْ إِلَى نَفْسِكَ عِبَادَةَ اللَّهِ، فَإِنَّ الْمُنْبَتَّ لاَ أَرْضًا قَطَعَ، وَلاَ ظَهْرًا أَبْقَى». پاشان فەرموویانە: ئەم حەدیسە لە ڕووی دەق وڕشتەشەوە غەریبە، چونکە تەنها (مُحَمَّدِ بْنِ سُوقَةَ) لە (مُحَمَّدِ بْنِ الْمُنْكَدِرِ) و ئەویش لە (جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ) وە ڕیوایەتیان کردووە.[1]

٢) غریب سنداً لا متناً: وەکو ئەو حەدیسەی کە لە کۆمەڵێك لە هاوەڵانەوە ڕیوایەت کرابێت، بەڵام یەکێك لە ڕاویەکان لە هاوەڵێکی تر بێجگە لەوانەوە ڕیوایەتی بکات. ئەم جۆرە زیاتر پێی دەڵێن: (الفرد النسبي)، کە شێخی عەسقەلانی دەفەرموێت: بە زۆری بەم جۆرە حەدیسە دەڵێن حەدیسی غەریب.[2] نموونەی ئەم جۆرە حەدیسەش وەکو ئەو حەدیسە (صحیح)ەی کە ئیمامی بوخاری وموسلیم ڕیوایەتیان کردووە لە ئەبو هورەیرە ولە ئیبنو عومەرەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: «الْكَافِرُ يَأْكُلُ فِي سَبْعَةِ أَمْعَاءٍ وَالْمُؤْمِنُ يَأْكُلُ فِي مِعًى وَاحِدٍ».[3] زانایان فەرموویانە ئەم حەدیسە لە ڕێگەی ئەبو موسای ئەشعەریەوە غەریبە وتەنها لە ڕێگەی کوڕێکی خۆیەوە بەناوی ئەبو بوردەوە ڕیوایەت کراوە، بەڵام لە ڕێگەکانی ترەوە غەریب نیە.[4]

٣) غریب متناً لا سنداً: کە ئەم جۆرەیان شێخی شارەزووری دەفەرموێت: ئەم حەدیسە نموونەی نیە، مەگەر لە یەکێك لەو کەسانەی کە حەدیسەکەیان ڕیوایەت کردووە کۆمەڵە کەسێکی تر ڕیوایەتی بکەن، بەمەش ئەو حەدیسە دەبێت بە: غریب مشهور، واتە غەریب دەبێت لەڕووی

---

(١) بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ١٥٣، وتوجيه النظر / ١ / ٤٢٨ – ٤٢٩.

(٢) بڕوانە: نزهة النظر / ٦٦.

(٣) صحيح البخاري / كتاب الأطعمة / باب المؤمن يأكل في معى واحد / و صحيح مسلم / كتاب الأشربة / باب المؤمن يأكل في معي واحد والكافر يأكل في سبعة أمعاء. (أبو عبد الله محمد بن جعفر الكتاني) خاوەنی کتێبی: (نظم المتناثر من الحديث المتواتر) لە لاپەڕە (١٥٤)دا فەرموویەتی: ئەم حەدیسە بێجگە لە (أبو هريرة وابن عمر وأبو موسى) لە ڕێگەی پانزە کەسی ترەوە ڕیوایەت کراوە.

(٤) بڕوانە: شرح علل الترمذي / باسی: الغريب إسناداً لا متنا عند الترمذي، وە فتح المغيث / ٣ / ٣٤.

مەتنی حەدیسەکەوە، بەلاَم غەریب نابێت لەرووی ڕشتەی گێرانەوەوە، وەکو حەدیسی: "إنما الأعمال بالنيات" کە لە پاش چەند کەسێك لە ڕاویەکان، حەدیسەکە دەبێت بە مەشهور وکۆمەلێکی زۆر ڕیوایەتی دەکەن.[١]

## حوکمی حەدیسی ( غريب )

حەدیسی غەریبیش وەکو دوو جۆرەکەی تری حەدیسی ئاحاد، دەگونجێت (صحيح) بێت (وەکو ئەو حەدیسەی بوخاری کە وەکو نموونە هێنامانەوە). [٢] وە دەشگونجێت (حسن) بێت، وە دەشگونجێت (ضعيف) بێت، ئەویش بەپێی هاتنەجێی مەرجەکانی حەدیسی (صحيح) و(حسن)، یان نەهاتنەجێی ئەو مەرجانە.

بەلاَم زانایان فەرموویانە: زۆربەی زۆری حەدیسی غەریب، (ضعيف)ن. چونکە تەنها یەك کەس ڕیوایەتی کردبێت، ئەوە زیاتر گومانی ئەوەی لێ دەکرێت کە ئەو کەسە کەوتبێتە هەلەوە، بەلاَم ئەگەر چەند کەسێك بن، ئەوا ئەگەری کەوتنە هەلەوە کەمتر دەبێتەوە.[٣]

---

(١) بروانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٥٧. تا لێرەدا زانای پایەبەرز (ابن سيد الناس اليعمري) لە کتێبێکیدا بەناوی: (النفح الشذي في شرح جامع الترمذي) باسی دوو جۆری تریشی کردووە کە ئەوانیش: (غريب بعض السند فقط، وغريب بعض المتن فقط. جا بۆ زانیاری زیاتر بروانە هەریەکە لە: الشذا الفياح / ٢ / ٤٤٩، والتقييد والإيضاح / ٢٧٣، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٧٨ - ٧٩.

(٢) یان وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە ئەبو هورەیرەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: « السَّفَرُ قِطْعَةٌ مِنَ الْعَذَابِ، يَمْنَعُ أَحَدَكُمْ طَعَامَهُ وَشَرَابَهُ وَنَوْمَهُ، فَإِذَا قَضَى نَهْمَتَهُ فَلْيُعَجِّلْ إِلَى أَهْلِهِ ». البخاري / أبواب العمرة / باب السفر قطعة من العذاب / حەدیسی ژمارە ١٧١٠. زانایان فەرموویانە: ئەم فەرموودەی حەزرەتە تەنها لەم ڕێگەوە بە صەحیحی هاتووە: (مَالِكٌ عَنْ سُمَيٍّ عَنْ أَبِي صَالِحٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ).

(٣) هەر بۆیە دەبینیت کە زانایانی پێشینە وەسف ومەدحی حەدیسی مەشهووریان کردووە، وزەمی حەدیسی غەریبیشیان کردووە:

- ئیمامی مالیك فەرموویەتی: "شر العلم الغريب، وخير العلم الظاهر الذي قد رواه الناس".
- عبد الرزاق فەرموویەتی: "كنا نرى أن غريب الحديث خير، فإذا هو شر".
- ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی: "لا تكتبوا هذه الغرائب، فإنها مناكير، وغالبها عن الضعفاء". وە لە جێگەیەکی تردا فەرموویەتی: "شَرُّ الحديث الغرائب التي لا يُعْمَل بها، ولا يعتمد عليها".
- إبراهيم بن أبي عبلة فەرموویەتی: "كانوا يكرهون غريب الكلام وغريب الحديث".
- يعقوب بن إبراهيم القاضي فەرموویەتی: "من اتبع غريب الأحاديث كذب".
- زهير بن معاوية فەرموویەتی: "ينبغي للرجل أن يتوقى رواية غريب الحديث". بۆ زانیاری زیاتر لەسەر وتەی زانایان لەبارەی حەدیسی غەریبەوە بروانە: شرح علل الترمذي، لابن رجب الحنبلي /٢٣٣، والكفاية في علم الرواية /١٤٠-١٤٢، والجامع لأخلاق الراوي، للخطيب البغدادي /٢/ ١٠٠، وتدريب الراوي /٤٥٥-٤٥٦.

وَكُلُّ مَا لَمْ يَتَّصِلْ بِحَالِ إِسْنَادُهُ مُنْقَطِعُ الأَوْصَالِ

# جۆری هەژدەیەم

# حەدیسی ( المُنْقَطِع )

واتە: هەر حەدیسێك کە ڕشتەی گێڕانەوەکەی بەیەك نەگەیشتبێت، ئەوە ئەندامەکانی لێکبچڕاون (واتە پێی دەوترێت: منقطع).

ئەم پێناسەیەی کە مامۆستای دانەر هەڵی بژاردوە بۆ حەدیسی (منقطع)، یەکێکە لەو پێناسانەی کە کراون بۆ ئەم جۆرە حەدیسە.[1] بەڵام ئەگەر بە وردی تێی بڕوانین، دەبینین کە پێناسەیەکی وەها نیە کە ئەم جۆرە حەدیسە لە حەدیسەکانی تری وەکو (معلّق ومرسل ومعضل) جیابکاتەوە، چونکە تەنها ئەوەندە دەڵێت کە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا بچڕان هەیە، ئیتر ئاماژەی نەکردووە بەوەی کە بچڕانەکە لە کوێدایە، لە سەرەتای ڕشتەکە، یان لەناوەندی ڕشتەکە، یان لە کۆتایی ڕشتەکە؟ یەك کەس لە ڕشتەکەدا دیار نەماوە، یان زیاتر؟ ئەگەر زیاتر بوو، ئایا بەشوێن یەکەوەن، یان نێوانیان هەیە؟

چونکە وەڵامی هەریەکە لەم پرسیارانە جۆرێك لە جۆرەکانی حەدیسمان بۆ دەستنیشان دەکات.

ئەوەتا ئەگەر لە کۆتایی ڕشتەکەوە بچڕانەکە هەبوو، بەو حەدیسە دەوترێت: (مرسل) وەکو لە جێگەی خۆیدا بە درێژی باسمان لێوە کرد.

---

(١) بڕوانە: التمهيد لما في الموطأ من المعاني والأسانيد، لابن عبد البر / ١ / ٢١. کە ئەم پێناسەیە یەکدەگرێتەوە لەگەڵ هەمان پێناسەی سێیەمی حەدیسی (مرسل) کە وتمان: ئەمە ڕای شەرعزانان ونوصولیەکان وهەندێکیش لە فەرموودەناسانە، وەکو خەطیبی بەغدادی.

وە ئەگەر لە سەرەتای ڕشتەکەوە بوو، ئیتر یەك ڕاوی لابرابوو، یان زیاتر، یان تەواوی ڕشتەکە لابرابوو، ئەوا پێی دەوترێت: (معلّق).[1]

وە ئەگەر لە ناوەندی ڕشتەکەدا بوو، وە دوو کەس بەشوێنی یەکدا لابرابوون، ئەوە پێی دەوترێت: (معضل) وەکو لەمەولا دێینە سەری، لە ڕوونکردنەوەی ئەو نیوە دێڕە هۆنراوەیەی کە دەفەرموێت:

وَالمعْضَلُ السَّاقِطُ مِنْهُ اثْنَانِ

کەواتە ئەم پێناسەیە ئەگەرچی فەرموودەناسانی پێشینە پێیان پەسەندە،[2] بەڵام ئەم ڕەخنەیە ڕووی تێدەکات، چونکە پێناسە دەبێت وەکو چۆن داگرەوە بێت بۆ هەموو ئەندامەکانی پێناسەکراوەکە، هەروا دەبێت ڕێگریش بێت لە هاتنەناوەوەی ئەوانەی کە ئەندامی پێناسەکراوەکە نین.

هەر بۆیە ئەگەر بویسترێت وەکو جۆرێکی تایبەتی حەدیس پێناسەیەکی داگرەوەی ڕێگر بۆ ئەم حەدیسەش بکرێت، ئەوا باشتر وەهایە کە بوترێت: ئەو حەدیسەیە کە لە ناوەندی ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا تەنها یەك کەسی لێ لابراوە، یان دوو کەسی لێ لابراوە، بەڵام بەشوێن یەکدا نین.

---

(١) نموونەی ئەم جۆرە حەدیسە لە صەحیحی بوخاریدا زۆرە، کە ناویان لێ نراوە بە (معلقات البخاري)، ئەوجا شێخی عەسقەلانی کتێبێکی تایبەتی لەسەر ئەم حەدیسانە داناوە، بە ناوی: (تغليق التعليق) کە تێیدا ڕوونی کردۆتەوە کە ئەو حەدیسانە هەندێکیان هەر لە صەحیحی بوخاری خۆیدا بە مەوصوولی باسکراون، وە هەندێکیشیان لە صەحیحی موسلیمدا باسکراون، وە هەندێکیشیان لە هەردوو صەحیحەکەدا بە مەوصوولی باسکراون، وە هەندێکیشیان لە هەندێك سەرچاوەی تری حەدیسیدا بە ڕشتەی جیاواز باس کراون، وە ئەوەیشی فەرموە کە هەرکام لەو حەدیسانە لە صەحیحی بوخاریدا، ئەگەر لە هێنانیدا وترابوو (فَعَلَ، وأَمَرَ، ورَوَى، وذَكَرَ: فلانٌ)، ئەوا ئەو حەدیسە بە (صحيح) دادەنرێت.

(٢) ئیمامی نەواوی فەرموویەتی: ((الصحيح الذي ذهب إليه الفقهاء والخطيب وابن عبد البر وغيرهم من المحدثين أن المنقطع ما لم يتصل إسناده على أي وجه كان)). بڕوانە: التقريب بشرح تدريب الراوي / ١٦٥. بەڵام ئیمامی حاکیم دەفەرموێت: ((النوع التاسع من هذا العلم معرفة المنقطع من الحديث وهو غير المرسل وقل ما يوجد في الحفاظ من يميز بينهما)). بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ٧٠.

# چۆن حەدیسی ( منقطع ) بناسین؟

سەرچاوەی بڕیاردان لەسەر ئەوەی کە حەدیسێك بە (منقطع) دابنرێت، ئەوەیە کە ڕاویەکانی ئەو حەدیسە لەو جێگەی کە بچڕانەکەی تێدایە بەیەك نەگەیشتبن.

ئەوجا چەند بەڵگەیەك هەیە لەسەر ئەوەی کە ڕاویەکان بەیەك نەگەیشتوون، کە ئەوانیش: [(١)]

١) ڕاویەکان لە یەك سەردەمدا نەژیاون. یان لە یەك سەردەمدا ژیاون، بەڵام بەیەکتر نەگەیشتوون، ویەکیان نەبینیووە، یان ئەگەر یەکیشیان بینیبێت، نەزانراوە کە ڕاویەکە حەدیسی لەو مامۆستایە بیستبێت، یان ئەگەر بیستبیشێتی لە تەمەنێکی کەم دا بووە ومنداڵ بووە. کە ئەم خاڵە لە ڕێگەی ئەو کتێبانەوە دەزانرێت کە باسی کاتی لەدایکبوون ومردنی ڕاویەکان دەکەن.

٢) بە باسکردن وناوهێنانی هەموو قوتابییەکانی مامۆستایەکی گێڕەرەوەی حەدیس. جا کە ناوی هەر کەسێك لە ڕیزی قوتابییەکانی ئەو مامۆستایەدا نەهاتبێت، ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو حەدیسەی کە لەو مامۆستایەی گێڕاوەتەوە (منقطع)ە.

٣) هەندێك جار ڕاویەکە خۆی دەڵێت: من هیچم لەو کەسەوە نەبیستووە کە حەدیسەکەم لێ ڕیوایەت کردووە. [(٢)]

(١) بڕوانە: تنقيح التحقيق في أحاديث التعليق، لشمس الدين محمد بن أحمد بن عبد الهادي الحنبلي / لە باسی / القرائن التي تفيد عدم السماع / ١ / ١٧٩. هەروەها زانایان ئەم خاڵانەیان لە باسی (الإرسال الخفي)دا بە دوور ودرێژی ڕوون کردۆتەوە. بڕوانە: جامع التحصيل في أحكام المراسيل، لە باسی / الباب الخامس في بيان المراسيل الخفي إرسالها / ١٢٥، والشذا الفياح / ٢ / ٤٨٠. جا بۆ نموونە لەسەر ئەم جۆرە حەدیسە بڕوانە: بيان الوهم والإيهام في كتاب الأحكام، لابن القطان / القسم الثاني بيان الإيهام / باب ذكر أحاديث أوردها على أنها متصلة وهي ونقطعة، أو مشكوك في اتصالها / ٢ / ٣٦٩ - ٥٦٩.

(٢) وەکو ئەو حەدیسانەی کە ئەبو عوبەیدەی کوڕی عەبدوڵای کوڕی مەسعوود لە باوکیەوە ڕیوایەتی کردوون، هەموویان بە (مرسل) دادەنرێن، چونکە ئیمامی بەیهەقی وکەسانی تریش بۆمان دەگێڕنەوە لە عەمری کوڕی مورڕەوە کە پرسیاری کردووە لە ئەبو عوبەیدە: هَلْ تَذْكُرُ مِنْ عَبْدِ اللَّهِ شَيْئًا ؟ قَالَ مَا أَذْكُرُ مِنْهُ شَيْئًا. بڕوانە: السنن الكبرى / كتاب الديات / باب من قال هي أخماس وجعل أحد أخماسها بني المخاض دون بني اللبون / بە ژمارەی ١٥٩٤١، ومصنف ابن أبي شيبة / كتاب التأريخ / بە ژمارەی ٣٣٩٢٤.

٤) دووری ئەو جێگە ولاّتەی کە ڕاویەکەی لێ ژیاوە، لەو جێگە وولاّتەی کە ماموّستاکەی لێ ژیاوە.

٥) لە چەند ڕیوایەتێکی تردا دەرکەوتووە کە لە نێوان ڕاویەکە وئەو ماموّستایەی کە حەدیسەکەی لێ ڕیوایەت کردووە، کەسێك یان چەند کەسێکی تر هەن.

## حوکمی حەدیسی ( منقطع )

ئەو زانایانەی کە بە پێناسەی یەکەمیان وەرگرتووە، پێیان وایە کە حەدیسی (منقطع) حوکمی حەدیسی (مرسل)ی هەیە، بۆیە ئەوانەی کە فەرموویانە حەدیسی (مرسل) دەکرێت بە بەلّگە وپێی وەردەگیرێت، هەندێکیان پێیان وایە کە حەدیسی (منقطع)یش هەر دەکرێت بە بەلّگە وپێی وەردەگیرێت، وە ئەوانەش کە پێیان وایە کە حەدیسی مرسل ناکرێت بە بەلّگە وپێی وەرناگیرێت، ئەوە زیاتر پێیان وایە کە حەدیسی (منقطع)یش پێی وەرناگیرێت.(١)

بەلاّم ئەو زانایانەی کە بە پێناسەی دووەمیان وەرگرتووە، پێیان وایە کە حەدیسی (منقطع) حەدیسێکی (ضعیف)ە، هەر بۆیە ناکرێت بە بەلّگە وپێی وەرناگیرێت. چونکە نازانرێت ئەو کەسەی کە لە ڕشتەکەدا دیارنیە ولابراوە، حالّی چۆنە، ئایا کەسێکی متمانەدارە، یان نا؟ (٢)

---

(١) بڕوانە: قواطع الأدلة في الأصول، لأبي المظفر منصور بن محمد بن عبد الجبار السمعاني / ١ / ٣٩٢، وجامع التحصيل في أحكام المراسيل / ٩٦.

(٢) زانای پایەدار خەطیبی بەغدادی لە ماموّستاکەی ئیمامی بوخاری کە ناوی (محمد بن يحيى الذهلي)یە، بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ((ولا يجوز الاحتجاج الا بالحديث الموصل غير المنقطع)). بڕوانە: الكفاية في علم الرواية / ٢٠. هەروەها (ابن أبي حاتم) لە کتێبی (المراسیل)دا دەفەرموێت: ((سمعت أبي وأبو زرعة يقولان:...... ولا تقوم الحجة إلا بالأسانيد الصحاح المتصلة)) بڕوانە: المراسیل / ١ / ٦، وە ئیمامی بەیهەقی لە السنن الكبرى فەرمایشتێکی ئیمامی شافیعیمان بۆ دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: ((وَالْحَدِيثُ الْمُنْقَطِعُ لاَ يَكُونُ حُجَّةً)) بڕوانە: السنن الكبرى / كتاب السرقة / باب اختلاف الناقلين في ثمن المجن وما يصح منه وما لا يصح / حەدیسی ژمارە ١٦٩٥٢، هەروەها لە: كتاب السير / باب الرضخ لمن يستعان به من أهل الذمة على قتال المشركين / حەدیسی ژمارە ١٧٧٥٠.

# جۆری نۆزدەیەم

# حەدیسی (المُعْضَل)

واتە: حەدیسی (معضل) بەو حەدیسە دەوترێت کە دوو کەس لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا داکەوتبێت.

ئەم پێناسەیەی کە مامۆستا کردوویەتی بۆ حەدیسی (معضل) یەکێکە لەو پێناسانەی کە کراون بۆ ئەم جۆرە حەدیسە، کە ئەم پێناسەیە بەدوور نابێت لە ڕەخنە.

چونکە دیاری نەکردووە، ئایا ئەو دوو کەسەی کە داکەوتوون لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکە، لە سەرەتای ڕشتەکەوەن یان لە ناوەند یان لە کۆتایی، وە دیاریشی نەکردووە، ئایا دوو کەسەکە بەشوێن یەکەوەن یان بەشوێن یەکەوە نین. هەروەها دیاریشی نەکردووە، ئایا ئەگەر زیاد لە دوو کەس لە ڕشتەکە داکەوتبن، دەکرێت پێی بوترێت: (معضل) یان نا؟

بۆیە ئەم پێناسەیە لەلایەکەوە داگرەوەیە بۆ حەدیسی (معلّق) وەك پێشتر پێناسەمان کرد، وە داگرەوەشە بۆ حەدیسی (منقطع) بەتایبەتی ئەگەر دوو کەسە داکەوتووەکە بەشوێن یەکەوە نەبوون، وە لەلایەکی ترەوە ناڕوونە ئایا ئەگەر لە دوو کەس زیاتر لە ڕشتەکە داکەوتبن، بەم ناوەوە ناو دەبرێت.

بەلاّم ئێمە ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ئەو پێناسانەی کە زانایان کردوویانە بۆ ئەم جۆرە حەدیسە، دەبینین کە هەوڵیان داوە وەلاّمی ئەو ڕەخنە وپرسیارانە بدەنەوە، ئەوەتا:

شێخی شارەزووری و ئیمامی نەواوی دەفەرموون: ئەو حەدیسەیە کە دوان یان زیاتر لە کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەکەی داکەوتوون.(1)

ئەم پێناسەیەش هەمان ڕەخنەکانی سەرەوە ڕووی تێدەکەن، کە نازانرێت ئایا لە سەرەتای ڕشتەکەوەیە یان لە ناوەند یان لە کۆتایی، وە ناشزانرێت کە ئایا بەشوێن یەکەوەن یان نا؟ بەلاّم حافظی عێراقی وئیمامی سیوطی لە مانای ئەم پێناسەیەدا فەرموویانە: بەلاّم بەمەرجێك کە کەسە داکەوتوەکان بەشوێنی یەکەوە بن.(2)

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٣٤، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٦٩.

(٢) بڕوانە: شرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢١٦، والتقييد والإيضاح / ٨١، وتدريب الراوي / ١٦٩.

هەر بۆیە دواتر کە ئیمامی سەخاوی هاتووە، ئەو مەرجەی بۆ پێناسەکە زیاد کردووە وفەرموویەتی: ئەو حەدیسەیە کە دوان یان زیاتر لە کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەکەی بەشوێن یەکدا داکەوتوون.[1]

بەڵام ئەم فەرموودەیەش هێشتری ئەو ڕەخنەیەی لەسەر لانابات کە ئایا ئەگەر لە سەرەتای ڕشتەکەوە بێت، هەر پێی دەوترێت: (معضل)، کە ئێمە پێشتر وتمان: ئەم جۆرە حەدیسە پێی دەوترێت: (معلّق). بۆ وەڵامی ئەم ڕەخنەیە دەکرێت بوترێت: حەدیسی (معضل) و (معلّق) لەم حاڵەتەدا یەکدەگرنەوە. ئەگینا دەبێت پێناسەکە بەم جۆرەی لێ بکرێت: ئەو حەدیسەیە کە دوان یان زیاتر لە کەسەکانی دوای سەرەتای ڕشتەی گێڕانەوەکەی داکەوتوون.

بەڵام تاوەکو ئێستەش دیار نیە ئایا ئەگەر لە کۆتایی ڕشتەکەدا دوو کەس داکەوتبن، ئایا لەم جۆرە حەدیسە دەژمێردرێت یان نا؟

هەر بۆیە شێخی ئیبنو کەثیر هاتووە ووەڵامی ئەم پرسیارەشی بۆ داوینەتەوە وفەرموویەتی: هەر بە (معضل) دادەنرێت ئەو حەدیسەی کە یەکێك لە شوێنکەوتووی شوێنکەوتوان دەیداتە پاڵ حەزرەت.[2]

---

(١) بڕوانە: التوضیح الأبهر / ٤٤.

(٢) بڕوانە: الباعث الحثیث / ٤٤. زیاد لەوەش حافظی عێراقی و ئیمامی سیوطی فەرموویانە: جۆرێکی تری حەدیسی (معضل) ئەوەیە کە حەدیسەکە خۆی لە ئەصڵدا حەدیسی حەزرەت بێت، بەڵام بدرێتە پاڵ یەکێك لە شوێنکەوتوان، واتە: لە ڕشتەکەدا هەم حەزرەت وهەم ئەو هاوەڵەش کە لێیەوە ڕیوایەتی کردووە داکەوتوون. بڕوانە: ألفیة الحافظ العراقي في علوم الحدیث: هەردوو دێڕی (١٣٤ و ١٣٥) کە دەفەرموێت:

وَالمعْضَلُ: السَّاقِطُ مِنْـهُ اثْنَـانِ ... فَصَـاعِداً، وَمِنْـهُ قِسْمٌ ثَـانِ

حَذْفُ النَّبِيِّ وَالصَّحَـابِيِّ مَعَـا ... وَوَقْفُ مَتْنِهِ عَلَى مَـنْ تَبِعَـا

و ألفیة السیوطي في علم الحدیث: دێڕی (١٣٧) کە دەفەرموێت:

وَمِنْهُ حَذْفُ صَاحِبٍ وَالْمُصْطَفَى ... وَمَتْنُهُ بِـالتَّـابِعِيِّ وُقِفَـا

نموونەشیان بەو حەدیسە هێناوەتەوە کە ئەعمەش لە شەعبیەوە گێڕاویەتیەوە کە فەرموویەتی: يُقالُ للرجلِ في القيامةِ عَمِلْتَ كذا وكذا، فيقولُ ما عَمِلتُهُ. فيُخْتَمُ على فِيْهِ.....الخ فەرموویانە ئەم حەدیسە لە ئەصڵدا فەرموودەی حەزرەتە، وە ئەو هاوەڵەش کە شەعبی لێیەوە ڕیوایەتی کردووە، بریتیە لە ئەنەسی کوڕی مالیك، بەڵام ئەعمەش هاتووە هەم حەزرەت وهەم ئەنەسیشی باس نەکردووە، وحەدیسەکەی داوەتە پاڵ شەعبی، وەکو بڵێیت: فەرموودەی ئەو بووە. بڕوانە: شرح التبصرة والتذکرة / ١ / ٢١٨، وتدریب الراوي / ١٧١.

# حوكمی حەدیسی ( معضل )

بەو پێیەی كە لە باسی حەدیسی (منقطع)دا باسمان كرد، كە زانایان بە (ضعیف)یان داناوە، تەنها لەبەر ئەوەی كەسێك لە ڕشتەی گێڕانەوەكەیدا لابراوە، كەواتە دەكرێت لێرەدا زیاتر بڕیار بدرێت لەسەر (ضعیف)ی حەدیسی (معضل)، چونكە وەكو وتمان: دوو كەس لە ڕشتەكەیدا لابراون.

هەندێك لە زانایانیش فەرموویانە: حەدیسی (معضل) زۆر حاڵی خراپترە لە حەدیسی (منقطع)، وە ئەمیش زۆر حاڵی خراپترە لە حەدیسی (مرسل).

بەڵام بۆ نەهێشتنی گومان لەسەر ئەم فەرمایشتە هەندێك لەزانایان فەرموویانە: كاتێك حەدیسی (معضل) حاڵی لە حاڵی حەدیسی (منقطع) خراپترە، ئەگەر ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسە (منقطع)ەكە یەك كەسی لێ لابرابێت، ئەگینا ئەگەر دوو كەسی لێ لابرابێت، وبەشوێنی یەكدا نەبن، وەكو باسمان كرد، ئەوا هیچ جیاوازیەكیان نیە، ولەگەڵ یەك یەكسان دەبن.[(١)]

كەواتە ئەم جۆرە حەدیسەش هەر بە (ضعیف) دادەنرێت، وناكرێت وەكو بەڵگە بەكار بهێنرێت، مەگەر كاتێك كە لە جێگەیەكی ترەدا ڕیوایەت كرابێت، وناوی هەموو كەسەكانی ڕشتەكە بە تەواوی هاتبێت، ئەو كاتە بەپێی هاتنەجێ ونەهاتنەجێی مەرجەكانی حەدیسی (صحیح) و(حسن)، دەكرێت پشتی پێ ببەسترێت ووەكو بەڵگە بەكار بهێنرێت، یان بەكار نەهێنرێت.

---

(١) بڕوانە: النكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٥٨٢، وتدريب الراوي / ٢٥٤، وتوضيح الأفكار / ١ / ٣٢٩، وفتح المغيث / ١ / ١٧٩. بەڵام من پێم ڕاسترە ئەم فەرمایشتەیش هەروا بە ڕەهایی وەرنەگیرێت، چونكە ئەگەر حەدیسە (معضل)ەكە زیاد لە دوو كەس لە ڕشتەكەی داكەوتبێت، ئەوا هەر حاڵی لە حاڵی (منقطع) خراپترە.

# نموونەی حەدیسی ( معضل )

ئیمامی مالیك لە کتێبی (الموطأ)دا حەدیسێکمان بۆ دەگێڕێتەوە لە ئەبو هورەیرەوە، کە فەرموویەتی: حەزرەت فەرموویەتی: لِلْمَمْلُوكِ طَعَامُهُ وَكِسْوَتُهُ بِالْمَعْرُوفِ وَلَا يُكَلَّفُ مِنْ الْعَمَلِ إِلَّا مَا يُطِيقُ.(١)

هەردوو ئیمام، سیوطی وسەخاوی دەفەرموون: ئەم حەدیسە لەم ڕێگەیەوە بە (معضل) دادەنرێت، چونکە هەر ئیمامی مالیك خۆی لە جێگەیەکی تردا بێجگە لە (موطأ) ڕیوایەتی کردووە لە موحەممەدی کوڕی عەجلان، ئەویش لە باوکیەوە، ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە، کە حەزرەت وەهای فەرمووە.(٢)

لەمەوە دەردەکەوێت کە ئەو حەدیسەی (موطأ) لە نێوان ئیمامی مالیك وئەبو هورەیرەدا دوو کەس بەشوێن یەکدا لابراون.

جا بۆ نموونەی زیاتر لەسەر ئەم جۆرە حەدیسە زانایان فەرموویانە: ئەم جۆرە حەدیسە زیاتر لە سونەنی سەعیدی کوڕی مەنصور وکتێبەکانی ئیبنو ئەبی دنیادا بەرچاو دەکەوێت.(٣)

---

(١) موطأ مالك - رواية يحيى الليثي / كتاب الاستئذان / باب الأمر بالرفق بالمملوك / بە ژمارەی ١٧٦٩.

(٢) بڕوانە: تدريب الراوي / ١٧٠، وفتح المغيث / ١ / ١٧٧.

(٣) بڕوانە: تدريب الراوي / ١٧١، والرسالة المستطرفة لبيان مشهور كتب السنة المصنفة، لمحمد بن جعفر الكتاني / ٣٢.

........................ 		وَمَــــا أَتَى مُدَلَّســـاً نَوْعَانِ
الأَوَّلُ الإسْقَــاطُ للـشَّيْخِ وَأَنْ		يَنْقُـلَ عَمَّــــنْ فَوقَهُ بِعَنْ وَأَنْ
وَالثَّانِ لا يُسْقِطُهُ لاكِنْ يَصِفْ		أوْصَــافَهُ بِمَــــا بِهِ لاَ يَنْعَرِفْ

# جۆری بیستەم

## حەدیسی (المُدَلَّس)

واتە: ئەو حەدیسـەی کە (مدلّس)ە دوو جۆری هەیە:

- یەکەم ئەوەیە کە ڕاویەك ماموٚستاکەی خۆی لە ڕشتەکەدا لاببات، وپاشان لە ماموٚستای ژوور ئەوەوە حەدیسەکە ڕیوایەت بکات بە: (عن فلان، وأنّ فلاناً قال).
- دووەم ئەوەیە کە ماموٚستاکەی لە ڕشتەکە لانابات، بەڵام بەجۆرێك ناوی دەهێنێت کە بەو ناوەوە نەناسراوە.

ماموٚستای دانەر لە باسی ئەم جۆرە حەدیسەشدا نەهاتووە پێناسـەی حەدیسەکەمان بۆ بکات، هەر وەکو لە جێگەی تریش ئاماژەمان پێ کرد، بەڵکو ڕاستەوخۆ هاتووە حەدیسـەکەی دابەش کردووە بۆ دوو جۆر، وهەر یەکە لە دوو جۆرەکەی بە ئێمە ناساندووە، کە خۆی دەبوو وەکو لە سەرەتای هۆنراوەکەدا بەڵێنی دابوو کە هەر جۆرە حەدیسـێکی هێنا، پێناسـەکەشی لەگەڵدا بهێنێت، لەمەشدا ماموٚستا هەمان پەیڕەوی فەرموودەناسانی پێشـینەی هەڵبژاردووە، کە پێناسەی ئەم جۆرە حەدیسەیان نەکردووە، بەڵکو ڕاستەوخۆ دابەشیان کردووە، وپێناسـەی بەشەکانیان کردووە.(١)

هەروەها ماموٚستا لە دابەشکردنی ئەم جۆرە حەدیسە بۆ دوو جۆر، لەسەر پەیڕەوی ئەو زانایانە ڕۆیشتووە کە ئەم حەدیسەیان دابەشکردووە بۆ دوو جۆر،(٢) ئەگینا هەندێك لە زانایان

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٤٢، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٣٤، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٨١ – ١٨٥، والمنهل الروي / ٧٢، والمقنع في علوم الحديث / ١٥٤.

(٢) وەکو: (ابن الصلاح والنواوي وابن كثير وابن الملقّن وابن حجر العسقلاني).

دابەشیان کردووە بۆ سێ جۆر[1] یان زیاتر،[2] بەڵام زانایانی کۆمەڵەی یەکەم پێیان وایە هەموو جۆرەکانی تر هەر لەژێر ئەو دوو جۆرە سەرەکیەدا جێگەیان دەبێتەوە.[3]

## جۆرەکانی حەدیسی (مدلّس)

حەدیسی (مدلّس) هەروەکو مامۆستا ئاماژەی پێدا، دوو جۆری سەرەکی هەیە، ئەوانیش:

## یەکەم: تدلیس الإسناد

واتە شاردنەوە لە رِشتەی گێرِانەوەی حەدیسێك. ئەویش وەکو مامۆستا پێناسەی کردووە، ئەوەیە کە راویەك لە گێرِانەوەی حەدیسێکدا مامۆستاکەی خۆی ناو نەهێنێت، ولای ببات، وە حەدیسەکە لە کەسێکی سەرووی ئەوەوە رِیوایەت بکات، بە جۆرێك کە وەها بگەیەنێت لێی بیستووە. وەك ئەوەی کە بلێت: عن فلان، یان أنّ فلاناً، یان قال فلان. لە بریتی ئەوەی کە بلێت: سمعت فلاناً، یان حدثني فلان.

---

(١) وەکو: (الحافظ العراقي والصنعاني وبرهان الدين الأبناسي وسبط ابن العجمي). کە (تدليس التسوية)شیان زیاد کردووە. برِوانە: التقييد والإيضاح / ٩٥، وتوضيح الأفكار / ١ / ٣٣٧، والشذا الفياح / ١ / ١٧٤، والتبيين لأسماء المدلسين / ٣٢.

(٢) وەکو: (تدليس الإجازة، وتدليس الأسماء، وتدليس البلاد، وتدليس الصيغة، وتدليس العطف، وتدليس القطع، وتدليس المتون). بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هەر یەکە لەم جۆرانە برِوانە نوسراوەکانی (الدكتور ماهر ياسين الفحل): (أثر اختلاف المتون والأسانيد في اختلاف الفقهاء، وأثر علل الحديث في اختلاف الفقهاء، وبحوث في المصطلح، ومحاضرات في علوم الحديث). سەبارەت بەم جۆرانە شێخی صەنعانی فەرمایشتێکی شێخ ابراهیمی بیقاعی هێناوە کە لەسەر شەرحی ئەلفیەی عێراقی نووسیوێتی، لە حاشیەیەکی خۆیدا بە ناوی (النكت الوفية بما في شرح الألفية) کە دەفەرموێت: ئەگەر حافظی عێراقی مەبەستی ئەصلی تەدلیسە، ئەوە هەر دوو جۆرە، وەکو شێخی شارەزووری فەرموویەتی، ئەگینا لە سێ جۆریش زیاترە. برِوانە: توضيح الأفكار / ١ / ٣١٨.

(٣) برِوانە: النكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ١٥٨.

ئێستە لەم جۆرە حەدیسەدا کەسێك لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکە شاردراوەتەوە، چونکە ئەو کەسەی کە حەدیسەکەی لێوە ڕیوایەت کراوە، ئەو کەسە نیە کە ڕاویەکە حەدیسەکەی لێ بیستووە، بەڵکو ئەو کەسەی کە حەدیسەکەی لێ بیستراوە لابراوە وشاردراوەتەوە. هەر بۆیە بەم ناوەوە ناو نراوە.

ئەم پێناسەیەی مامۆستا یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ئەو پێناسانەیەی کە فەرموودەناسان کردوویانە بۆ ئەم جۆرە حەدیسە.

(ابن القطان) فەرموویەتی: ئەوەیە کە ڕاویەك حەدیسێك لە کەسێکەوە ڕیوایەت بکات کە حەدیسی تری لێ بیستبێت، بەڵام ئەو حەدیسەی لێ نەبیستووە، بەبێ ئەوەی باسی ئەوە بکات کە ئەو حەدیسەی لە ئەو بیستووە.[1]

شێخی شارەزووری وخەطیبی بەغدادی وئیبنو کەثیر بە پێناسەیەکی گشتگیر تر، فەرموویانە: ئەوەیە کە ڕاویەك حەدیسێك لە کەسێکەوە ڕیوایەت بکات، کە پێی گەیشتووە، بەڵام ئەو حەدیسەی لەو نەبیستووە، بەجۆرێك کە وەها بگەیەنێت لەوی بیستووە. یان حەدیسەکە لە کەسێکی هاوسەردەمی خۆی ڕیوایەت بکات، کە پێی نەگەیشتووە ونەیبینیوە، بەجۆرێك کە وەها بگەیەنێت بینیوێتی ولێی بیستووە.[2]

زانایان بۆ نموونەی ئەم جۆرە تەدلیسە ئەو فەرمایشتەی سوفیانی کوڕی عویەینەیان هێناوەتەوە کە فەرموویەتی: (قَالَ الزُّهْرِيّ). ئەوانەی کە لە خزمەتیدا بوون، عەرزیان کرد: زوهری خۆی بۆی گێڕانەوە؟ ئەویش پاش کەمێك لە بێدەنگبوون فەرمووی: نەخێر، نە لە زوهریم بیستووە، ونە لەو کەسەش کە زوهری لێی بیستووە، ئەوەی کە بۆی گێڕامەوە (عبد الرزاق) بوو، ئەویش لە (مَعمَر)ەوە، ئەو لە زوهریەوە گێڕاوێتیەوە.[3]

---

(١) بڕوانە: بيان الوهم والإيهام / ٥ / ٤٩٣.

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٤٢، والكفاية في علم الرواية / ٢٢، والباعث الحثيث / ٤٦.

(٣) بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ١٦٤ – ١٧٤، ومقدمة ابن الصلاح / ٤٢، والكفاية في علم الرواية / ٣٥٩، والباعث الحثيث / ٤٦، وتدريب الراوي / ١٨٢، وجامع التحصيل / ٩٧ – ٩٨. ئیمامی حاکم لە (معرفة علوم الحديث) چەند نموونەیەکی تریشی هێناوەتەوە، بۆ زانیاری ئاگات لێیان بێت باشترە.

# دووەم: تدليس الشيوخ

واته شاردنەوەی مامۆستا، ئەویش وەکو مامۆستا فەرموویەتی، بەوە دەبێت کە ڕاویەکە مامۆستاکەی خۆی لە ڕشتەی گێڕانەوەکەدا لانابات، بەڵکو حەدیسەکەش لە ئەو ڕیوایەت دەکات، بەڵام بە جۆرێك ناوی دەهێنێت ووەسفداری دەکات، کە بەو جۆرە نەناسراوە لەناو زانایاندا.

ئێستە لەم جۆرە حەدیسەدا جۆرە شاردنەوەیەکی تێدایە بۆ ئەو کەسەی کە حەدیسەکەی لێوە ڕیوایەت کراوە، چونکە بەجۆرێك ناوی هێنراوە، کە پێی نەناسراوە، کە ئەم جۆرە لە چەند شێوازێکدا خۆی دەبینێتەوە:

- وەکو ئەوەی کە کەسێك بە ناوی خۆیەوە ناسراوبێت، بەڵام یەکێك حەدیسێکی لێ ڕیوایەت بکات، و بڵێت: باوکی فلاڵن بۆی گێڕامەوە.
- وەکو ئەوەی کە کەسێك بەناوی شارێکەوە ناسراوبێت، بەڵام بە ناوی عەشرەتەکەیەوە ناو ببرێت.
- وەکو ئەوەی کەسێك بە سیفەتێك بەناوبانگ بێت، بەڵام بە سیفەتێکی تردەوە حەدیسەکەی لێ ڕیوایەت بکرێت.
- هەندێك لە زانایان فەرموویانە: ئەگەر چەند کەسێك هەمان ناویان هەبوو، بەڵام هەر یەکەیان بە ناوی باوکیان یان باپیرەیان یان بە سیفەتێکی تایبەتی لەوانی تر جیادەکرایەوە، خۆ ئەگەر کەسێك تەنها بە ناوەکەی یان بە ناوی خۆی وباوکی یان خۆی وباوکی وباپیری حەدیسی لێ بگێڕێتەوە، وسیفەتەکەی لەگەڵدا باس نەکات، ئەمەش هەر بە (تدليس الشيوخ) دادەنرێت.

# پۆلین کردنی ئەو کەسانەی کە تەدلیسیان کردووە

زانایان سەبارەت بە پۆلین کردنی ئەو کەسانەی کە تەدلیسیان کردووە، هەستاون بە دابەشکردنیان بۆ پێنج کۆمەڵە: [1]

١) ئەو کەسانەی کە زۆر بە کەمی نەبێت، وەسفدار نەکراون بەوەی کە تەدلیسیان کردووە، بەجۆرێك کە نابێت لە ڕیزی تەدلیسکارەکاندا بژمێردرێن، وەکو یەحیای کوڕی سەعیدی ئەنصاری، وهیشامی کوڕی عوروە، وموسای کوڕی عوقبە.

٢) ئەو کەسانەی کە پێشەوایانی حەدیس گومانی تەدلیسیان لێ کردوون، وە حەدیسی (صحیح)یشیان لێ ڕیوایەت کردوون، ئەگەرچی بەڕاشکاوی نەشیان وتبێت حەدیسەکەیان بیستووە، ئەویش تەنها لەبەر پایەبەرزی وکەمی تەدلیس کردنیان، وەکو سوفیانی ثەوری، یان ئەو کەسانەی کە تەنها تەدلیسیان لە کەسی متمانەدارەوە کردووە، وەکو سوفیانی کوڕی عویەینە.

٣) ئەو کەسانەی کە تەدلیسیان زۆر کردووە، ئەمانە زانایانی حەدیس بە حەدیسی ئەم کەسانەیان وەرنەگرتووە، مەگەر بەڕاشکاوی وتبێتیان: بیستوومانە. بەڵام هەندێك لە

---

(١) بڕوانە: جامع التحصيل في أحكام المراسيل / ١١٣ – ١١٤، والنكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٦٣٦ – ٦٥٠. جا بە مەبەستی ناسینی ئەو کەسانەی کە تەدلیسیان کردووە، وسەبارەت بە پۆلین کردنیان زانایان چەندین کتێبیان داناوە، لەوانە:

١) ذكر المدلسين، دانراوی: أبو عبد الرحمن النسائي.

٢) التبيين لأسماء المدلسين، دانراوی: الخطيب البغدادي.

٣) المدلسين، دانراوی: أبو زرعة العراقي.

٤) التبيين في أسماء المدلسين، دانراوی: إبراهيم بن محمد بن سبط ابن العجمي.

٥) تعريف أهل التقديس بمراتب الموصوفين بالتدليس، کە ناسراوە بە (طبقات المدلسين) دانراوی: ابن حجر العسقلاني.

٦) أسماء المدلسين، دانراوی: عبد الرحمن السيوطي.

زانایان بە ڕەهایی حەدیسی ئەم جۆرە کەسانەیان ڕەد کردۆتەوە. هەندێکیشیان بە ڕەهایی قبوڵیان کردووە وپێیان وەرگرتووە، وەکو ئەبو زوبەیر موحەممەدی کوڕی موسلیمی مەککی.

٤) ئەو کەسانەی کە زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە هیچ حەدیسێکیان پێی وەرناگیرێت، تەنها ئەوانەیان نەبێت کە بەڕاشکاوی وتوویانە: بیستوومانە. ئەمیش لەبەر ئەوەی کە تەدلیسیان زۆر کردووە لە کەسانێکی (ضعیف) ونەناسراوەوە.

٥) ئەو کەسانەی کە بێجگە لە تەدلیس، بەهۆی شتێکی ترەوە بە (ضعیف) دانراون، تەنها ئەوانەیان نەبێت کە بەهۆی کەمی (ضعیف)یانەوە متمانەیان پێدراووە، وەکو عەبدوڵای کوڕی لوهەیعە.

## هۆکارەکانی تەدلیس کردن

فەرموودەناسان باسی چەند هۆکارێکیان کردووە کە پاڵ بە کەسێکەوە دەنێن بۆ ئەوەی تەدلیس ئەنجام بدات، لەوانە: (1)

- (ضعیف)ی یان بێ متمانەیی مامۆستاکە، جا لەم کاتەدا ڕاویەکە ناوی ئەو مامۆستایە ناهێنێت، چونکە دەزانێت ئەگەر ناوی بهێنێت، حەدیسەکەی لێ وەرناگیرێت.
- کەمی تەمەنی مامۆستاکە، کە ئەمەش وادەکات ڕاویەکە ناوی نەهێنێت، چونکە بە ناوهێنانی ئەو مامۆستایە، ئەم هەست بە بچووکبوونەوە ونوقسانی دەکات.
- ڕاویەکە زۆرێك لە حەدیسەکانی ئەو مامۆستایەی ڕیوایەت کردووە، بۆیە نایەوێت کەسی بەرامبەر وبیسەر ماندوو وبێ تاقەت بکات بە دووبارە کردنەوەی ناوی مامۆستاکەی. بۆیە یان لایدەبات، یان ناوەکەی دەگۆڕێت.

---

(١) بڕوانە: الكفاية في علم الرواية / ٣٥٧، ومقدمة ابن الصلاح / ٤٤، وجامع التحصيل / ١٠٤، والنكت على مقدمة ابن الصلاح / ٢ / ٦٥٠ - ٦٥٧، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٨٧ - ١٨٨، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٦٨، والمنهل الروي / ٧٣.

- ڕاویەکە زۆرێك لە حەدیسەکانی ئەو مامۆستایەی ڕیوایەت کردووە، بەلاّم هەندێکیشی لەدەست دەرچووە، بۆیە نایەوێت لە کەسانێکی ڕیوایەت بکات، کە ئەوان ڕاستەوخۆ لە مامۆستاکەیان بیستووە. ئەمەش وا دەکات کە ناوی ئەو کەسانە نەهێنێت لە ڕیوایەتی حەدیسەکەدا.
- ڕاویەکە دەیەوێت گومانی وەها بۆ کەسی بەرامبەر درووست بکات کە ئەو حەدیسە ڕشتەکەی کورتە (الإسناد العالي)، واتە بە کەمترین کەس دەگاتەوە بە خاوەنەکەی.
- ڕاویەکە دەیەوێت گومانی وەها بۆ کەسی بەرامبەر درووست بکات کە ئەو لای چەندین مامۆستا حەدیسی وەرگرتووە، واتە بۆ ئەوەی پێی بڵێن: زۆر گەڕاوە ولای زۆر مامۆستا دەرسی خوێندووە.
- هەندێك جار هۆکاری ترسی سیاسی یان درووست بونی فیتنە وناکۆکی وەهای کردووە کە قوتابی نەیوێراوە ناوی مامۆستاکەی ببات.
- هەندێك جار دواکەوتنی کاتی مردنی مامۆستاکە وا دەکات کە قوتابیەکە ناوی نەبات، چونکە کەسانێکی تر لای ئەو مامۆستایە لە کۆتایی تەمەنیدا دەرسیان خوێندووە، ئێستە ئەم پێی ناخۆشە کە بڵێن: ئەمیش لەگەڵ ئەو کەسانەدا قوتابی یەك مامۆستا بوون !

## حوکمی حەدیسی ( مدلّس )

سەرەتا، تەدلیس کردن خۆی لەخۆیدا شاردنەوەی ڕاستیە، یان هەوڵێکە بۆ شاردنەوەی ڕاستی.

جا هەروەکو چۆن زانایان جیاوازیان کرد لە نێوان هەر دوو جۆرەکەی حەدیسی (مدلّس)دا، هەروا جیاوازیشیان کردووە لە نێوان حوکمی هەریەکە لەو دوو جۆرەدا.

سەبارەت بە جۆری یەکەم، فەرموویانە: تەدلیسی ئیسناد زۆر ناپەسەندە. هەربۆیە زۆرێك لە زانایان فەرمایشتی توند ورەقیان هەیە لەسەری.

ئیمامی شافیعی لە شوعبەی کوڕی حەججاجەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: تەدلیس برای درۆیە.[1]

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەندێکی تر لە زانایان مەسەلەکەیان بەو توندیە وەرنەگرتووە، کە ئەمەش وەهای کردووە ڕای جیاواز درووست ببێت سەبارەت بە قبوولکردن وقبوولنەکردنی ئەو حەدیسەی کە تەدلیسی تێدا کراوە:[2]

- هەندێك لە زانایان فەرموویانە: بە هیچ جۆرێك حەدیسی ئەو کەسانە قبوول ناکرێت کە تەدلیسیان کردووە، ئیتر باوەکو وتبێتی: لە فلانە کەسم بیستووە. بەلای ئەم زانایانەوە تەدلیس کردن یەکێکە لە هۆکارەکانی جەرحی ڕاوی، ووەرنەگرتنی حەدیس لێیەوە.
- هەندێکی تر فەرموویانە: ئەم جۆرە حەدیسە بە ڕەهایی قبوول دەکرێت وپێی وەردەگیرێت. وە فەرموویانە بۆ قبوولکردنی ئەم جۆەر حەدیسە هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ حەدیسی (مرسل)دا نیە.

---

(١) بڕوانە: حلیة الأولیاء / ٩ / ١٠٧، ومقدمة ابن الصلاح / ٤٣، والکفایة في علم الروایة / ٣٥٥. هەر بۆیە زانایان وەها وەسفی ئەم زانا پایەبەرزە دەکەن، کە زۆر توندو تیژ بووە بەرامبەر بە تەدلیس کردن، دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: ((زینا کردنم لە تەدلیس کردن پێ باشترە !)) وە لە جێگەیەکی تردا فەرموویەتی: ((لە ئاسمانەوە بەرم بدەنەوە پێم باشترە لەوەی کە تەدلیس بکەم.)) هەروەها هەندێکی تر لە زانایان هەمان بۆچوونی ئەویان هەبووە، ئەوەتا (حسن)ی کوڕی عەلی لە ئەبو ئوسامەوە دەگێڕێتەوە، کە فەرموویەتی: ((خوا ماڵی ئەو کەسانە وێران بکات کە تەدلیس دەکەن، ئەوانە بەلای منەوە درۆزنن.)) عەبدوڵای کوڕی موبارەك فەرموویەتی: ((ئەگەر لە ئاسمانەوە بەربېمەوە پێم باشترە لەوەی کە حەدیسێك تەدلیس بکەم.)) وەکیعی کوڕی جەڕاح فەرموویەتی: ((ئێمە ڕازی نابین بەوەی کە تەدلیس لە پۆشاك وجل وبەرگدا بکەین، ئیتر چۆن ڕازی ببین کە تەدلیس لە حەدیسدا بکەین !)) خەطیبی بەغدادی ئەم فەرمایشتانەی هێناوە لە: الکفایة في علم الروایة.

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٤٣، والکفایة في علم الروایة / ٣٦١، والتقریب بشرح تدریب الراوي / ١٨٥ - ١٨٧، وتوضیح الأفکار / ١ / ٣٥١، والنکت علی مقدمة ابن الصلاح / ٢ / ٦٣٢ – ٦٣٧، ومنحة المغیث / ٢٦٩ – ٢٧٠، وشرح الزرقاني علی البیقوني / ١٦٢ - ١٦٣.

- هەندێکیش جیاوازیان کردووە لە نێوان دوو حاڵەتدا، وفەرموویانە: ئەگەر ئەو کەسەی کە تەدلیسەکەی کردووە، بەزۆری تەدلیسی لە کەسانی متمانەدار کردبێت، ئەوە بە حەدیسەکەی وەردەگیرێت، وە ئەگەر بە زۆری لە کەسانی بێ متمانە تەدلیسی کردبوو، ئەوا حەدیسەکەی قبووڵ ناکرێت.
- هەندێکیش بە جۆرێکی تر فەرموویانە: ئەگەر راویەکە بە جۆرێك حەدیسەکەی رِیوایەت کردبێت، کە لەو کەسەی بیستووە، ئەوە حەدیسەکەی وەردەگیرێت، بەڵام ئەگەر بە جۆرێك بوو کە ئەگەری بیستن ونەبیستنیشی هەبوو، ئەوا قبووڵ ناکرێت.

سەبارەت بە جۆری دووەمیش فەرموویانە[1]: ناپەسەندی ئەم جۆرەیان لە جۆری یەکەم کەمترە،[2] ولە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر دەگۆرِێت بەگوێرەی ئەو هۆکارەی کە پاڵی بە کەسەکەوە ناوە بۆ ئەوەی تەدلیس بکات:

- ئەگەر تەنها لەبەر بچووکی وکەمی تەمەنی مامۆستاکە بوو، یان لەبەر ئەوە بوو کە لە پلەی گێرِانەوەی حەدیسدا لە خۆی کەمترە ولەخوارترە، ئەوا تەنها ناپەسەندە وبەس.

(١) بروانة: مقدمة ابن الصلاح / ٤٤، والباعث الحثيث / ٤٧، وجامع التحصيل / ١٠٤، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٤٠، وتوضيح الأفكار / ١ / ٣٦٨، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٦٨، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ١٨٧.

(٢) چونکە ژمارەی ئەو کەسانەی کە تەدلیسیان لە جۆری یەکەم کردووە گەلێك زیاترن لە ژمارەی ئەوانەی کە تەدلیسیان لە جۆری دووە کردووە. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی تریشەوە، تەدلیسی جۆری دووەم زانایان دەتوانن ئەو کەسە بناسنەوە کە ناوەکەی گۆرِاوە، یان بە شێوەیەك ناوبراوە کە نەناسرێتەوە، بەڵام ئەوەی جۆری یەکەم کەسەکە هەر ناونەبراوە، بۆیە زۆر ئەگەری ئەوەی هەیە کە نەبینرێتەوە ونەناسرێتەوە. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: مەگەر کەسێك کە شارەزایی نەبێت سەبارەت بەو کەسانەی کە حەدیسیان رِیوایەت کردووە، ناویان چیە ؟ حاڵیان چۆنە ؟ خەڵکی کوێن ؟ چی پیشەیەکیان هەبووە ؟ بەچی ناسراو بوون ؟ کونیەیان هەبووە ؟ جا ئەگەر هەر کەسێك ئەم زانیاریانەی لەسەر راویەکان هەبێت، ئیتر کەسی لەلا نەناسراو نابێت، کە ئەمەش نزمترین پلەیە لە پلەی (محدّث). بروانە: النكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ١٥٩، وتوضيح الأفكار / ١ / ٣٧١.

● ئەگەر لەبەر نامتمانەیی و(ضعیف)ی مامۆستاکە بوو، ئەوا هەر زۆر ناپەسەندە وحەرامە کە بیشارێتەوە، چونکە ئەو کاتە نازانرێت حاڵی چۆنە، یان گومانێك درووست دەکات لەسەر ئەوەی کە ڕەنگە کەسێکی متمانەدار بێت.

خەطیبی بەغدادی فەرموویەتی: هۆکاری تەدلیس کردنەکە هەرچی بێت، ئەو حەدیسە ناکرێت وەکو بەڵگە بەکار بهێنرێت وپێی وەربگیرێت. [1]

(١) بڕوانە: الكفاية في علم الرواية / ٣٧٠.

# جۆری بیست و یه‌که‌م

# حه‌دیسی (الشاذ)

واته: ئه‌و حه‌دیسه‌ی که که‌سێکی متمانه‌دار ڕیوایه‌تی کردووه به پێچه‌وانه‌ی ئه‌وه‌ی که کۆمه‌ڵێك متمانه‌داری تر ڕیوایه‌تیان کردووه، پێی ده‌وترێت: (شاذ).

ئه‌م پێناسه‌یه‌ی که مامۆستا هه‌ڵی بژاردووه بۆ ئه‌م جۆره حه‌دیسه، هه‌مان ئه‌و پێناسه‌یه‌یه که ئیمامی شافیعی کردوویه‌تی بۆی، وه‌کو ده‌گێڕنه‌وه که فه‌رموویه‌تی: حه‌دیسی (شاذ) ئه‌وه نیه که ته‌نها که‌سێکی متمانه‌دار ڕیوایه‌تی کردبێت، وکه‌سی تر ڕیوایه‌تی نه‌کردبێت، به‌ڵکو ئه‌و حه‌دیسه‌یه که که‌سێکی متمانه‌دار ڕیوایه‌تی بکا وموخالیف بێت بۆ ئه‌وه‌ی که خه‌ڵکی ڕیوایه‌تیان کردووه. یان که‌سانێکی متمانه‌دار حه‌دیسێك ڕیوایه‌ت بکه‌ن، پاشان یه‌کێکیان لێیان جیاببێته‌وه وموخالەفه‌یان بکات.[1]

به‌ڵام ئه‌مه ته‌نها پێناسه نیه که کرابێت بۆ ئه‌م جۆره حه‌دیسه، به‌ڵکو:

- ئیمامی حاکیم فه‌رموویه‌تی: ئه‌و حه‌دیسه‌یه که ته‌نها که‌سێکی متمانه‌دار ڕیوایه‌تی کردووه.[2]

---

(١) بڕوانه: معرفة علوم الحديث / ١٨٣، والكفاية في علم الرواية / ١٤١، ومقدمة ابن الصلاح / ٤٤. جا زانایان له مانای ئه‌م فه‌رمایشته‌ی ئیمامی شافیعیه‌دا فه‌رموویانه: مه‌رج نیه موخالەفه‌ی چه‌ند که‌سێکی متمانه‌دار بکرێت، به‌ڵکو ده‌گونجێت که موخالەفه‌کراوه‌که ته‌نها یه‌ك که‌سیش بێت، به‌ڵام متمانه‌دارتر بێت له‌و که‌سه‌ی که موخالەفه‌که‌ی کردووه. بڕوانه: النكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ١٠٦، وفتح المغيث / ١ / ٢٩، وتوجيه النظر / ١ / ٥١٢.

(٢) بڕوانه: معرفة علوم الحديث / ١٨٣.

- (أبو يعلى الخليلي القزويني) فەرموویەتی: ئەو حەدیسەیە کە تەنها یەك کەس ڕیوایەتی کردووە.[1]

**لەم سێ پێناسەیەوە دەردەکەوێت کە، ئیمامی شافیعی دوو مەرجی داناوە بۆ ئەم جۆرە حەدیسە:**

١) دەبێت موخالەفە هەبێت.

٢) دەبێت کەسێکی متمانەدار کردبێتی.

وە ئیمامی حاکیم تەنها یەك مەرجی داناوە، ئەویش ئەوەیە کە تەنها کەسێکی متمانەدار ڕیوایەتی کردبێت، ئیتر ئاماژەی بەوە نەداوە کە ئایا موخالەفە هەیە یان نا.

هەروەها خاوەنی پێناسەی سێیەمیش تەنها یەك مەرجی داناوە، ئەویش ئەوەیە کە تەنها یەك کەس ڕیوایەتی بکات، ئیتر ئەو کەسە متمانەدار بێت یان نا، وە موخالەفە هەبێت یان نا.

شێخی شارەزووری و(ابن كثير) فەرموویانە: ئەو پێناسەیەی کە ئیمامی شافیعی کردوویەتی پێناسەیەکی ڕاست ودوور لە ڕەخنەیە. چونکە بەپێی دوو پێناسەکەی تر چەندین حەدیس هەن کە تەنها یەك کەسی متمانەدار ڕیوایەتی کردوون، ولەگەڵ ئەوەشدا زانایان بە (صحيح)یان داناون، بگرە هەندێکیشیان لە صەحیحی بوخاری وموسلیمدا هاتوون، وەکو حەدیسی « إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ ». وە حەدیسی: أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) نَهَى عَنْ بَيْعِ الْوَلَاءِ وَهِبَتِهِ. کە تەنها عەبدوڵای کوڕی دینار لە ئیبنو عومەرەوە ڕیوایەتی کردووە. وە حەدیسی: أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) دَخَلَ مَكَّةَ وَعَلَى رَأْسِهِ مِغْفَرٌ. کە تەنها ئیمامی مالیك لە زوهریەوە ڕیوایەتی کردووە. جا نموونەی ئەم حەدیسە غەریبە (صحيح)انە زۆرن. ئیمامی

(١) بڕوانە: الإرشاد في معرفة علماء الحديث / ١ / ١٧٦.

موسلیم فەرموویەتی: زوهری نزیکەی نەوەد حەدیسی هەیە لە حەزرەتەوە کە خۆی بە تەنها ڕیوایەتی کردوون.(١)

شافیعی فەرمووی: گەر کەسێ مەوثوق — بە پێچەوانەی خەلکانی مەرمووق
ڕیــوایەی حەدیس بکـــــا وبیهێنێ — پێی بلێ (شاذ)ە وهیچ دامەمێنێ
موخالـــەفە لای (حاکم) مەرج نیـــە — ڕاوی یەك کەســی مەوثوق کافیە
(خەلیلی) بۆ نـــــەم حەدیســـە ئەلێ — یەك ڕاوی بەسە وتۆش بلێ: بەلێ
لـــەم فەرمــوودانە وتەی ڕاست تریــن — یەکەمــە، لەلای زانا، بەیەقیـــن

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٤٤، والباعث الحثیث / ٤٨ - ٤٩. بەلام ئەگەر چاو بگێڕین بە کتێبی (المستدرك)ی ئیمامی حاکمدا دەبینین هەندێك جار وشەی (شاذ وصحیح) بەیەکەوە کۆدەکاتەوە بۆ یەك حەدیس، ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەو زاراوەی (شاذ)ە بەلای ئەوەوە جیاوازە لەوەی کە بەلای زانایانەوە بەکار دەهێنرێت، چونکە ئەگەر وا نەبێت، ناکرێت ئەو دوو زاراوەیە بەیەکەوە کۆبکرێنەوە، چونکە ئەگەر حەدیس (شاذ) بوو، ئیتر نابێت (صحیح) بێت. کەواتە زاراوەی (شاذ) بەلای ئیمامی حاکمەوە بۆ حەدیسی غەریبیش بەکار هاتووە. بە بەلگەی ئەوەی کە لە (کتاب الإیمان)دا لەسەر حەدیسی ژمارە (٥٢) فەرموویەتی: ڕەنگە کەسێك وەها گومان ببات، کە دەقی ئەم حەدیسە (شاذ)ە، بەلام باوەکو تەماشای هەردوو کتێبی صەحیحی بوخاری وموسلیم بکات، تاوەکو ئەوەندە دەقی تری دەست بکەوێت، کە تەنها لە یەك ڕێگەوە ڕیوایەت کراون، کە سەری لێیان سوور بمێنێت، ئەوجا ئەمەش قیاس بکاتە سەر ئەوان. هەروەها بڕوانە / کتاب الطهارة / حەدیسی ژمارە ٦٤٢، وە کتاب الإمامة وصلاة الجمعة / باب التأمین / حەدیسی ژمارە ١٠١٩، وە کتاب الجمعة / حەدیسی ژمارە ١٠٢٧. هەروەها خەلیلیش بەو پێیەی کە قوتابی ئیمامی حاکم بووە، ئەویش هەر لەسەر هەمان بۆچوون بووە، کە زاراوەی (شاذ) بۆ حەدیسی غەریب بەکار دێت، بەلام بە فراوانتر، بۆیە دەکرێت لەگەل زاراوەی (صحیح)دا بۆ یەك حەدیس بەکار بهێنرێن وکۆببنەوە. ئەوەتا لە کتێبی (الإرشاد في معرفة علماء الحدیث)دا لەبارەی ئەو حەدیسانەی کە یەکێك لە مامۆستاکانی ئیمامی مالیك، بە ناوی (العلاء بن عبد الرحمن بن یعقوب) ڕیوایەتی کردووە، لەسەر حەدیسی: (إذا کان النصف من شعبان فلا صوم حتی رمضان) فەرموویەتی: ئیمامی موسلیم لە کتێبەکەی خۆیدا چەندین حەدیسی مەشهووری جگە لەمە، وچەندین حەدیسی (شاذ)ی ئەم کەسەی هێناوە. بڕوانە: الإرشاد في معرفة علماء الحدیث / ١ / ٢١٨ – ٢١٩. کە ئەمەش بەلگەیە لەسەر ئەوەی کە بەلای ئەویشەوە هەردوو زاراوەی (صحیح وشاذ) بەیەکەوە کۆدەبنەوە. جا بۆ تێگەیشتنی زیاتر لە هەرسێ پێناسەکە وچۆنێتی تەوفیق خستنە نێوانیان بڕوانە: علوم الحدیث في ضوء تطبیقات المحدثین النقاد، الدکتور حمزة الملیباري / ١٢٥ – ١٣٦.

# جۆرەكانی حەدیسی ( شاذ )

وەكو لە پێناسە ڕاستەكەی ئەم جۆرە حەدیسەوە دەردەكەوێت، یەكێك لە مەرجەكانی ئەوەیە كە موخالەفەی تێدابێت، جا ئەو موخالەفەیە دەكرێت لە دەقی حەدیسەكەدا بێت، وە دەشكرێت كە لە سەنەد ورشتەی گێڕانەوەی حەدیسەكەدا بێت، وە موخالەفەكەش یان بەوە دەبێت كە دەق یان ڕشتەی حەدیسەكە زیادەیەكی تێدایە، یان نوقسانیەكی تێدایە. كەواتە دەكرێت بڵێین: حەدیسی (شاذ) دوو جۆری سەرەكی هەیە، كە هەریەكەیان دوو لقیان لێ دەبێتەوە، بەم شێوەی خوارەوە:

## (١) (شاذ) لە دەقی حەدیسەكەدا

وەكو ئەو حەدیسەی كە هەردوو ئیمامی (أبو داود والترمذي) ڕیوایەتیان كردووە لە عبد الواحدی كوڕی زیادەوە، ئەویش لە ئەعمەشەوە ئەویش لە ئەبو صالیحەوە ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە، كە حەزرەت فەرموویەتی: « إِذَا صَلَّى أَحَدُكُمُ الرَّكْعَتَيْنِ قَبْلَ الصُّبْحِ فَلْيَضْطَجِعْ عَلَى يَمِينِهِ »[١]

ئیمامی بەیهەقی فەرموویەتی: (عبد الواحد) لە گێڕانەوەی ئەم حەدیسەدا موخالەفەی قوتابیە متمانەدارەكانی تری ئەعمەشی كردووە، كە گوایە ئەمە فەرموودەی حەزرەتە، بەڵام ئەوان وەهایان گێڕاوەتەوە كە ئەمە كردەوەی حەزرەتە، واتە حەزرەت وەهای نەفەرمووە، بەڵكو وەهای كردووە.[٢]

---

(١) سنن أبي داود / التطوع / باب الاضطجاع بعدها (سنة الصبح) / حەدیسی ژمارە ١٢٦٣، وسنن الترمذي / أبواب الصلاة / الاضطجاع بعد ركعتي الفجر / حەدیسی ژمارە ٤٢٠.

(٢) بڕوانە: النكت على مقدمة ابن الصلاح / ٣ / ٧١٤، وتدريب الراوي / ١٩٢، وتوجيه النظر / ١ / ٥١٤.

یان وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی دارەمی لە موسای کوڕی عەلییەوە[(١)] ئەویش لە باوکیەوە، ئەویش لە عوقبەی کوڕی عامرەوە، کە حەزرەت فەرموویەتی: « يَوْمُ عَرَفَةَ، وَأَيَّامُ التَّشْرِيقِ عِيدُنَا أَهْلَ الإِسْلاَمِ، وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ »[(٢)]

زانایان فەرموویانە: ئەم حەدیسە بەم دەقە تەنها لە ڕێگەی موسای کوڕی عەلییەوە هاتووە، ئەگینا هەموو ئەو کەسانەی کە ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردووە، هیچیان باسی ڕۆژی عەرەفەیان نەکردووە.[(٣)]

## (٢) (شاذ) لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا

وەکو ئەو حەدیسەی کە هەرسێ ئیمامان (البيهقي والترمذي وابن ماجة) لە ڕێگەی سوفیانی کوڕی عویەینەوە ئەویش لە عەمری کوڕی دینارەوە ئەویش لە عەوسەجەوە ئەویش

---

(١) ئەم ناوە هەم بە عەلی وهەم بە عولەیی خوێنراوەتەوە، ئیمامی (ترمذي) پاش ئەوەی کە حەدیسەکەی هێناوە فەرموویەتی: خەڵکی عێراق دەڵێن (مُوْسَى بنُ عَلِيّ)، وە خەڵکی میصریش دەڵێن (مُوْسَى بنُ عُلَيّ). ئەوجا دەفەرموێت: لە قوتەیبەم بیستووە، کە وتوویەتی لە (لیث)ی کوڕی سەعدم بیستووە، کە وتویەتی: موسای کوڕی عەلی وتوویەتی: ڕازیم نیە هیچ کەسێك ناوی باوکم بچووك بکاتەوە. واتە لە عەلییەوە بیکات بە عولەیی، کە لە زمانی عەرەبیدا بەو جۆرە بچووك دەکرێتەوە.

(٢) سنن الدارمي / كتاب الصوم / باب في صيام يوم عرفة / حەدیسی ژمارە ١٧٦٤.

(٣) بڕوانە: النكت على مقدمة ابن الصلاح / ٢ / ٦٨٧ - ٦٨٨، وتوجيه النظر / ١ / ٥١٤، وفتح المغيث / ١ / ٢١٨ – ٢١٩، وشرح شرح نخبة الفكر / ١ / ٣٣٤. زانای پایەبەرز (ملا علي القارئ) لەسەر ئەم حەدیسە فەرموویەتی: ڕەنگە کەسێك بپرسێت: باشە چۆن ئەم حەدیسە بە (شاذ) دابنرێت ؟ خۆ هەریەکە لە (ابن خزيمة وابن حبان والحاكم) بە (صحيح)یان داناوە، وە ئیمامی حاکم فەرموویەتی: إنه على شرط مسلم. وە ئیمامی (ترمذي)ش فەرموویەتی: حديث حسن صحيح !!! ئەوجا لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا دەفەرموێت: ئەوانە تەنها تەماشای ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەیان کردووە، وئاگایان لەو زیادەیە نەبووە کە لە دەقی حەدیسەکەدا زیاد کراوە، بۆیە بەو جۆرە بڕیاریان بەسەر حەدیسەکەدا داوە، ئەگینا وەکو وتمان دەقی حەدیسەکە بەو زیادەوە (شاذ)ە.

لە عەبدولاَی کورِی عەبباسەوە گێرِاویانەتەوە، کە پیاوێك لە سەردەمی حەزرەتدا وەفاتی کردبوو، تەنها کەسێکی لەپاش بەجێمابوو کە پێشتر بەندەی ئەو پیاوە بووە وئازادی کردووە، حەزرەتیش فەرمووی: ئایا کەسی لەپاش بەجێماوە؟ عەرزیان کرد: نەخێر تەنها بەندەیەکی ئازادکراو نەبێت. ئەوەبوو حەزرەتیش هەموو میراتەکەی دا بە ئەو بەندە ئازادکراوەی.[1]

زانایان فەرموویانە: ئەم حەدیسە بەم رِشتەیە حەمادی کورِی زەید لە عەمری کورِی دینارەوە ئەویش لە عەوسەجەوە رِیوایەتی کردووە، بەلاَم ناوی عەبدولاَی کورِی عەبباسی نەبردووە. جا لەگەلَ ئەوەی کە حەممَاد کەسێکی (عادل وضابط)ە، بەلاَم بێجگە لە سوفیانی کورِی عویەینە چەند کەسێکی تریش ئەم حەدیسەیان گێرِاوەتەوە وناوی عەبدولاَی کورِی عەبباسیان بردووە، کەوابوو بەهێزەکەیان ئەوەیە کە ناوی عەبدولاَی تێدا هاتووە، چونکە لە چەند رِێگەیەکی بەهێزەوە هاتووە.[2]

## حوکمی حەدیسی (شاذ)

هەروەکو لە باسی مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) و(حسن)دا باسمان کرد، یەکێك لە مەرجەکان ئەوەیە کە ئەو حەدیسە (شاذ) نەبێت، کەواتە ئەگەر (شاذ) بوو، ئەوا ئەو حەدیسە بە (ضعیف) دادەنرێت، وکاری پێناکرێت ووەکو بەلَگە بەکار ناهێنرێت، مەگەر لە رِێگەی ترەوە بەهێز بکرێت.

---

(١) السنن الکبری للبیهقي / کتاب الفرائض / باب ما جاء في المولی من أسفل / حەدیسی ژمارە ١٢٧٦٦، وسنن الترمذي / الفرائض / باب في میراث المولی الأسفل / حەدیسی ژمارە ٢١٠٦، وسنن ابن ماجة / کتاب الفرائض / باب من لا وارث له / حەدیسی ژمارە ٢٧٤١.

(٢) برِوانە: علل الحدیث، لابن أبي حاتم / ٢ / ٥٢ / حەدیسی ژمارە ١٦٤٣، ونزهة النظر / ٨٥، وتدریب الراوي / ١٩٢، وتوجیه النظر / ١ / ٥١٥، وفتح المغیث / ١ / ٢١٨، وشرح الزرقاني علی البیقوني / ١٦٧ - ١٦٨.

شێخی شارەزووری فەرموویەتی: ئەو حەدیسەی کە ئیمامی شافیعی پێی دەفەرموێت: (شاذ)، ئەوە گومانی تێدا نیە کە قبوولٚ ناکرێت.[1]

هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە ئەو کەسەی حەدیسەکەی ڕیوایەت کردووە، ئەگەرچی کەسێکی متمانەداریش بێت، بەلاّم لەبەر ئەوەی کە موخالەفەی کەسێك، یان کەسانێکی کردووە کە لە ئەو بەهێزترن، ئەمەش وەها لێك دەدرێتەوە کە ئەو ڕاویە حەدیسەکەی بە تەواوەتی وەکو خۆی لەبەر نەکردووە.

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٤٥.

.......................... وَالمقْلُوبُ قِسْمَانِ تَلاَ

إِبْدَالُ رَاوٍ مَا بِرَاوٍ قِسْمُ وَقَلْبُ إِسْنَادٍ لِمَتْنٍ قِسْمُ

# جۆری بیست ودووەم

## حەدیسی (المَقْلُوب)

واتە: حەدیسی (مقلوب) دوو جۆرە، بەشوێن حەدیسی (شاذ)دا هاتووە:
جۆرێکیان گۆڕینی ڕاویەکە بە ڕاویەکی تر، وە جۆرێکشیان گۆڕینی ڕشتەی دەقی حەدیسێکە بۆ دەقی حەدیسێکی تر.

مامۆستا لێرەشدا نەهاتووە ڕاستەوخۆ پێناسەی ئەم جۆرە حەدیسەمان بۆ بکات، بەڵکو هاتووە دابەشی کردووە بۆ دوو جۆر، کە ئەوانیش وەکو زانایان فەرموویانە، بریتین لە:

١) گۆڕینی ڕاویەکی مەشهوور بۆ ڕاویەکی تر: ئەوەیە کە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێکدا گۆڕانکاری بکرێت بە یەکێك لە ڕاویەکان، ئیتر ناوی خۆی وباوکی جێگۆڕکێیان پێبکرێت، یان لەگەڵ یەکێك لە ڕاویەکانی تردا، یان لەگەڵ کەسێکی تردا لە دەرەوەی ڕشتەکە. وەکو ئەوەی کە کەسێك ناوی عەلی کوڕی حوسەین بێت، بەڵام بگوڕدرێت بە حوسەینی کوڕی عەلی، یان جێگۆڕکێ بکرێت لە نێوان ناوی مامۆستایەك لەگەڵ ناوی قوتابیەکیدا لە ڕشتەیەکدا، یان ناوی ڕاویەك لە ڕشتەیەکدا لابرێت، وناوی کەسێکی تر بخرێتە جێگەی، ئیتر بە هەڵە یان بە دەستی ئەنقەست.

٢) گۆڕینی ڕشتەی گێڕانەوەی دەقی حەدیسێك بۆ دەقی حەدیسێکی تر: ئەوەیە کە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێك لە چەند کەسێك پێکهاتبن، بگۆڕدرێن بە چەند کەسێکی تر کە حەدیسێکی تریان گێڕاوەتەوە.[1]

---

(١) بەڵام ئەگەر سەربەخۆ ڕشتەیەك درووست بکات، کە نەبیسرابێت هەرگیز حەدیس لەو ڕشتەیەوە ریوایەت کرابێت، ئەو ڕشتە بهێنێت وبیکات بە ڕشتەی گێڕانەوەی دەقی حەدیسێك زانراوی دیاریکراو، ئەوە فەرموودەناسان بە (قلب)ی دانانێن، بەڵکو کارێکی ناڕەوا وحەرامە. هەروەها ئەگەر ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێکی زانراو ودیاریکراو بهێنرێت ودەقێکی بە درۆ هەڵبەسراوی بەدەم حەزرەتەوە لێوە ریوایەت بکرێت، ئەمیش هەر بە (قلب) دانانرێت. بڕوانە: حاشية الأجهوري على شرح الزرقاني على البيقوني / ١٧٤.

بەڵام وەکو زانایان فەرموویانە: ئەو دوو جۆرەی کە مامۆستا لە هۆنراوەکەدا هێناونی، هەردووکیان لە جۆری حەدیسی (مقلوب الإسناد)ن، بەڵام ئەوەندە هەیە کە جۆری یەکەمیان گۆڕانکاریەکی جوزئی لە ڕشتەکەدا کراوە، وە جۆری دووەمیشیان گۆڕانکاریەکی تەواوی تێدا کراوە، وهەموو کەسەکانی لابراون وکەسانێکی تر خراونەتە جێگەیان.[١]

هەروەها هەندێك لە فەرموودەناسان باسی جۆرێکی تری حەدیسی مەقلوبیان کردووە، کە ئەویش گۆڕانکاریە لە دەقی حەدیسەکەدا (مقلوب المتن)، ئەویش ئەوەیە کە لە دەقی حەدیسێکدا جێگۆڕکێ بکرێت لە نێوان وشەکانی ئەو حەدیسەدا، وەکو ئەوەی کە لە حەدیسێکدا هاتبێت: ((وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفَاهَا حَتَّى لَا تَعْلَمَ شِمَالُهُ مَا تُنْفِقُ يَمِينُهُ))، بەڵام بگۆڕدرێت بە: ((حَتَّى لَا تَعْلَمَ يَمِينُهُ مَا تُنْفِقُ شِمَالُهُ)). یان وەکو ئەوەی کە لە حەدیسێکدا

---

(١) وە لەم جێگەیەدا زانایان چیرۆکێکی سەیرمان بۆ دەگێڕنەوە سەبارەت بە شارەزایی ولێهاتوویی ئیمامی بوخاری، کە دەفەرموون: ئیمامی بوخاری لە شاری بەغداد لەلایەن کۆمەڵێك لە فەرموودەناسانەوە بۆ تاقیکردنەوە، ڕشتەی سەد حەدیسیان لەگەڵ یەکتردا جێگۆڕکێ پێکرد، وهەر دە حەدیسیان دابە کەسێك کە بیانپرسێت لە ئیمامی بوخاری، ئەوەبوو کاتێك کە لەسەر بەڵێن وڕێککەوتنی خۆیان هاتنە خزمەتی وهەر یەکە لەو کەسانە دە حەدیسی خۆی خوێندەوە بۆی، ئەویش دەیفەرموو: نایزانم ! تاوەکو حەدیسەکانیان یەك لەدوای یەك خوێندەوە لە خزمەتیدا، وئەویش هەر دەیفەرموو: نایزانم ! بۆیە ئەو خەڵکانەی کە شارەزای ئەم ئیمامە پایەبەرزە نەبوون ونەیاندەناسی، دەیانوت: ئەمە فەرموودەناس نیە، ئەگینا چۆن ئاگای لەم حەدیسانە هیچیان نیە ! بەڵام ئەوانەی کە دەیانناسی، دەیانزانی کە ئیمامی بوخاری بەباشی لە فێڵەکەیان تێگەیشتووە، وزانیوێتی کە گۆڕانکاریان بەسەر ڕشتەی حەدیسەکاندا هێناوە. ئەوەبوو پاش تەواو بوونی دەکەسەکە، ڕووی کردە ئەوەی یەکەمیان، وفەرمووی: ئەو حەدیسەی یەکەمی تۆ، ئەوە فلان لە فلانەوە ئەویش لە فلانەوە بۆیان گێڕاومەتەوە. حەدیسی دوەمیشت فلان لە فلانەوە.... نیتر هەر بەم شێوەیە تاوەکو وەڵامی هەر دە کەسەکەی دایەوە، وتەواوی سەد حەدیسەکەی بە ڕشتە ڕاستەکەی خۆیانەوە ڕیوایەت کرد. ئەوجا ئەوانیش بە تێکڕا دانیان نا بە زانایی وپایەبەرزی وگەورەیی ئیمامی بوخاریدا لە زانستی فەرموودەناسیدا. بڕوانە: تأريخ بغداد، للخطيب البغدادي / ٢ / ٢٠ – ٢١، وسير أعلام النبلاء، للذهبي / ٢٣ / ٤٠٢، ووفيات الأعيان، لابن خلكان / ٤ / ١٨٩، وتدريب الراوي / ٢٥٢ - ٢٥٣، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٧٩ – ٥٨٠، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣٢١ - ٣٢٢. شێخی عەسقەلانی دەفەرموێت: چەند جار لە مامۆستاکەی خۆم (الحافظ العراقي)م بیستووە، کە فەرموویەتی: ئەوە جێگەی سەرسووڕمان نیە بۆ ئیمامی بوخاری کە بە هەڵەکانی زانیووە، بەڵکو ئەوە جێگەی سەرسووڕمانە کە هەر بە یەکجار بەشوێن یەکدا هەموو حەدیسەکانی ڕاست کردۆتەوە. بڕوانە: النكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٨٦٩ – ٨٧٠.

هاتبێت: ((مُسْتَدْبِرَ الْقِبْلَةِ مُسْتَقْبِلَ الشَّأْمِ))، بەڵام بگۆڕدرێت بە: ((مُسْتَقْبِلَ القِبْلَةِ مُسْتَدْبِرَ الشَّامِ)).[1]

بەڵام چەندین فەرموودەناسی تریش[2] لە باسی ئەم جۆرە حەدیسەدا تەنها باسی ئەو دوو جۆرەیان کردووە کە مامۆستا هێناونی، ئەویش تەنها لەبەر زۆری ڕێژەی جۆری (مقلوب الإسناد) لە بەرامبەر (مقلوب المتن)، ئەگینا زانیویانە کە ئەم جۆرەشیان بوونی هەیە.[3]

## هۆکارەکانی قەلبکردن لە حەدیسدا

فەرموودەناسان باسی چەند هۆکارێکیان کردووە کە پاڵ بە کەسێکەوە دەنێن تاوەکو قەلب بکات لە حەدیسێکدا، کە هەندێکیان بە هەڵە دەیانکات، وە هەندێکیشیان بە دەستی ئەنقەست:

- ئەوەی کە بە هەڵە ڕاویەکە قەلبی دەکات،[4] وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیسحاقی کوڕی طەبباع لە جورەیری کوڕی حازیم، ئەویش لە ثابتی بونانییەوە ئەویش لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی دەکات، کە حەزرەت فەرموویەتی: ((إذا أُقِيمَتِ الصَّلاةُ فلا تَقُومُوا حتى تَرَوْنِي)). ئەم حەدیسە جورەیری کوڕی حازیم قەلبی کردووە، چونکە وا بەناوبانگە کە یەحیای کوڕی ئەبو کەثیر لە عەبدوڵای کوڕی ئەبو قەتادەوە ئەویش لە باوکیەوە ئەویش

---

(١) بڕوانە: تدريب الراوي / ٢٥١، وتوضيح الأفكار / ٢ / ١٠٦، واليواقيت والدرر / ١ / ١٤٦، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٧٧، والنكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٨٧٨.

(٢) وەکو: (ابن الصلاح، والنووي، والذهبي، وابن الملقن، وابن جماعة، وابن كثير، والحافظ العراقي).

(٣) بڕوانە: فتح المغيث / ١ / ٢٩٨، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٧٨ - ٥٧٩. پێی دەچێت هۆی باس نەکردنی (مقلوب المتن) لەلایەن ئەو فەرموودەناسانەوە بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە زیاتر ئەو باسەیان بە تایبەتمەندی وپسپۆڕی زانایانی شەرعزان زانیبێت، وبە تایبەتمەندی خۆیانیان نەزانیبێت، چونکە ئەم باسە زیاتر کاریگەری لەسەر دەرهێنانی حوکمی شەرعیەوە هەیە لە دەقی ئەو حەدیسەی کە قەلبەکەی تێدا کراوە، نەک بە باسی (صحيح)ی ونا(صحيح)ی حەدیسەکەوە.

(٤) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٦٠، والشذا الفياح / ١ / ٢٣٠، والنكت على مقدمة ابن الصلاح / ٣ / ٨٦٥، وتدريب الراوي / ٢٥٣، وتوضيح الأفكار / ٢ / ١٠٥ – ١٠٦، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣٢٢، وشرح الزرقاني على البيقوني مع حاشية الأجهوري / ١٧٧ – ١٧٨، وعلوم الحديث في ضوء تطبيقات المحدثين النقاد، الدكتور حمزة المليباري / ١٤٨ - ١٤٩.

لە حەزرەتەوە ڕیوایەتی کردووە. ئیسحاق دەفەرمویت: چووم بۆ خزمەتی حەمادی کوڕی زەید، وپرسیاری ئەم حەدیسەم لێکرد، ئەویش فەرمووی: جورەیر وا گومانی بردووە، ئەگینا ئێمە هەموومان لە خزمەتی ثابتدا بووین، وحەجاجیشمان لەگەڵدا بوو، وە ئەو حەدیسەکەی بۆ گێڕاینەوە، بەلاّم جورەیر وا گومانی بردووە کە ثابت بۆی گێڕاوینەتەووە.

- ئەوانەی کە بە دەستی ئەنقەست دەیانکات بریتین لە:

١) دەیەوێت خەڵکی حەدیسەکەی لێوەربگرن، واتە ناوی کەسەکان دەگۆڕێت تەنها لەبەر ئەوەی کە خەڵکی وابزانن ئەو حەدیسە کەسانێکی متمانەدار ڕیوایەتیان کردووە. زانایان فەرموویانە: نموونەی ئەم هۆکارە، وەکو ئەو حەدیسەی کە عەمری کوڕی خالیدی حەڕانی ڕیوایەتی کردووە لە حەمادی کوڕی عەمری نەصیبییەوە ئەویش لە ئەعمەشەوە، ئەویش لە ئەبو صالیحەوە ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: ((إِذَا لَقِيتُمُ الْمُشْرِكِينَ فِي الطَّرِيقِ فَلاَ تَبْدَءُوهُمْ بِالسَّلاَمِ)). ئەم حەدیسە حەمادی کوڕی عەمر قەلبی لە ڕشتەکەیدا کردووە، ولە ئەعمەشەوە ڕیوایەتی کردووە، ئەگینا خۆی لە سوهەیلی کوڕی ئەبو صالەحەوە ئەویش لە باوکیەوە ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتیان کردووە، وەکو لە صەحیحی موسلیمدا هاتووە.[1]

٢) دەیەوێت کەسی بەرامبەری تاقی بکاتەوە وبزانێت تاوەکو چەندە ئاگای لە دەق وڕشتەی حەدیس هەیە، ودەیەوێت لێی تێکبدات، هەروەکو بۆ ئیمامی بوخاری وچەند زانایەکی تر ئەم کارەیان لەگەڵدا کراوە، بۆ تاقیکردنەوەیان.

---

(١) بڕوانە: الشذا الفياح / ١ / ٢٣١، والنكت على مقدمة ابن الصلاح / ٣ / ٨٦٥، وتدريب الراوي / ٢٥٠، وتوضيح الأفكار / ٢ / ١٠١ – ١٠٢، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣٢٠، والنكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٨٦٤ – ٨٦٥، واليواقيت والدرر / ١٠١ – ١٠٢، وشرح الزرقاني على البيقوني / ١٧٣ – ١٧٤.

# حوكمی حەدیسی ( مقلوب )

حوكمی ئەم جۆرە حەدیسە دەگۆڕێت بەپێی گۆڕانی ئەو هۆكارەی كە بووە بەهۆی قەلب كردنەكە، بۆیە:

- ئەگەر قەلب كردنەكەی بە هەڵە بوو، ئەوا تەماشای ئەوە دەكرێت كە ئایا ئەو كەسەی كە قەلبەكەی كردووە كەم دەكەوێتە هەڵەوە یان زۆر؟ خۆ ئەگەر كەم دەكەوتە هەڵەوە، ئەوە لەبەر ئەوەی كە هەڵەی كەم ئەگەری ئەوە هەیە كە هەموو كەسێكی تێبكەوێت، بۆیە هیچ كاریگەری نابێت لەسەر حەدیسەكە، بەڵام ئەگەر زۆر دەكەوتە هەڵەوە، ئەوا كاریگەری دەبێت لەسەر حەدیسەكە ولەسەر زەبتی ڕاویەكە، بۆیە هەندێك جار حەدیسەكە لە پلەی (صحيح)ەوە دێنێتە خوار بۆ پلەی (حسن)، بەڵكو هەندێك جار دەیهێنێتە خوار بۆ پلەی (ضعيف ومنكر). هەر بۆیە زۆرجار ئیمامی (ابن حبان) لە باسی هەندێك لە ڕاویەكاندا، لە كتێبی (المجروحين)دا دەفەرموێت: ئەو كەسە زۆر جار حەدیس قەلب دەكات لە كەسانی متمانەدارەوە، بۆیە درووست نیە بە حەدیسەكانی وەربگیردرێت.
- ئەگەر بە مەبەستی ئەوە بوو كە سەر لە خەڵكی تێكبدات، بۆ ئەوەی كە حەدیسەكەی لێوەربگرن، ئەوە زانایان فەرموویانە: هەر وەكو حەدیسی (موضوع) وایە.[1] واتە: حەدیسێكی (ضعيف)ە وپێی وەرناگیرێت.
- ئەگەر قەلب كردنەكە بە مەبەستی تاقی كردنەوە بێت، ئەوە درووستە،[2] چونكە ئەو كەسانەی زیاتر ئەم كارەیان كردووە، خۆیان فەرموودەناس بوون، وە مەبەستیشیان ئەوە

(١) بڕوانە: النكت على مقدمة ابن الصلاح / ٣ / ٨٦٧، وتدريب الراوي / ٢٥٢، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣٢٠ - ٣٢١، واليواقيت والدرر / ٢ / ٩٠.

(٢) بەڵام هەندێك لە زانایان (وەكو: يحيى بن سعيد القطان، والحافظ العراقي) پێیان وایە كە ئەم كارە دروست نیە. چونكە ڕەنگە ئەو كەسەی كە تاقی دەكرێتەوە بە قەلبەكە نەزانێت، وئیتر هەر بەو جۆرە ڕیوایەتی بكات، ودواتریش خەڵكانێكی تر لەوی ببیستن وبیگێڕنەوە. بڕوانە: المحدث الفاصل بين الراوي والواعي، للرامهرمزي / ٣٩٩، والنكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٨٧١، وفتح المغيث / ١ / ٣٠١، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣٢١. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: هەرچۆنێك بێت، هەر سوودەكەی لە زیانەكەی زیاترە.

بووە کە دڵنیابن لە توانا ولێهاتوویی ئەو کەسەی کە حەدیسەکەیان لێ دەپرسی. شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە ئەم جۆرە قەلبە دەکات، نابێت بەردەوام بێت لەسەری، بەڵکو کەی مەبەستەکەی هاتەجێ، دەبێت وازی لێ بهێنێت.[1] هەر بۆیە ئیمامی (ذهبي) فەرموویەتی: هەرکەسێك کە بە دەستی ئەنقەست دەقی حەدیسێك بهێنێت ورِشتەی حەدیسێکی تری پێوە بلکێنێت، ئەوە حەدیس دزە، و ئەوەیە کە پێی دەڵێن: فلانەکەس حەدیس دەدزێت.[2]

(١) بروانە: نزهة النظر / ٢٢٨.

(٢) بروانە: الموقظة في علم مصطلح الحديث / ٦٠.

وَالْفَرْدُ مَـــا قَيَّدْتَـــهُ بِثِقَـــةِ        أو جَمْعٍ أَوْ قَصْرٍ عَلَى رِوايَةِ

# جۆری بیست وسێیەم

# حەدیسی (الفَرْد)

واتە: حەدیسی (فرد) ئەو حەدیسەیە کە بەستووتەتەوە بە کەسێکی متمانەدارەوە، یان بە کۆمەڵێکەوە، یان بەستوتەتەوە بە تەنها راویەکی دیاریکراوەوە.

مامۆستای دانەر لەم دێڕە هۆنراوەیەدا لە رێگەی پێناسەکردنی حەدیسی (فرد)ەوە، ئاماژەی بەوە کردووە کە ئەم حەدیسە سێ جۆری هەیە، ئەوانیش:

١) ئەو حەدیسەی کە تەنها یەك کەسی متمانەدار ریوایەتی کردووە، ئیتر دەگونجێت کە کەسانێکی تریش ریوایەتیان کردبێت، بەڵام هیچیان متمانەدار نەبن. وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی موسلیم وغەیری ئەویش بۆمان دەگێڕنەوە کە حەزرەت لە هەردوو نوێژی جەژنی رەمەزان وقورباندا سوورەتی (قاف، وَاقْتَرَبَتْ السَّاعَةُ)ی دەخوێندەوە.[1] زانایان فەرموویانە: ئەم حەدیسە تەنها کەسێکی متمانەدار بەناوی (ضَمْرَةُ بنُ سَعِيد)ەوە ریوایەتی کردووە، ئەگینا کەسەکانی تر کە ریوایەتیان کردووە هیچیان متمانەدار نین.[2]

٢) ئەو حەدیسەی کە تەنها کۆمەڵێکی دیاریکراو ریوایەتیان کردووە: وەکو ئەو حەدیسانەی کە لەبارەیانەوە زانایان فەرموویانە: ئەم حەدیسە تەنها مەککەییەکان یان مەدینەییەکان یان میصریەکان یان شامییەکان یان کوفییەکان یان خۆراسانییەکان ریوایەتیان کردووە. کە نموونەی ئەمانە لە سونەنی ئەبو داوود وموسنەدی بەززار وموعجەمەکانی ئیمامی (طبراني)دا زۆر بەرچاو دەکەون. وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی ئەبو داوود بۆمان ریوایەت دەکات لە (أبو ذر الغفاري)یەوە کە حەزرەت پێی فەرمووە: « يَا أَبَا ذَرٍّ إِنِّي أَرَاكَ

---

(١) صحيح مسلم / كتاب صلاة العيدين / باب ما يقرأ به في صلاة العيدين / حەدیسی ژمارە ٨٩١.

(٢) بڕوانە: شرح التبصرة والتذكرة/١/٢٦٩ - ٢٧٠، والشذا الفياح /١/٢٠٠، وتوضيح الأفكار /٢/٨.

ضَعِيفًا وَإِنِّ أُحِبُّ لَكَ مَا أُحِبُّ لِنَفْسِي فَلاَ تَأَمَّرَنَّ عَلَى اثْنَيْنِ وَلاَ تَوَلَّيَنَّ مَالَ يَتِيمٍ ».[1]
پاشان ئه‌بو داوود فه‌رموویه‌تی: ((تفرّد به أهل مصر)). هه‌روه‌ها وه‌كو ئه‌و حه‌دیسه‌ی كه دایكه عائیشه بۆمان ده‌گێڕێته‌وه كه حه‌زره‌ت له ناو مزگه‌وتدا نوێژی كرد له‌سه‌ر (سهیل بن بیضاء)و براكه‌ی. ئیمامی حاكیم فه‌رموویه‌تی: ئه‌م حه‌دیسه ته‌نها خه‌ڵكی شاری مه‌دینه ڕیوایه‌تیان كردووه.[2]

---

(١) سنن أبي داود / كتاب الوصايا / باب ما جاء في الدخول في الوصايا / حه‌دیسی ژماره ٢٨٦٨.
هه‌روه‌ها زانایان چه‌ندین كتێبیان له‌سه‌ر ئه‌م جۆره حه‌دیسه داناوه، وه‌كو:

- التفرّد: كه دانراوی ئیمامی ئه‌بو داووده، ئه‌گه‌رچی من به چاپكراوی به‌رچاوم نه‌كه‌وتووه، به‌لام خاوه‌نی كتێبی (تحفة الأشراف) لێیه‌وه نقلّ ده‌كات (وه‌ك له حه‌دیسه‌كانی ژماره: ٤٤٧٤، و٦٢٤٩، و٨٤٢٠)، وخاوه‌نی: (الرسالة المستطرفة)ش ناوی هێناوه وباسی كردووه. هه‌روه‌ها شێخی عه‌سقه‌لانیش ئاماژه‌ی پێداوه. بڕوانه: النكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٧٠٨.
- الأفراد: كه دانراوی (ابن شاهين)ه، ونێستا چه‌ند به‌شێكی كه‌می ماوه، وله‌گه‌ڵ هه‌ندێك له دانراوه‌كانی تریدا به‌چاپ گه‌یه‌نراوه.
- الغرائب والأفراد: كه دانراوی ئیمامی (دار قطني)یه، ئه‌م كتێبه‌شم هه‌ر به‌رچاو نه‌كه‌وتووه، به‌لام زانای پایه‌به‌رز (ابن طاهر المقدسي) ڕێكی خستۆته‌وه، وناوی ناوه: (أطراف الغرائب والأفراد)، كه ئێستا به چاپكراوی هه‌یه.
- المفاريد: كه دانراوی (أبو يعلى الموصلي)یه، ئێستا به چاپكراوی هه‌یه.

زانایان ده‌فه‌رموون: زانینی ئه‌وه‌ی كه حه‌دیسێك له ڕیزی حه‌دیسه فه‌رده‌كاندا ده‌ژمێردرێت یان نا، پێویستی به بیرێكی تیژ وله‌به‌ركردنێكی تایبه‌تی وفراوان هه‌یه، زۆر جار زانایانی گه‌وره له باره‌ی حه‌دیسێكه‌وه فه‌رموویانه: ئه‌م حه‌دیسه، ئه‌وه‌نده‌ی من بزانم، ته‌نها كه‌سێك ڕیوایه‌تی كردووه، كه‌چی دواتر زانایه‌كی تر هاتووه وفه‌رموویه‌تی: ئه‌و حه‌دیسه له فلانه ڕێگه‌ی تریشه‌وه ڕیوایه‌ت كراوه. بڕوانه: النكت على كتاب ابن الصلاح /٢/٧٠٨، وفتح المغيث /١/٢٤٢، والنكت على مقدمة ابن الصلاح /٣/٧٥٢.
(٢) بڕوانه: معرفة علوم الحديث / ١٥٦. هه‌روه‌ها بڕوانه: تدريب الراوي /٢٠٨، وفتح المغيث /١/٢٤٢، والرسالة المستطرفة لبيان مشهور كتب السنة المصنفة، لمحمد بن جعفر الكتاني /١١٤.

٣) ئەو حەدیسەی کە تەنها یەك کەس لە ڕاویەکی دیاریکراوەوە ڕیوایەتی کردووە، واتە بێجگە لەو کەسە کەسی تر لەو ڕاویەوە ڕیوایەتی نەکردووە، بەلاّم دەگونجێت لە ڕێگەی ڕاویەکی ترەوە چەندین کەس ڕیوایەتیان کردبێت. ئەم جۆرەیان لە جۆری یەکەم گشتگیر ترە، چونکە دەکرێت ئەو تەنها کەسە متمانەدار بێت، وە دەشکرێت متمانەدار نەبێت. بۆ ئەم جۆرە حەدیسە زانایان نموونەیان بەو حەدیسە هێناوەتەوە کە ئەنەسی کوڕی مالیك فەرموویەتی: « أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَوْلَمَ عَلَى صَفِيَّةَ بِسَوِيقٍ وَتَمْرٍ ».[١] زانای پایەدار (ابن طاهر المقدسي) فەرموویەتی: ئەم حەدیسە غەریبە لە ڕێگەی وائیلی کوڕی داوودەوە کە لە کوڕێکی خۆیەوە بە ناوی بەکرەوە، ڕیوایەتی کردووە، وە تەنها کەسێکیش کە لەو وائیلەوە ڕیوایەتی کردووە بریتیە لە سوفیانی کوڕی عویەینە.[٢]

ئەوجا زانایان لە باسی ئەم جۆرە حەدیسەدا باسی دوو جۆی سەرەکیان کردووە، کە ئەوانیش:

(الفرد المطلق، والفرد النسبي)ن، کە لە باسی حەدیسی غەریبدا باسمان کردن، وە فەرموویانە: هەموو ئەم سێ جۆرەی کە مامۆستا هێناونی بەبەر جۆری (الفرد النسبي) دەکەون.[٣]

پێم باشە لێرەدا لەبەر تێکەڵ نەبوون ولێکجیاکردنەوەی حەدیسی (فرد وغریب) فەرمایشتێکی شێخی عەسقەلانی بهێنمەوە، کە فەرموویەتی: ئەگەرچی ئەم دوو جۆرە لە ڕووی زمانەوانی وزاراوەشەوە بە یەك مانا هاتوون، بەلاّم زانایانی فەرموودەناس جیاوازیان

---

(١) سنن أبي داود / كتاب الأطعمة / باب في استحباب الوليمة عند النكاح / حەدیسی ژمارە ٣٧٤٤.

(٢) بڕوانە: أطراف الغرائب والأفراد، لابن طاهر المقدسي / ٢ / ١٧٦ / حەدیسی ژمارە ١٠٥٧. هەروەها بڕوانە: شرح التبصرة والتذكرة/ ١ / ٢٦٩، والشذا الفياح / ١ / ٢٠٠، وتدريب الراوي / ٢٠٨، وشرح الزرقاني على البيقوني / ١٨٢.

(٣) بڕوانە ئەلفییەی عێراقی بە شەرحەکانی: فتح المغيث، ومنحة المغيث، لە باسی: (الأفراد)دا. بەلاّم ئیمامی سەخاوی پێی وایە کە ئەو دوو جۆرە سەرەکیە لە هەندێك نموونەدا دەکەونەوە یەك وتیایاندا هاوبەشن. بڕوانە: فتح المغيث / ١ / ٢٤١.

کردووە لە نێوانیاندا لە ڕووی زۆری وکەمی بەکارهێنانەوە. وشەی فەردیان زیاتر بۆ (الفرد المطلق) بەکارهێناوە. وە وشەی غەریبیشیان زیاتر بۆ (الفرد النسبي) بەکار هێناوە.

ئەوجا فەرموویەتی: ئەمە لەڕووی بەکارهێنانی ناوی فەرد وغەریبەوە، ئەگینا لەڕووی بەکارهێنانەوە وەکو ڕستەیەکی فرمانی (جملة فعلية)، جیاوازیان نەکردووە، وبۆ هەردووکیان (الفرد المطلق والنسبي) فەرموویانە: تَفَرَّدَ بِهِ فُلانٌ. یان: أَغْرَبَ بِهِ فُلانٌ. (١)

## حوکمی حەدیسی (فرد)

بۆ بڕیاردان بەسەرئەم جۆرە حەدیسەشدا کە ئایا (صحیح)ە یان نا، دەبێت تەماشای ئەوە بکەین کە تاوەکو چەند مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) و(حسن)ی تێدا هاتوەتەجێ، بەو پێیە دەتوانین بڵێین: (صحیح)ە یان (حسن)ە یان (ضعیف)ە.

---

(١) بڕوانە: نزهة النظر / ٦٦. بەڵام ئەوەندە هەیە کە تەعبیری (أغرب به فلان) کەمتر بەکار دەهێنرێت لە تەعبیری (تفرّد به فلان)، وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی ئەبو داوود ڕیوایەتی کردووە وفەرموویەتی: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ كَثِيرٍ حَدَّثَنَا سُلَيْمَانُ بْنُ كَثِيرٍ عَنْ يَحْيَى بْنِ سَعِيدٍ عَنْ عَمْرَةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ لَمَّا قُتِلَ زَيْدُ بْنُ حَارِثَةَ وَجَعْفَرٌ وَعَبْدُ اللَّهِ بْنُ رَوَاحَةَ جَلَسَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) فِي الْمَسْجِدِ يُعْرَفُ فِي وَجْهِهِ الْحُزْنُ وَذَكَرَ الْقِصَّةَ. پاشان فەرموویەتی: قوله " جلس في المسجد " أغرب به سليمان بن كثير ليس يقوله غيره. سنن أبي داود / كتاب الجنائز / باب الجلوس عند المصيبة / حەدیسی ژمارە ٣١٢٢.

وَمَا بِعِلَّةٍ غُمُوضٍ أَوْ خَفَا مُعَلَّلٌ عِنْدَهُـــمُ قَدْ عُرِفَا

# جۆری بیست وچوارەم

## حەدیسی ( المُعَلَّ )

واتە: هەر حەدیسێك كە نەخۆشیەكی نادیار یان شاراوەی تێدا بێت، ئەوە بەلای فەرموودەناسانەوە بە (معلّل) ناسراوە.

ئەم پێناسەیەی مامۆستا وەرگیراوە لە پێناسەی فەرموودەناسانی پێشینەوە، كە بۆ ئەم جۆرە حەدیسەیان كردووە، بەلاّم هەندێك بە كورتی.

فەرموودەناسان لە پێناسەكەدا فەرموویانە: ئەو حەدیسەیە كە نەخۆشیەكی نادیار وشاراوەی تێدایە، كە كاریگەری دەكاتە سەر (صحیح)ی حەدیسەكە، لەگەڵ ئەوەی كە بە ڕواڵەت وا دیارە ئەو نەخۆشیەی تێدا نیە.[1]

لەڕووی ناونانی ئەم جۆرە حەدیسە بەو ناوەوە كە مامۆستا هێناویەتی، ئەگەرچی هەندێكی تر لە فەرموودەناسان هەر هەمان ناویان بەكار هێناوە، یان ئەو ناوەی كە زانایانی وەكو (البخاري، والترمذي، وابن عَدِي، والدارقطني، وأبو يعلى الخليلي، والحاكم) وكەسانی تر بەكاریان هێناوە وفەرموویانە: (مَعْلول)، هەندێك لە زانایان ڕەخنەیان لێ گرتوون، وفەرموویانە: لە ڕووی زمانەوانیەوە باشتر وجوانتر وەهایە كە بوترێت: (مُعَلّ).[2]

---

(١) بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ١٧٤، ومقدمة ابن الصلاح / ٥٣، والمقنع في علوم الحديث / ٢١٢، والمنهل الروي / ٥٢، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ٢١٠، وفتح المغيث / ١ / ٢٤٤. هەندێك لە زانایان فەرموویانە: جاری وا هەیە كە دەڵێن حەدیسیی مەعلول، مەبەستیان ئەوەیە كە یەكێك لەو هۆیانەی تێدایە كە دەبێتە هۆی (ضعیف)ی حەدیس، وەكو ئەوەی كە بوترێت: فلاّنە ڕاوی درۆزنە، یان بێ ئاگایە، یان لەبەركردنی خراپە، یان هەركام لەو هۆیانەی تر كە كاریگەریان دەبێت لەسەر وەرگرتنی حەدیسێك لە ڕاویەكەوە. بەڵكو بەلای ئیمامی (ترمذي)ەوە نەسخ لە حەدیسدا بە عیللەت دادەنرێت. بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٤.

(٢) بڕوانە: التقييد والإيضاح / ١١٦، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٧٢ - ٢٧٣، والشذا الفياح / ١ / ٢٠٥، وتدريب الراوي / ٢١٠. جا هەر كەسێك كە شارەزایی هەبێت لە زانستی صەرفدا زیاتر لە جیاوازی نێوان ئەم سێ ناوە تێدەگات.

# گرنگی وبایەخی ئاگابوون لەم باسە

فەرمووده‌ناسان فەرموویانە: باسی (علل الحديث) زانستێکی سەربەخۆیە، وپەیوەندی بە باسی (صحيح)ی ونا(صحيح)ی و جەرح وتەعدیلەوە نیە، بەڵکو یەکێکە لە گەورەترین باسەکانی ئەم زانستە، وەباسێکی زۆر ورد وناڕوونە، هەر بۆیە بێجگە لە خەڵکانی پسپۆڕ ولێهاتوو وشارەزایانی بیرتیژ وزانا بلیمەتەکان، کەسی تر قسەی تێدا نەکردووە، بەڵکو هەندێکیان پێیان وایە کە زانینی ئەم باسە تەنها لە ڕێگەی ئیلهامەوە دەبێت، کە خوای گەورە دەیخاتە دڵیانەوە.[1]

دەگێڕنەوە لە (عبد الرحمن بن مهدي)، کە فەرموویەتی: ئەگەر نەخۆشی وعیللەتی حەدیسێکم بۆ دەربکەوێت، پێم خۆشترە لەوەی کە بیست حەدیس بنووسمەوە لەو حەدیسانەی کە لەلای خۆم نین.[2]

شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەم باسە باسێکی تەواو لێڵ ووردە، خۆ ئەگەر کەسێك خوای گەورە تێگەیشتنێکی باش وبیرێکی تیژی پێنەدابێت، وشارەزاییەکی تەواوی نەبێت

---

(١) دەگێڕنەوە کە پیاوێك پرسیاری کردووە لە (أبو زرعة الرازي): بەڵگەتان چیە کە دەڵێن حەدیسێك مەعلولە ؟: ئەویش فەرمووی: بەڵگەمان ئەوەیە کە تۆ پرسیاری حەدیسێکم لێ بکەیت، ومنیش عیللەتەکەیت پێ بڵێم، پاشان بڕۆیت بۆ لای (محمد بن مسلم بن وارة)، وپرسیار لە ئەویش بکەیت، بەڵام پێی نەڵێیت کە لە منیشت پرسیوە، ئەوجا ئەویش عیللەتەکەیت پێ بڵێت، پاشان بڕۆیت بۆ لای (أبو حاتم)، وئەویش عیللەتەکەیت پێ بڵێت، ئەوجا تەماشا بکە وبزانە: ئەگەر جیاوازی هەبوو لە نێوان بۆچوونەکانماندا، ئەوە بزانە کە ئەوەی پێمان وتی بۆچوونی خۆمانە، وە ئەگەر بینیت کە هەموومان یەك بۆچوونمان هەبوو، ئەوە بزانە کە ئەم زانستە حەقیقەتێکی هەیە. جا پیاوەکەش وەهای کرد کە ئەو پێی فەرموو، بینی کە هەموویان یەك بۆچوونیان هەبوو لەو مەسەلەیەدا، بۆیە دەستبەجێ وتی: شایەتی ئەدەم کە ئەم عیلمە ئیلهامی خواییە. بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ١٧٤، والجامع لأخلاق الراوي / ٢ / ٢٥٦ / بە ژمارەی ١٧٧٧.

(٢) بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ١٧٤، والجامع لأخلاق الراوي / ٢ / ٢٩٥ / بە ژمارەی ١٩٠٠.

سەبارەت بە دەق ورشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکان، ناتوانیت لەم بابەتەدا قسە بکات، هەر بۆیە ئەوانەی کە لەم بابەتەدا وتە وبۆچوونیان هەیە ولێیان وەرگیراوە، زۆر کەمن، لەوانە: (علي بن المديني، وأحمد بن حنبل، والبخاري، ويعقوب بن شيبة، وأبو حاتم، وأبو زرعة، والدارقطني).[1]

## جۆرەکانی عیللەت

کاتێك کە باس لە جۆرەکانی عیللەتی حەدیس دەکرێت، ناکرێت کە لە چەند جۆرێکی دیاریکراودا کورتی بکەینەوە، بەڵکو ئەوەندە دەکرێت کە جۆرە زۆر دیارەکانی دەستنیشان بکرێت، وئەوانی تری جێ بهێڵرێت بۆ بڕیاری زانایان ولێهاتوانی ئەو بوارە.

ئیمامی حاکمی نەیسابووری هەستاوە باسی دە جۆر عیللەتی کردووە، کە دەکرێت ببنە هۆی ئەوەی حەدیسێك کە بە ڕواڵەت لە (صحيح) دەچێت، ئەم عیللەتانە وای لێ بکەن کە ببێت بە (معلّل)، کە ئەوانیش:

١) حەدیسێك بە ڕواڵەت لە (صحيح) دەچێت، بەلاّم لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا کەسێکی تێدایە، لەناو زانایاندا بەوە نەناسراوە کە حەدیسی لەو کەسە بیستبێت کە ئەو حەدیسەی لێ ڕیوایەت کردووە.

---

(١) بڕوانە: نزهة النظر / ١١٣. جا لەبەر گرنگی وبایەخی ئەم باسە، زانایان هەستاون چەندین کتێبی تایبەتیان تێدا داناوە، لەوانە: کتێبی (العلل) کە (ابن المديني) دایناوە، وە کتێبی (التاريخ والعلل) کە زانای پایەبەرز (يحيى بن معين) دایناوە، وە کتێبی (المسند المعلل) کە زانای گەورە (يعقوب بن شيبة السدوسي) دایناوە، وە کتێبی (العلل ومعرفة الرجال) کە ئیمامی ئەحمەد دایناوە، وە کتێبی (العلل الكبير)، کە ئیمامی (الترمذي) دایناوە، وە کتێبی (علل الحديث) کە (ابن أبي حاتم الرازي) دایناوە، وە کتێبی (العلل الواردة في الأحاديث النبوية) کە ئیمامی (الدار قطني) دایناوە. سەرەڕای ئەوەی کە لە چەندین کتێب وسەرچاوەی تریشدا هەر باس لە بابەتی عیللەتی حەدیس کراوە، بەتایبەتی لەو سەرچاوانەی کە بۆ تەخریجی حەدیس پشتیان پێ دەبەسترێت، وەکو: (نصب الراية في تخريج أحاديث الهداية) کە ئیمامی (الزيلعي) دایناوە، وە (التلخيص الحبير) کە شێخی عەسقەلانی دایناوە.

٢) حەدیسێك کە ڕاویە بیرتیژ ومتمانەدارەکان بە مورسەلی ڕیوایەتیان کردووە، کەچی لە ڕێگەیەکی ترەوە بە موسنەدی ڕیوایەت کراوە، ئەمەش وای لێ دەکات کە بە ڕواڵەت لە (صحیح) بچێت.

٣) حەدیسێك وا ناسراوە کە یەکێك لە هاوەڵانی حەزرەت ڕیوایەتی کردووە، بەڵام لە کەسێکی ترەوە ڕیوایەت بکرێت، کە هاوەڵ نەبێت، تەنها لەبەر ئەوەی کە وڵاتی ڕاویەکان لە یەکتری جیاوازن.

٤) حەدیسێك وا ناسراوە کە یەکێك لە هاوەڵان ڕیوایەتی کردووە، بەڵام لە یەکێك لە شوێنکەوتوانەوە ڕیوایەت بکرێت، بە جۆرێك کە گومان درووست بکات، کە ئەو کەسەش یەکێکە لە هاوەڵان.

٥) حەدیسێك بە عەنعەنە ڕیوایەت کرابێت، بەڵام کەسێك لە ڕشتەی گێڕانەوەکەی لابرابێت، و بەهۆی ڕێگەیەکی ترەوە بزانرێت کە ئەو کەسە لابراوە کێیە.

٦) حەدیسێك لە دوو ڕێگەوە ڕیوایەت بکرێت، لە یەکێکیاندا ناوی مامۆستایەك هاتبێت ودیاری بێت، ولەوی تریاندا بە نادیاری هاتبێت.

٧) حەدیسێك هەم بە ئیسناد وهەم بە غەیری ئیسنادیش لە کەسێکەوە ڕیوایەت کرابێت، بەڵام ئەوەی کە لەلای زانایان مەعرووف وناسراوە، ئەو ڕیوایەتەیانە کە بەبێ ئیسنادە.

٨) ڕاویەك بە کەسێك گەیشتووە وحەدیسیشی لێ بیستووە، بەڵام چەند حەدیسێك هەن کە لەو کەسەی نەبیستوو، جا ئەگەر وەهای گێڕایەوە کە خۆی لەو کەسەی بیستووە، وباسی کەسی تری نەکرد لە نێوان خۆی وئەو کەسەدا، ئەوە عیللەتەکە بریتیە لەوەی کە ئەو حەدیسەی لەو کەسەی نەبیستووە.

٩) حەدیسێك ڕێگەیەکی دیاریکراو وزانراوی هەیە کە لێیەوە ڕیوایەت کراوە، بەڵام یەکێك لە کەسەکانی ئەو ڕێگەیە لە ڕێگەیەکی ترەوە حەدیسێك ڕیوایەت بکات،

ئەوا هەر کەسێك کە ئەم حەدیسەی دووەم لە ڕاویەکەوە ڕیوایەت بکات، ڕەنگە گومانی وەها بێت کە لە ڕێگەی یەکەمەوە، کە ڕێگە زانراوەکەیە، ڕیوایەت کراوە.

١٠) حەدیسێك لەلایەکەوە بە (مرفوع)ی ڕیوایەت بکرێت، لەلایەکی ترەوە بە (موقوف)ی.

جا ئیمامی حاکم پاش ئەوەی کە ئەم دە عیللەتەیەی ژماردووە، فەرموویەتی: ئەمە دە جۆری عیللەتی حەدیسە، بەڵام چەند جۆری تریشی ماوە کە باسم نەکردووە، بەڵکو کردوومن بە نموونە بۆ چەندین حەدیسی (معلّل)، بۆ ئەوەی کە خەڵکانێکی شارەزا ورۆچوو لەم باسەدا پێیان دەزانن، چونکە زانین وناسینی عیللەتی حەدیس لە گەورەترین باسەکانی زانستی فەرموودەناسیە.[1]

## چۆن بە عیللەتی حەدیس بزانین؟

وەکو باسمان کرد، زانین وئاگالێبوون وشارەزایی لەم باسەدا خەڵکانێکی بیرتیژ وبەتوانای کەم وێنە وبلیمەتی دەوێت، هەر بۆیە هەموو کەسێك نەیتوانیوە لەم باسەدا بڕیار بدات کە ئایا حەدیسێك (معلّل)ە یان نا؟ بەڵکو هەندێك جار زانایانی پایەبەرز وشارەزاش لەو جۆرە بڕیارانەدا پەلەیان نەکردووە، بەڵکو ڕەوانەیان کردووە بۆلای کەسانێکی تر کە بەتایبەت پسپۆڕن لە بوارەکەدا.

کەواتە دەکرێت بڵێین: بەر لە هەموو شتێك، ئیمە دەتوانین لە ڕێگەی بۆچوونی ئەو زانا پسپۆڕانەوە بزانین کە ئایا عیللەت لە حەدیسێکدا هەیە یان نا.

بەڵام ئایا ئەوان خۆیان چۆن بڕیاریان داوە؟ وە چی پێوەرێکیان هەبووە بۆ بڕیاردانەکەیان؟

---

(١) بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ١٧٤ – ١٨٣. جا بۆ تێگەیشتنی زیاتر لەم دە جۆرە بە نموونەوە دەکرێت تەماشای ئەم سەرچاوانەش بکرێت: تدريب الراوي / ٢١٧ - ٢٢٠، وتوجيه النظر / ٢ / ٦٠٥ – ٦١٢، وە لێکۆڵینەوەی مامۆستا (أحمد شاكر) لەسەر (اختصار علوم الحديث / ٥٧ – ٦٠ ).

زانایان فەرموویانە: ئاگابوون لە عیللەتی حەدیس تەنها لە ڕێگەی تەماشا کردنی هەموو ئەو ڕێگایانەوە دەبێت کە حەدیسەکەیان لێوە ڕیوایەت کراوە، یان ئەو ڕێگایانەی کە حەدیسەکانی ئەو باس وبابەتەیان لێوە ڕیوایەت کراوە، ئەوجا بەراورد کردنیان بەیەکتری، وبەراورد کردنی ڕاویەکانیان لەڕووی بیرتیژی وزیادە متمانەداریەوە.

- شێخی شارەزووری فەرموویەتی: بۆ پێزانینی عیللەتی حەدیس زانا بلیمەتەکان تەماشای ئەوەیان کردووە کە ئەو حەدیسە تەنها لە ڕێگەی یەك کەسەوە ڕیوایەت کراوە، یان ڕیوایەتەکە پێچەوانەی ڕیوایەتی کەسانێکی ترە، لەگەڵ چەند قەرینەیەکدا کە زانایانی ئەم بوارە هۆشیار دەکەنەوە لەسەر ئەوەی کە ئەو حەدیسەی کە بە مەوصوولی ڕیوایەت کراوە، مەوصوول نیە بەڵکو مورسەلە، یان وا ڕیوایەت کراوە کە (مرفوع) بێت، بەڵام خۆی (موقوف)ە، یان حەدیسێك چوە بەناو حەدیسێکی تردا، یان کەسێك کەوتووەتە ناو ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێك بە گومانی یەکێك لە ڕاویەکان، جا ئەگەر ئەو زانایە زیاتر گومانی لەسەر ئەم حاڵەتانە بۆ درووست بوو، ئەوا بڕیار دەدات کە ئەو حەدیسە (معلّل)ە، ئەگینا ڕادەوەستێت وهیچ بڕیارێك نادات. [١]
- (الخطيب البغدادي) فەرموویەتی: ڕێگەی پێزانینی عیللەتی حەدیس، ئەوەیە کە هەموو ڕێگەکانی ڕیوایەتکردنی ئەو حەدیسە بەیەکەوە کۆبکرێنەوە، پاشان بزانرێت ڕاویەکانیان چی جیاوازیەکیان هەیە لەڕووی پێگە وپلەوپایەی متمانەداری وبیرتیژی ولێهاتوویيان. [٢]
- (عبد الله بن مبارك) فەرموویەتی: ئەگەر دەتەوێت بزانیت حەدیسێك (صحيح)ە، بڕۆ هەموو ڕیوایەتەکانی بدە بەیەکدا. [٣]

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٣.
(٢) بڕوانە: الجامع لأخلاق الراوي / ٢ / ٢٩٥ / بە ژمارەی ١٩٠١.
(٣) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو / ٢ / ٢٩٥ / بە ژمارەی ١٩٠٢.

- (يحيى بن معين) فەرموویەتی: ئەگەر حەدیسێك لە سی (٣٠) ڕێگەوە پێمان نەگەیشتبێت، بەدڵماندا نەچووە وعەقڵمان نەیگرتووە.[١]

- ئیمامی ئەحمەد فەرموویەتی: حەدیس ئەگەر هەموو ڕێگەکانی بەیەکەوە کۆنەکەیتەوە، لێی تێناگەیت، وە هەندێك حەدیس دەبنە ڕاڤە وتەفسیر بۆ هەندێکی تر.[٢]

- (علي بن المديني) فەرموویەتی: لەم باسەدا ئەگەر هەموو ڕێگەکانی حەدیسێك بەیەکەوە کۆنەکرێنەوە، دەرناکەوێت کە ئەو حەدیسە هەڵەی تێدایە.[٣]

جا ئێستا ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە سەر جۆرەکانی عیللەت، وبە وردی لێیان بڕوانین، بۆمان دەردەکەوێت کە پێزانینی ئەو عیللەتانە هەموویان لە ڕێگەی کۆکردنەوەی ڕیوایەتەکان وبەراورد کردنیان وبەراوردکردنی ڕاویەکانیانەوە دەبێت.

## عیللەتی حەدیس لە کوێیدایە؟

شێخی شارەزووری فەرموویەتی: زۆر جار عیللەت لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدایە، بەڵام دەکرێت هەندێك جار لە دەقی حەدیسەکەدا بێت.

ئەوجا دەفەرموێت: هەر عیللەتێك کە لە ڕشتەکەدا بێت، کاریگەری دەکاتە سەر (صحيح)ی دەقی حەدیسەکە وڕشتەی گێڕانەوەکەشی، وەکو عیللەتی ئیرسال ووەقف، واتە حەدیسەکە وا دەردەکەوێت بە ڕواڵەت کە کەس لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا لانەبراوە، کەچی ئەو حەدیسە مورسەلە، یان وا دەردەکەوێت کە حەدیسی حەزرەتە و(مرفوع)ە، کەچی حەدیسی یەکێکە لە هاوەڵان و(موقوف)ە. بەڵام جاری واش هەیە کە تەنها کاریگەری لەسەر

---

(١) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو / ٢ / ٢١٢ / بە ژمارەی ١٦٣٩.

(٢) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو / ٢ / ٢١٢ / بە ژمارەی ١٦٤٠.

(٣) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو / ٢ / ٢١٢ / بە ژمارەی ١٦٤١.

(صحیح)ی ڕشته‌ی گێڕانه‌وه‌که‌ ده‌بێت، نه‌وه‌ك ده‌قی حه‌دیسه‌که‌، چونکه‌ ده‌قی حه‌دیسه‌که‌ به‌ ڕشته‌یه‌کی تر چه‌سپاوه‌ که‌ (صحیح)ه‌.[1]

- نموونه‌ی ئه‌و عیلله‌ته‌ی که‌ له‌ ڕشته‌ی گێڕانه‌وه‌ی حه‌دیسێکدا هه‌یه‌، وکاریگه‌ری نابێت له‌سه‌ر ده‌قی حه‌دیسه‌که‌، وه‌کو ئه‌و حه‌دیسه‌ی که‌ (یعلی بن عبید) له‌ (سفیان الثوري)، ئه‌ویش له‌ (عمرو بن دینار)، ئه‌ویش له‌ (ابن عمر) ئه‌ویش له‌ حه‌زره‌ته‌وه‌ که‌ فه‌رموویه‌تی: «البَيِّعانِ بالخِيَار...».

---

(١) به‌لاّم له‌م بابه‌ته‌دا شێخی عه‌سقه‌لانی به‌ شێوه‌یه‌کی درێژتر باسی له‌و جێگه‌یه‌ کردووه‌ که‌ ده‌گونجێت عیلله‌تی تێدابێت، وفه‌رموویه‌تی: عیلله‌ت هه‌ندێك جار له‌ ڕشته‌ی گێڕانه‌وه‌ی حه‌دیسه‌که‌دایه‌، وهه‌ندێك جاریش له‌ ده‌قی حه‌دیسه‌که‌دایه‌، جا ئه‌گه‌ر له‌ ڕشته‌که‌دا بوو، ئه‌وا ده‌گونجێت ته‌نها کاریگه‌ری له‌سه‌ر (صحیح)ی ڕشته‌که‌ خۆی هه‌بێت، یان کاریگه‌ری هه‌م له‌ خۆی وهه‌م له‌ صه‌حیحی ده‌قی حه‌دیسه‌که‌شدا هه‌بێت، یان کاریگه‌ری له‌سه‌ر هیچکامیان نابێت. به‌ هه‌مان شێوه‌ ئه‌گه‌ر عیلله‌ته‌که‌ ته‌نها له‌ ده‌قی حه‌دیسه‌که‌دا بێت. بۆیه‌ فه‌رموویانه‌: عیلله‌ت به‌پێی کاریگه‌ری کردن له‌ صیحه‌تی ڕشته‌ وده‌قی حه‌دیسه‌کاندا شه‌ش جۆری هه‌یه‌، که‌ ئه‌وانیش:

١. عیلله‌ته‌که‌ ته‌نها له‌ ڕشته‌که‌دایه‌، وکاریگه‌ریشی نه‌ له‌سه‌ر ڕشته‌که‌ ونه‌ له‌سه‌ر ده‌قی حه‌دیسه‌که‌ش نیه‌.
٢. عیلله‌ته‌که‌ ته‌نها له‌ ڕشته‌که‌دایه‌، وکاریگه‌ریشی هه‌م له‌سه‌ر ڕشته‌که‌ وهه‌م له‌سه‌ر ده‌قی حه‌دیسه‌که‌ش هه‌یه‌.
٣. عیلله‌ته‌که‌ ته‌نها له‌ ڕشته‌که‌دایه‌، وکاریگه‌ریشی ته‌نها له‌سه‌ر ڕشته‌که‌ هه‌یه‌، نه‌ك ده‌قی حه‌دیسه‌که‌.
٤. عیلله‌ته‌که‌ ته‌نها له‌ ده‌قی حه‌دیسه‌که‌دایه‌، وکاریگه‌ریشی نه‌ له‌سه‌ر ڕشته‌که‌ ونه‌ له‌سه‌ر ده‌قی حه‌دیسه‌که‌ش نیه‌.
٥. عیلله‌ته‌که‌ ته‌نها له‌ ده‌قی حه‌دیسه‌که‌دایه‌، وکاریگه‌ریشی هه‌م له‌سه‌ر ده‌قی حه‌دیسه‌که‌، وهه‌م له‌سه‌ر ڕشته‌که‌ش هه‌یه‌.
٦. عیلله‌ته‌که‌ ته‌نها له‌ ده‌قی حه‌دیسه‌که‌دایه‌، وکاریگه‌ریشی ته‌نها له‌سه‌ر ده‌قی حه‌دیسه‌که‌ هه‌یه‌، نه‌ك له‌سه‌ر ڕشته‌که‌. جا بۆ ئاگاداری زیاتر وتێگه‌یشتنی ته‌واو له‌سه‌ر ئه‌م شه‌ش خاڵه‌ بڕوانه‌: النکت علی کتاب ابن الصلاح / ٢ / ٧٤٦ – ٧٤٨.

زانایان فەرموویانە: ئەم ڕشتەیە کەسەکانی هەموو دادپەروەر وعادلن، وە بچڕانیشی تێدا نیە، بەڵام عیللەتێکی تێدایە، کە وادەکات ڕشتەکە (صحیح) نەبێت، ئەویش ئەوەیە کە سوفیان فەرموویەتی: لە عەمری کوڕی دینارەوە. کەچی ڕاستیەکەی ئەوەیە کە عەبدوڵای کوڕی دینارە. بەڵام لەم گێڕانەوەیەدا ڕاوی یەکەم وای گومان بردووە کە عەمرە نەوەك عەبدوڵا، ئەگەرچی هەردووکیشیان هەر جێگەی متمانەن. بۆیە فەرموویانە: دەقی ئەم حەدیسە (صحیح)ە، ئەگەرچی ڕشتەکەشی (صحیح) نەبێت. [1]

- نموونەی ئەو عیللەتەش کە لە دەقی حەدیسێکدا هەیە، بەڵام کاریگەری تەنها لەسەر دەقی حەدیسەکە خۆی دەبێت، نەوەك ڕشتەی گێڕانەوەکەی، ئەو حەدیسەیە کە (تەنها) ئیمامی موسلیم (بەبێ بوخاری) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هێناویێتی، کە باس لە خوێندنی سورەتی (الفاتحة) دەکات بەبێ (بسم الله الرحمن الرحيم)، وەك دەفەرموێت: (فَكَانُوا يَسْتَفْتِحُونَ الْقِرَاءَةَ بِـ { الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ }، لاَ يَذْكُرُونَ بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ فِي أَوَّلِ قِرَاءَةٍ وَلاَ فِي آخِرِهَا).

هەندێك لە زانایان فەرموویانە: عیللەت لە دەقی ئەم حەدیسەدا هەیە. چونکە زۆرینەی ئەو کەسانەی کە ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردووە، تەنها ئەوەندەیان فەرمووە: (فَكَانُوا يَسْتَفْتِحُونَ الْقِرَاءَةَ بِـ{ الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ })، ئیتر باسی (بسم الله)یان نەکردووە، هەروەکو لە هەردوو صەحیحی بوخاری وموسلیمدا هاتووە. جا ئەو زانایانە فەرموویانە: ئەو کەسەی کە حەدیسەکەی بەو جۆرە ڕیوایەت کردووە، کە گوایە (بسم الله)یشی تیایە، ئەوە حەدیسەکەی بەو جۆرە ڕیوایەت کردووە، کە خۆی لێی تێگەیشتووە، واتە: وا تێگەیشتووە کە حەدیسەکە فەرموویەتی: نوێژیان بە (الْحَمْدُ للَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ) دەست پێدەکرد، ئیتر ئەوە وا دەگەیەنێت کە (بسم الله)یان بۆ نەکردووە. خۆی چۆن لێی تێگەیشتووە، هەر واش

---

(١) بڕوانە: الإرشاد في معرفة علماء الحديث / ١ / ٣٤١ / بە ژمارە ٧٢، ومقدمة ابن الصلاح / ٥٣ – ٥٤، والمقنع في علوم الحديث / ٢١٤، والمنهل الروي / ٥٢.

ڕیوایەتی کردووە. بەڵام لەم تێگەیشتنەیدا بە هەڵەدا چووە، چونکە مانای حەدیسەکە تا بەم جۆرەیە: ئەو سوورەتەی کە لە سەرەتای نوێژدا دەیاخوێنددەوە، بریتی بوو لە سورەتی (الفاتحة)، ئیتر هیچ پەیوەندیشی بە باسی (بسم الله)یوە نیە. [1]

## حوکمی حەدیسی ( معلّل )

بە ورد بوونەوە لەو پێناسەیەی کە زانایان کردوویانە بۆ ئەم جۆرە حەدیسە، وە بە گەڕانەوە وبەستنەوەی ئەم باسە بە باسی مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) و(حسن)ەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم جۆرە حەدیسە دەچێتە ڕیزی حەدیسە (ضعیف)ەکانەوە. چونکە لە پێناسەکەدا هاتووە کە عیللەتەکە کاریگەری دەبێت لەسەر ئەو حەدیسەی کە بە ڕواڵەت لە (صحیح) دەچێت، وە لە باسی مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) و(حسن)یشدا وتمان: دەبێت ئەو حەدیسە خاڵی بێت لە عیللەتێك کە کاریگەری هەبێت لەسەری.

کەواتە دەتوانین بڵێین: ئەم جۆەر حەدیسە بە یەکێك لە جۆرەکانی حەدیسی (ضعیف) دادەنرێت. [2]

---

(١) بروانە: الإرشاد في معرفة علماء الحديث / ١ / ٣٤١ / بە ژمارە ٧٢، ومقدمة ابن الصلاح / ٥٤.

(٢) ڕەنگە تا لێرەدا گومانێك درووست ببێت، وپرسیار بکرێت: ئایا پێشتر فەرمایشتی شێخی عەسقەلانیت نەهێنا لەسەر جۆرەکانی عیللەتی حەدیس، کە فەرموویوی: هەندێکیان کاریگەریان نابێت نە لەسەر دەقی حەدیسەکە ونە لەسەر ڕشتەی گێڕانەوەکەشی، ئیتر چۆن ئێستا دەڵێیت: حەدیسی (معلّل) جۆرێکە لە جۆرەکانی حەدیسی (ضعیف) ؟!

لەوەلامدا دەڵێین: زانایانی فەرموودەناس هەرکەی باسی عیللەتی حەدیسیان کردبێت، بەو جۆرە باسیان کردووە کە کاریگەری دەبێت لەسەر (صحیح)ی حەدیس، بەلام ئەوەی کە دەوترێت: هەندێك جۆری عیللەت کاریگەریان دەبێت وهەندێك جۆریشی کاریگەریان نابێت، ئەمە هەر تەنها جۆرە دابەشکردنێکی عیللەتە وهیچی تر، ئەگینا بەلای تێکڕای فەرموودەناسانی پێشینەوە، هەر کە باسی عیللەت کرا، ئەوە مەبەستیان ئەو عیللەتەیە کە کاریگەری هەیە، نەك شتێکی تر. بۆیە ئەم گومانە تەنها بۆ کەسێك درووست دەبێت کە ئاشنایی وشارەزایی نەبێت سەبارەت بە زاراوەی فەرموودەناسان.

وَذُو اخْتِلاَفِ سَنَدٍ أوْ مَتْنِ    مُضْطَرِبٌ عِنْدَ أُهَيْلِ الفَنِّ

---

# جۆری بیست و پێنجەم

## حەدیسی (المُضْطَرِب)[١]

واتە: ئەو حەدیسەی کە جیاوازی لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا یان لە دەقەکەیدا هەیە، ناوی (مُضْطَرِب)ە بەلای فەرموودەناسانەوە.

بەو پێیەی کە مامۆستا هۆنراوەیەکی کورتی داناوە، بۆیە هەوڵی داوە کە ئەگەر بکرێت، جۆرێك حەدیس یان دوو جۆر لە یەك دێڕ لە هۆنراوەکەدا بە پێناسەوە جێگە بکاتەوە، بۆیە زۆر جار ئەو پێناسانەی کە کردوونی پێویستیان بە زیاتر ڕوونکردنەوە هەیە، بۆ ئەوەی بە باشی لە مانا وناسینی ئەو حەدیسە حاڵی ببین.

هەر بۆیە پێم باشترە، بەڵکو بە پێویستی دەزانم کە لەم جێگەیەدا بەتایبەتی، پێناسەی ئەم جۆرە حەدیسە بهێنم، بەو جۆرەی کە زانایان کردوویانە، تاوەکو بە تەواوەتی حەدیسەکە بناسین، ولە جۆرەکانی تری جیا بکەینەوە.

شێخی شارەزووری فەرموویەتی: ئەو حەدیسەیە کە گێڕانەوەکەی لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوازە (ئیتر لە دەقی حەدیسەکەدا، یان لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا).

پاشان بۆ ئەوەی کەس ڕەخنە نەگرێت، بڵێت: ئەم پێناسەیە هەندێك جۆری تریش دەگرێتەوە ! کەوابوو پێناسەیەکی ڕێگر نیە لە جێبوونەوەی جۆرەکانی تری حەدیس !! بۆیە

---

(١) لەسەر چۆنێتی خوێندنەوەی ناوی ئەم حەدیسە، زیاتر لەناو زانایاندا وا مەشهوورە کە پیتی پێش کۆتایی (واتە: ڕائەکە) کەسرەی لەژێردایە، واتە لە زمانی عەرەبیدا بە (اسم الفاعل) دادەنرێت. بەڵام هەندێکیشیان پێیان وایە کە ڕاستتر وەهایە ڕائەکە فەتحەی لەسەر بێت، واتە لە زمانی عەرەبیدا بە (اسم المكان) دادەنرێت. جا ئەگەر بە (اسم الفاعل) دابنرێت، ئەوە مانای وایە ڕیوایەتەکە ناجێگیرە، وە ئەگەر بە (اسم المكان) دابنرێت، ئەوە مانای وایە ڕیوایەتەکە جێگەی ناجێگیرییە. کە پێم وایە زیاتر ئەم ناکۆکیەش تەنها لەڕووی زمانەوانیەکەوەیە، ئەگینا هەرچۆن بخوێنرێتەوە، وەکو زاراوە لای فەرموودەناسان یەکە، وهەر هەمان پێناسەی هەیە.

ڕاستەوخۆ پاش پێناسەکە فەرمووی: ئێمە کاتێك بەم ناوەوە ناوی دەنێین، کە هەردوو ڕیوایەتەکە یەکسان بن، بەڵام ئەگەر یەکێکیان لەوی تریان بەهێزتر بوو، بەجۆرێك کە ئەوی دووەم لەبەرامبەریدا خۆی پێ ڕانەدەگیرا، چونکە ڕاوی ئەوەی یەکەم بیرتیژتر بوو، یان زۆرتر لە خزمەتی ئەو مامۆستایەدا بوو کە حەدیسەکەی لێوە ڕیوایەت کردووە، یان بە هەر جۆرێکی تر کە ببێتە هۆی لەپێشدانانی ڕیوایەتی یەکەم، ئەوا ئێمە بڕیار دەدەین کە بە ڕیوایەتی یەکەم وەربگیرێت، و واز لەوەی دووەم بهێنرێت، وە لەم کاتەشدا پێی ناڵێین: (مضطرب)، وە حوکمی ئەویش وەرناگرێت.[1]

لەم پێناسەیەوە دەردەکەوێت کە کاتێك حەدیسێك بەم ناوەوە ناو دەنرێت، کە چەند مەرجێکی تێدا هاتبێتە جێ:

١) دەبێت جیاوازی هەبێت لە دەقی حەدیسەکە یان ڕشتەی گێڕانەوەکەی.

٢) دەبێت حەدیسەکە هەر یەك حەدیس بێت، بەڵام بە دوو ڕیوایەتی جیاواز.

٣) دەبێت هەردوو ڕیوایەتەکە یەکسان بن، ونەکرێت هیچکامیان پێش بخرێت بەسەر ئەوی تریاندا.

٤) نەگونجێت تەوفیق بخرێتە نێوان ئەو دوو ڕیوایەتە جیاوازە، بەو ڕێسایانەی کە فەرموودەناسان دایان ناون بۆ تەوفیق خستنە نێوان ڕیوایەتە جیاوازەکان.[2]

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٥.

(٢) ئەم دوو مەرجەی کۆتایی وەهایان کردووە کە زۆر جار ڕەنگە حەدیسێك بەلای یەکێك لە زانایانەوە بە (مضطرب) دابنرێت، بەڵام بەلای هەندێکی تریانەوە بە (مضطرب) دانەنرێت، چونکە بەلای ئەوانەی یەکەمەوە ناکرێت هیچکام لە ڕیوایەتەکان پێش بخرێت بەسەر ئەوی تریاندا، یان ناکرێت تەوفیق بخرێتە نێوانیانەوە، بەڵام بەلای ئەوانەی دووەمەوە دەکرێت. بۆ نموونە: حەدیسێك هەیە کە باس لە دانانی شتێك دەکات لەبەردەمی نوێژخوێندا لەکاتی نوێژەکەیدا، خۆ ئەگەر شتێکی دەست نەکەوت، ئەوا باوەکو عەصایەك (دارێك) دابچەقێنێت، خۆ ئەگەر ئەویشی دەست نەکەوت، ئەوا باوەکو هێڵێك لەبەردەمی خۆیدا بکێشێت. ئەم حەدیسە شێخی شارەزووری وحافظی عێراقی بە (مضطرب)ی دادەنێن، بەڵام شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە وای فەرمووە، نەیپێکاوە، بەڵکو ئەم حەدیسە حەدیسێکی (حسن)ە. بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٥، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٩١، وبلوغ المرام في أحاديث الأحكام / حەدیسی ژمارە ٢٣٦. هەر بۆیە زانایان ئەم باسەشیان بە یەکێك لە گرنگترین باسەکانی ئەم زانستە داناوە.

كەواتە ئەگەر دوو ڕیوایەت هەبوو، بەلاّم جیاوازی نە لە دەق ونە لە ڕشتەی گێڕانەوەكەدا نەبوو، ئەوا ناكرێت باسی (اضطراب) بكەین.

هەروەها ئەگەر دوو ڕیوایەت هەبوو، بەلاّم هەر یەكەیان حەدیسێكی تایبەت بوون، ئەگەرچی هەردووكیشیان لە یەك باس وبابەتدا هاتبن، ئەوا دووبارە هەر ناكرێت باسی (اضطراب) بكەین.

هەروەها ئەگەر دوو ڕیوایەتەكە دەكرا یەكێكیان پێش بخرێت بەسەر ئەوی تریاندا، لەبەر ئەوەی كە ڕاویەكانی متمانەدار ترن، یان زۆر ترن، یان.... ئەوا هەر دەبێت بە ڕیوایەتە بەهێزەكەیان وەربگیردرێت، وئەوی تریان واز لیّ بهێنرێت. وەكو لە باسی حەدیسی (شاذ)دا بە درێژی باسمان كرد.

لە كۆتاییدا، ئەگەر گونجا تەوفیق بخرێتە نێوان ئەو دوو ڕیوایەتە جیاوازەوە، بەپێی ئەو ڕێسایانەی كە فەرموودەناسان دایان ناون بۆ تەوفیق خستنە نێوان ڕیوایەتە جیاواز وناكۆكەكانەوە، ئەوا هەردوو ڕیوایەتەكە پێی وەردەگیرێت وهیچكامیان ناخرێتە لاوە.[1]

## ناجێگیری لە كوێی حەدیسدا دەبێت؟ وە چۆن دەبێت؟

بەو پێیەی كە حەدیس دوو لایەنی هەیە: دەق، ورشتەی گێڕانەوە. بۆیە دەكرێت كە ناجێگیریەكە تەنها لە دەقی حەدیسەكەدا بێت، یان تەنها لە ڕشتەی گێڕانەوەكەیدا، یان لە هەردووكیاندا.

---

(١) بۆ تێگەیشتن لەم حاڵەتە نموونەیەك دەهێنینەوە، كە زۆرێك لە زانایان بە (مضطرب)یان داناوە، ئەویش حەدیسێكی حەزرەتە، لە وەلاّمی پرسیاری كەسێكدا فەرموویەتی: (إِنَّ فِي الْمَالِ لَحَقًّا سِوَى الزَّكَاةِ). بەلاّم لەڕیوایەتێكی تردا هاتووە كە حەزرەت فەرموویەتی: (لَيْسَ فِي الْمَالِ حَقٌّ سِوَى الزَّكَاةِ). جا هەندێك لە زانایان فەرموویانە: دەكرێت تەوفیق بخرێتە نێوان ئەم دوو ڕیوایەتەی كە بە ڕواڵەت دژی یەكن وپێچەوانەن، بەوەی كە ڕیوایەتی یەكەم تایبەت بكرێت بە خێر وخێراتی سوننەت، وە ڕیوایەتی دووەمیش تایبەت بكرێت بە مافی پێویست، كە بێگومان مافی پێویست لەسەر ماڵ تەنها زەكاتە. بەمەش فەرموویانە: ئەم دوو ڕیوایەتە بۆ ئەم باسە درووست نین، چونكە دەكرێت بەم جۆرە تەوفیق بخرێتە نێوانیانەوە. بڕوانە: فتح المغيث / ١ / ٢٦٠، وتدريب الراوي / ٢٢٥، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٨٢، وشرح الزرقاني على البيقوني مع حاشية الأجهوري / ١٩٥.

بەڵام ئەوەندە هەیە کە زانایان بە زۆری پێیان وایە کە ناجێگیری ئەگەر لە دەقی حەدیسێکدا هەبوو، ئەوا لە ڕشتەی گێڕانەوەکەشیدا هەر هەیە، ئەگینا زۆر بە کەمی ڕێك دەکەوێت کە ناجێگیری تەنها لە دەقی حەدیسەکەدا بێت وبەس.(١)

دەگێڕنەوە کە شێخی (ابن خزيمة) یەکێك بووە لەو کەسانەی کە زۆر باسی لەو حەدیسانە کردووە کە لە ڕواڵەتدا لە نێوان دەقی حەدیسەکەدا (اضطراب) هەیە، تا گەیشتوەتە ئەو قەناعەتەی کە فەرموویەتی: من وا نازانم کە دوو حەدیس لە حەزرەتەوە بە دوو ئیسنادی (صحيح) ڕیوایەت کرابن، ودەقەکەشیان دژی یەکتر بێت، جا هەر کەسێك کە نموونەیەکی لەم بارەوە لەلایە، با بیهێنێت، تاوەکو بۆی یەك بخەم.(٢)

زانایان نموونەیان بۆ جیاوازی دەقی حەدیس، بەو حەدیسەی حەزرەت هێناوەتەوە کە لە وەڵامی پرسیاری کەسێکدا، بە دوو ڕیوایەت، فەرموویەتی: (إِنَّ فِي الْمَالِ لَحَقًّا سِوَى الزَّكَاةِ). بەڵام لەڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە حەزرەت فەرموویەتی: (لَيْسَ فِي الْمَالِ حَقٌّ سِوَى الزَّكَاةِ).

---

(١) بڕوانە: نزهة النظر / ١١٧، وفتح المغيث / ١ / ٢٦٠. ئیمامی سەخاوی دەفەرموێت: {شێخی عەسقەلانی لە باسی ئەم جۆرە حەدیسەدا کتێبێکی داناوە، کە بە زۆری نموونەکانی لە کتێبی (العلل الواردة في الأحاديث النبوية)ی ئیمامی (دار قطني) هێناوە، وناوی ناوە: (المقترب في بيان المضطرب)}. بەڵام ئەو کتێبە وێنەی دەست ئێمە نەکەوتووە، ئەگەرچی یەکێك لە توێژەرەکانی زانستی فەرموودەناسی بەناوی: (أحمد بن عمر بن سالم بازمول)، کە وانەبێژ بووە لە پەیانگەی حەرەمی مەککی، کتێبێکی (ماستەر نامە لە زانکۆی أم القرى) بە هەمان ناونیشانی ئەو کتێبەی شێخی عەسقەلانی نووسییوە، کە ئەویش هەوڵی داوە ئەو باسە بە تێر وتەسەلی بهێنێت، من پێم وایە تا ڕادەیەکی باش سەرکەوتوو بووە. سوپاس بۆ خوا ئەم ماستەرنامەیە بەچاپ گەیەنراوە بۆ جاری یەکەم لەساڵی ١٤٢٢ – ٢٠٠١، لەلایەن (دار الخراز – المملكة العربية السعودية، ودار ابن حزم – بيروت – لبنان).

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٧٠، وفتح المغيث / ٢ / ٧١، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ١٠٩، وتدريب الراوي / ٤٧١.

جا وەك بە ئاشكرا دیارە ئەم دوو حەدیسە دژ بە یەكترن، بۆیە ئەو زانایانە فەرموویانە: دژایەتی نێوان ئەم دوو حەدیسە تەئویل ناكرێت.(١)

بۆ نموونەی جیاوازی لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسدا، زانایان چەندین نموونەیان هێناوەتەوە، لەوانە: ئەو حەدیسەی حەزرەت كە ئیمامی ئەبو بەكر پرسیاری لێ كردووە: ئەی پێغەمبەری خودا، وا ئەبینم پیر بوویت !؟ ئەویش فەرمووی: (شَيَّبَتْنِي هُودٌ وأَخَوَاتُهَا).(٢)

ئەم حەدیسە وەكو زانایان فەرموویانە: تەنها لە ڕێگەی (أبو إسحاق السبيعي)ەوە لە نزیكەی دە ڕێگەوە ڕیوایەت كراوە، هەندێكیان بە مورسەلی، وە هەندێكیشیان بە مەوصوولی، هەندێكیان لە ڕیزی موسنەدەكانی ئیمامی ئەبو بەكرەوە هێناویانە، هەندێكیشیان لە ڕیزی موسنەدەكانی سەعد، وە هەندێكیشیان لە ڕیزی موسنەدەكانی دایكە عائیشە، وە چەند جۆری تریش، وە ئەوەندە هەیە كە تەواوی ڕاویەكانی متمانەدارن، وە

---

(١) بڕوانە: الشذا الفياح / ١ / ٢١٥، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٩٣، وتدريب الراوي / ٢٢٥، والنكت على مقدمة ابن الصلاح / ٣ / ٧٩٨، واليواقيت والدرر / ٢ / ٩٧. بەڵام وەكو پێشتر ئاماژەم پێدا، هەندێك لە زانایان تەوفیقیان خستوەتە نێوان ئەم دوو ڕیوایەتەوە، وفەرموویانە: (اضطراب) نیە لە نێوانیاندا. بۆیە ئیمامی (سیوطي) ڕاستەوخۆ پاش ئەم نموونە دەفەرموێت: نموونەی ڕاست حەدیسی ئەو ئافرەتەیە كە خۆی بەخشیبوو بە حەزرەت كە مارەی بكات، دواتر پیاوێك هات ووتی بە حەزرەت كە لێم مارە بكە وبیدە بە من. ئەم حەدیسە بە چەندین تەعبیر ڕیوایەت كراوە، كە هەموویان لە ڕێگەی: (سلمة بن دينار) كە ناسراوە بە: (أبو حازم الأعرج). بەم شێوانە ڕیوایەت كراون: (أَنْكَحْتُكَها)، (زَوَّجْتُكَها)، (مَلَّكْتُكَها)، (مُلِّكْتَها)، (زَوَّجْناكَها)، (فَزَوَّجَه)، (أَنْكَحْتُكَ)، (أَمْلَكْتُها)، (أَمْلَكْتُكَها)، (زَوَّجْتُكَ).

(٢) مەبەست بە (أخواتها)، وەكو لە هەندێك ڕیوایەتی تردا هاتووە، بریتین لە سوورەتەكانی: (الواقعة) و(الحاقة) و(القيامة) و(المرسلات) وعم يتساءلون (النبأ) وإذا الشمس كورت (التكوير) وإذا السماء انفطرت (الانفطار) وإذا السماء انشقت (الانشقاق). بڕوانە: مصنف عبد الرزاق / باب تعليم القرآن وفضله / حەدیسی ژمارە ٥٩٩٧، وحلية الأولياء / ب٤ / ل٣٥٠، المعجم الكبير، للطبراني/ باب السين / سهل بن سعد الساعدي ذكر سنّ سهل بن سعد ووفاته / حەدیسی ژمارە ٥٨٠٤، والطبقات الكبرى، لابن سعد / ب١ / ل٤٣١ – ٤٣٦.

ناشکرێت کە هیچکام لە ڕیوایەتەکان پێش بخرێت بەسەر ئەوانی تردا، وە ناشکرێت کە تەوفیق بخرێتە نێوانیان وپێك بهێنرێنەوە. [1]

شێخی عەسقەلانی لە شێخ (أبو سعید العلائي)مامۆستای خۆیەوە نقلْ دەکات، کە جیاوازی وناکۆکی نێوان دوو ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێك، دەکرێت بە یەکێك لەم شێوانە بێت:

١) یەکێکیان (موصول)ە، وئەوی تریان (مرسل)ە.

٢) یەکێکیان (موقوف)ە، وئەوی تریان (مرفوع)ە.

٣) یەکێکیان (متصل)ە، وئەوی تریان (منقطع)ە.

٤) کۆمەڵێك حەدیسێکیان لە کەسێکەوە، ئەویش لە یەکێك لە تابیعینەوە، ئەویش لە هاوەڵێکی حەزرەتەوە ڕیوایەت کرد، وە کۆمەڵێکی تر هەر لە هەمان کەسەوە، بەڵام لە یەکێکی تردوە لە تابیعین، وئەویش هەر لە هەمان هاوەڵەوە ڕیوایەت کرد.

٥) زیاد کردنی کەسێك لە یەکێك لە دوو ڕشتەکەدا.

٦) جیاوازی لە ناوی ڕاوییەك یان نەسەب ونەژادی ئەو ڕاویە، ئەگەر نەدەزانرا ئایا کەسێکی متمانەدارە، یان (ضعیف)ە.

## حوکمی حەدیسی ( مضطرب )

بەو پێیەی کە جیاوازی هەیە لە نێوان ڕیوایەتەکانی ئەم جۆرە حەدیسەدا، ئیتر ئایا لە دەقی حەدیسەکەدا، یان لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا، ئەمەش دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەو ڕاویەی ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردووە کەسێکی بیرتیژ وزیرەك نەبووە، وزەبتی نەبووە،

---

(١) بڕوانە: فتح المغیث / ١ / ٢٥٩ - ٢٦٠، وتدریب الراوي / ٢٢٤، وتوجیه النظر / ٢ / ٥٨٢. بۆ زانیاری زیاتر لەسەر هەموو ڕیوایەتەکان وجیاوازی نێوانیان، بڕوانە: العلل الواردة في الأحادیث النبویة، للدار قطني / ١ / ١٩٣ - ٢١١.

بۆیە زانایان پێیان وایە کە ئەم جۆرە حەدیسە یەکێکە لەو حەدیسانەی کە لە ڕیزی حەدیسە (ضعیف)ەکاندا دەژمێردرێن.[1]

بەڵام وەکو لە باسەکەی پێشوودا باسمان کرد، دەگونجێت کە ناکۆکی نێوان دوو ڕیوایەتەکە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا، تەنها لەسەر ناو یان نەژادی یەکێك لە ڕاویەکان بێت، بۆیە لەم کاتەدا ئەگەر هەردوو ڕاویەکە وەکویەك متمانەدار بوون، ئەوا ئەو جیاوازیە هیچ کاریگەری نابێت لەسەر (صحیح)ی حەدیسەکە، چونکە هەرکامیان بن، هەر متمانەدارن.[2]

شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: هەندێك جار دەکرێت بە حەدیسێك بوترێت: (صحیح ومضطرب)، بەڵام ئەوەندە هەیە کە ئەم جۆرە حەدیسە لە پلەی (صحیح)یدا لە خوار ئەو حەدیسەیە کە بەتەنها پێی دەوترێت (صحیح) وبەس.

جا ئیمامی (سیوطي) دوای ئەوەی کە ئەم فەرمایشتەی شێخی عەسقەلانی دەهێنێت، خۆیشی دەفەرموێت: لە هەردوو کتێبی صەحیحی بوخاری وموسلیمدا لەم جۆرە حەدیسە زۆرن. هەروەها ئیمامی زەرکەشی لە موختەصەرەکەیدا فەرموویەتی: هەندێك جار دەکرێت حەدیسی (صحیح) و(حسن) وەسفدار بکرێن بەوەی کە (مقلوب یان شاذ یان مضطرب)ن.[3]

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٥، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٩٣، وفتح المغيث / ١ / ٢٦١، والمقنع في علوم الحديث، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ٢٢١، والمنهل الروي / ٥٣، توضيح الأفكار / ٢ / ٤٧، وتوجيه النظر / ٢ / ٥٨١، شرح الزرقاني على البيقوني / ١٩٣. لێرەدا ڕەنگە پرسیارێك دروست ببێت، ئەویش ئەوەیە: هەندێك لەو حەدیسانەی کە ناچوونیەکی لە دەقەکانیاندا هەیە، لە صەحیحی بوخاری یان موسلیمدا ڕیوایەت کراون، وەکو ئەو حەدیسەی کە باس لەو ئافرەتە دەکات کە خۆی بەخشیبوو بە حەزرەت، ودواتر پیاوێك هات وخوازبێنی کرد وداوای کرد کە حەزرەت بیدات بە ئەو، حەزرەتیش پێی فەرموو: (أَنْكَحْتُكَها) یان (فقد زَوَّجتُكَها) یان (ملَّكْتُكَها) یان (أَملَكْتُكَها) بما معك من القرآن. جا زانایان فەرموویانە ئەم جۆرە ناچوونیەکیە لە نێوان دەقی ئەو ڕیوایەتانەدا کاریگەری لەسەر (صحیح)ی حەدیسەکە نابێت، چونکە ڕیوایەتەکان تەواو ناچونیەك نین، وماناکانیان هەمووی لە یەك تەوەرەدا دەسوڕێنەوە، بۆیە دەبینین کە ناچونیەکیەکە کاریگەری لەسەر ئەو حوکمە شەرعیە نابێت کە لەو ڕیوایەتانەوە وەردەگیرێت. جا بۆ تێگەیشتنی تەواوەتی لەم پرسیارە ووەڵامەکەی بڕوانە: النكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٨٠٢ – ٨١٠، وعلوم الحديث في ضوء تطبيقات المحدثين النقاد / ١٥٧ – ١٦٠، والمقترب في بيان المضطرب، أحمد بازمول، باسی: قاعدة الاضطراب في المتن.

(٢) بڕوانە: الموقظة في علم مصطلح الحديث / ٥٣.

(٣) بڕوانە: تدريب الراوي / ٢٢٦.

وَالمدْرَجَاتُ فِي الْحَدِيثِ مَا أَتَتْ مِنْ بَعْضِ أَلْفَاظِ الرُّوَاةِ اتَّصَلَتْ

# جۆری بیست وشەشەم

# حەدیسی ( المُدْرَج )

واتە: حەدیسی (مدرج) ئەو حەدیسەیە کە هەندێك قسەی یەکێك لە ڕاویەکانی پێوە لکاوە.

ئەم پێناسەیەی مامۆستا لەلایەك پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە، ولە لایەکی ترەوە تەنها جۆرێك لە جۆرەکانی حەدیسی (مدرج) دەگرێتەوە، کە پێی دەوترێت: (المدرج في المتن).[1]

پێویستی بە ڕوونکردنەوە هەیە، چونکە پێناسەی درووست وروون ئەوەیە کە بوترێت: وتەی یەکێك لە ڕاویەکان تێکەڵ دەکرێت ودەلکێنرێت بە حەدیسەکەوە، بە جۆرێك کە جیا ناکرێتەوە لە دەقی حەدیسەکە.

هەروەها پێناسەیەکی وەها کە هەردوو جۆرەکەی حەدیسی (مدرج) بگرێتەوە، ئەوەیە کە بوترێت: ئەو حەدیسەیە کە لە دەقەکەیدا یان لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا شتێکی بۆ زیاد کراوە لەلایەن یەکێك لە ڕاویەکانەوە، بەبێ ئەوەی کە ڕوون بکرێتەوە، ئەو حەدیسە شتێکی بۆ زیاد کراوە.

## جۆرەکانی حەدیسی ( مُدْرَج )

زانایان بە شێوەیەکی گشتی ئەم جۆەر حەدیسەیان دابەش کردووە بۆ دوو جۆر، هەر وەکو ئێمەش لە پێناسەکەی سەرەوەدا ئاماژەمان پێداون، کە ئەوانیش:

١) المدرج في المتن: ئەو حەدیسەیە کە شتێك بۆ دەقەکەی زیاد کراوە، کە وتەی خاوەنەکەی نیە، وبەشێك نیە لە حەدیسەکە، بەجۆرێك کە نازانرێت ئایا بەشێکە لەو حەدیسە، یان بەشێك نیە وبۆی زیاد کراوە.

---

(١) دەکرێت بڵێین: مامۆستای دانەریش یەکێکە لەو زانایانەی کە پێیان وایە (المدرج في المتن) جۆرەکەی تریش دەگرێتەوە، کە پێی دەوترێت: (المدرج في السند). بڕوانە: الاقتراح في بيان الاصطلاح / ٢٢، والموقظة في علم مصطلح الحديث / ٥٣، والباعث الحثيث / ٦٢ – ٦٣.

٢) المدرج في السند: ئەو حەدیسەیە کە شتێك زیاد کراوە بۆ ڕشتەی گێڕانەوەکەی، بەبێ ئەوەی لەو ڕشتەیەدا هەبێت.

ئەوجا زانایان هاتوون، جارێکی تر هەر یەکە لەم دوو جۆرەشیان دابەش کردووە بۆ چەند جۆرێکی تر، ئەوەتا فەرموویانە:

١) ئەو زیادەیەی کە دەخرێتە سەر دەقی حەدیسێك، دەکرێت بخرێتە سەرەتای دەقی حەدیسەکە، یان بخرێتە ناوەندی دەقی حەدیسەکە، یان بلکێنرێت بە کۆتایی دەقی حەدیسەکەوە. جا بۆ زیاتر ڕوونی بۆ هەر یەکە لەم جۆرانە نموونەیەك دەهێنینەوە:

- شتێك لە سەرەتای دەقی حەدیسەکەوە زیاد کراوە، کە ئەم جۆرەیان زۆر کەمە: وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی ئەبو هورەیرە ڕیوایەتی دەکات لە حەزرەتەوە کە فەرموویەتی: « أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ، وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ ». ئێستا ئەم حەدیسە لە ئەصڵدا تەنها بەشی کۆتاییەکەی فەرموودەی حەزرەتە، ئەگینا بەشی سەرەتاکەی فەرمایشتی ئەبو هورەیرەیە، وهاوەڵانی پێ هەڵناوە وهانی داون کە بە باشی دەستنوێژەکانیان بشۆرن، چونکە حەزرەت ئاوا دەفەرموێت. بەڵام ئەو کەسەی کە ئەم حەدیسەی ڕیوایەت کردووە، وای گومان بردووە کە حەدیسەکە بە هەردوو بەشەکەیەوە فەرموودەی حەزرەتە، کە لە ئەصڵدا وانیە. چونکە زۆرینەی ئەو کەسانەی کە ئەم حەدیسەیان ڕیوایەت کردووە، بەم جۆرەیان ڕیوایەت کردووە کە بەشی یەکەمی فەرمایشتی ئەبو هورەیرە بێت وبەشی دووەمیشی فەرموودەی حەزرەت، هەروەکو لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە کە ئەبو هورەیەر فەرموویەتی: (أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ فَإِنَّ أَبَا الْقَاسِمِ (صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) قَالَ وَيْلٌ لِلأَعْقَابِ مِنَ النَّارِ).[١]

---

(١) بروانە: الفصل للوصل المدرج في النقل، للخطيب البغدادي / ١ / ١٥٨ – ١٦٤، والتقييد والإيضاح / ١٢٨، والشذا الفياح / ١ / ٢١٩، والنكت على مقدمة ابن الصلاح / ٣ / ٨٠٠، وتدريب الراوي / ٢٢٩، وتوضيح الأفكار / ٢ / ٥٥، وتوجيه النظر / ١ / ٤٠٩ – ٤١٠، وصحيح البخاري / كتاب الوضوء / باب غسل الأعقاب / حەدیسی ژمارە ١٦٣.

- شتێك لە ناوەندی حەدیسەكە زیاد كراوە، كە ئەمەشیان هەر كەمە، وەكو ئەو حەدیسەی كە ئیمامی (دار قطني) هێناویەتی، كە حەزرەت فەرموویەتی: (مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ أَوْ أُنْثَيَيْهِ أَوْ رُفْغَيْهِ فَلْيَتَوَضَّأْ). پاشان فەرموویەتی: ئەوەی كە فەرموودەی حەزرەتە، تەنها ئەوەندەیە كە فەرموویەتی: (من مس ذكره فليتوضأ)، بەڵام ئەوەی كە زیاد كراوە بریتیە لە وتەی عوروەی كوڕی زوبەیر، بەڵام ڕاویەكە، كە ناوی عەبدولحەمیدی كوڕی جەعفەرە، زیادی كردووە، وكردوویەتی بەناو دەقی حەدیسەكەدا.[1]
- شتێك لە كۆتایی حەدیسەكە زیاد كراوە، كە ئەمەیان زۆر زۆرە، وەكو ئەو حەدیسەی كە باسی ئەوە دەكات كە چۆن حەزرەت تەحیاتی نوێژی فێری عەبدولای كوڕی مەسعود كردووە، كە پێی فەرمووە: « قُلِ التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ، السَّلاَمُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ، السَّلاَمُ عَلَيْنَا وَعَلَى عَبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ، أَشْهَدُ أَنْ لاَ إِلَهَ إِلاَّ اللَّهُ، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ ». پاشان لە كۆتایی حەدیسەكەدا وتراوە: (إِذَا فَعَلْتَ هَذَا أَوْ قَضَيْتَ هَذَا فَقَدْ قَضَيْتَ صَلاَتَكَ، إِنْ شِئْتَ أَنْ تَقُومَ فَقُمْ، وَإِنْ شِئْتَ أَنْ تَقْعُدَ فَاقْعُدْ). جا زانایان فەرموویانە: ئەم بەشەی كۆتایی كە زیاد كراوە، فەرمایشتی عەبدولا خۆیەتی، نەوەكو بەشێك بێت لە فەرموودەكەی حەزرەت، بەڵكو زیادەیە ولكێنراوە بە فەرموودەكەی حەزرەتەوە، لەلایەن یەكێك لە ڕاویەكانەوە بە ناوی: زوهەیری كوڕی موعاویەوە.[2]

---

(١) بروانە: سنن الدار قطني / كتاب الطهارة / باب ما روي في لمس القبل والدبر والذكر والحكم في ذلك / حەدیسی ژمارە ١٠. هەروەها بروانە: الفصل للوصل المدرج في النقل / ١ / ٣٤٦.

(٢) بروانە: سنن الدار قطني / كتاب الصلاة / باب صفة التشهد ووجوبه واختلاف الروايات فيه / حەدیسی ژمارە ١١. ومعرفة علوم الحديث / ٨٤، والسنن الكبرى، للبيهقي / كتاب الحيض / باب تحليل الصلاة بالتسليم / حەدیسی ژمارە ٢٧٩١، والفصل للوصل المدرج في النقل / ١ / ١٠٣ – ١٠٤. ئیمامی نەواوی لەسەر ئەم حەدیسە فەرموویەتی: ((اتّفقَ الحفّاظُ على أنّها مُدرجةٌ)). بروانە: خلاصة الأحكام في مهمات السنن وقواعد الإسلام / ١ / ٤٤٩ / حەدیسی ژمارە ١٤٧٢، أبو زكريا محيي الدين يحيى بن شرف النووي / حققه وخرج أحاديثه: حسين إسماعيل الجمل / مؤسسة الرسالة - لبنان – بيروت / الطبعة الاولى ١٤١٨هـ - ١٩٩٧م / عدد الأجزاء: ٢. هەروەها بۆ ئەم فەرمایشتەی بروانە هەریەكە لە: الشذا الفياح / ١ / ٢١٨، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٩٥، وفتح المغيث / ١ / ٢٦٤، وتدريب الراوي / ٢٢٨، وتوضيح الأفكار / ٢ / ٥٤.

٢) ئەو زیادەیەش کە دەخرێتە سەر ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێك، وەکو زانایان فەرمووویانە، خۆی لە چەند شێوەیەکدا دەبینێتەوە: (١)

- دەقی حەدیسێك لە دوو ڕێگەوە ڕیوایەت کراوە، بەڵام لە یەکێك لە ڕێگەکانەوە زیادەیەکی هەیە، ئەوجا کەسێك دێت دەقی حەدیسەکە بە زیادەکەشەوە ڕیوایەت دەکات لەو ڕێگەیانەوە کە زیادەکەی تێدا نیە. بۆ نموونە: سوفیانی کوڕی عویەینە و زائیدەی کوڕی قودامە لە عاصیمی کوڕی کولەیبەوە، ئەویش لە باوکیەوە، ئەویش لە وائیلی کوڕی حوجرەوە حەدیسێکیان ڕیوایەت کردووە لەبارەی چۆنێتی نوێژکردنی حەزرەتەوە، کە لە کۆتاییەکەیدا هاتووە: (( ثُمَّ جِئْتُ بَعْدَ ذَلِكَ فِي زَمَانٍ فِيهِ بَرْدٌ شَدِيدٌ، فَرَأَيْتُ النَّاسَ عَلَيْهِمْ جُلُّ الثِّيَابِ، تَحَرَّكُ أَيْدِيهِمْ تَحْتَ الثِّيَابِ )). جا ئەم زیادەیە لەم ڕشتەیەدا هاتووە: عاصیمی کوڕی کولەیب، ئەویش لە عەبدولجەباری کوڕی وائیلەوە، ئەویش لە یەکێك لە کەسوکارەکانی خۆیەوە، ئەویش لە وائیلی کوڕی حوجرەوە. کەچی ئەو کەسەی کە دەقی حەدیسەکەی بە زیادەکەوە ڕیوایەت کردووە، لەو ڕێگەیەوە ڕیوایەتی کردووە کە زیادەکەی تێدا نیە.
- دوو حەدیس بە دوو ڕێگەی جیاواز ڕیوایەت کرابن، بەڵام کەسێك بێت، بەشێکی یەکێك لە حەدیسەکان تێکەڵ بکات لەگەڵ ئەوی تریاندا، وبە هەمان ڕشتەش بیگێڕێتەوە. وەکو حەدیسی: « لاَ تَبَاغَضُوا وَلاَ تَحَاسَدُوا وَلاَ تَدَابَرُوا » وە حەدیسی: « لَا تَجَسَّسُوا وَلَا تَحَسَّسُوا وَلَا تَنَافَسُوا وَلَا تَنَاجَشُوا وَلَا تَدَابَرُوا وَلَا تَبَاغَضُوا ». شێخی شارەزووری فەرمویەتی: حەدیسی یەکەم سەعیدی کوڕی ئەبو مەریەم، لە مالیکەوە، ئەویش لە زوهریەوە، ئەویش لە ئەنەسەوە ڕیوایەتی کردووە، کە حەزرەت وەهای فەرمووە، بەڵام (سەعید) هاتووە ڕستەی: (وَلَا تَنَافَسُوا)ی بۆ زیاد کردووە، کە لە حەدیسی دووەمدا هاتووە، کە ڕشتەکەی بریتیە لە: مالیك لە ئەبو زەنادەوە، ئەویش لە ئەعرەجەوە، ئەویش لە ئەبو هورەیرەوە.

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٧، والنكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٨٣٢ – ٨٣٥. هەروەها بۆ زیاتر ڕوونی وباشتر تێگەیشتن لە نموونەکان تەماشای کتێبی (الفصل للوصل المدرج في النقل) بکرێت باشترە.

- کەسێك حەدیسێك لە کۆمەڵێکەوە ڕیوایەت دەکات، کە ناکۆکی هەیە لە نێوانیاندا لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا، بەڵام ئەو حەدیسەکەیان وەها لێ دەگێڕێتەوە کە هیچ ناکۆکیەکیان لە نێواندا نیە. وەکو ئەو حەدیسەی کە عەبدوڵای کوڕی مەسعود پرسیاری کردووە لە حەزرەت کە: (( يا رَسُوْل الله أيُّ الذَّنْبِ أعْظَمُ؟ )). ئێستا ئەم حەدیسە (عبد الرحمن بن مهدي ومحمد بن كثير) لە سوفیانی ثوریـەوە، ئەویش لە (مەنصور، و ئەعمەش، وواصیلی ئەحدەبەوە)، ئەوانیش لە وائیلەوە، ئەویش لە عەمری کوڕی شەرحەبیلەوە، ئەویش لە ئیبنو مەسعودی ڕیوایەت کردووە، بەڵام خۆی ڕاستیەکەی ئەوەیە کە لە ڕشتەی گێڕانەوەکەی واصیلدا عەمری کوڕی شەرحەبیلی تێدا نیە. کەچی ئەوان وایان ڕیوایەت کردووە کە لە هەرسێ ڕێگەکەوە عەمری تێدایە، بەڵام وا نیە.
- کەسێك حەدیسێك ڕیوایەت بکات، کە هەندێکی لە مامۆستاکەیەوە بیستووە، وهەندێکیشی لە کەسێکەوە بیستووە کە ئەو لە مامۆستاکەی بیستووە، ئەوجا کەسێکی تر بێت وتەواوی حەدیسەکە (بە هەردوو بەشەکەوە)، بە جۆرێك ڕیوایەت بکات کە هەمووی لە مامۆستاکەوەیە. کە ئەم جۆرەیان لەگەڵ حەدیسی (مُدَلَّس)دا هاوبەشن. وەکو ئەو حەدیسەی چیرۆکی عورەینیەکان، کە ئیسماعیلی کوڕی جەعفەر لە (حُمَيْد الطويل)ەوە ڕیوایەتی کردووە، ئەویش لە ئەنەسەوە، کە حەزرەت بە عورەینیەکانی فەرموو: (( لَوْ خَرَجْتُمْ إلَى ذَوْدٍ لَنَا فَشَرِبْتُمْ مِنْ أَلْبَانِهَا وَأَبْوَالِهَا )). ئێستە وشەی (وأبوالها) حومەید لە قەتادەی بیستووە، وئەویش لە ئەنەسەوە. بەڵام ئەو کەسەی کە حەدیسەکەی ڕیوایەت کردووە، جیای نەکردۆتەوە، وهەمووی وەها گێڕاوەتەوە کە حومەید خۆی لە ئەنەسی بیستووە.[1]

---

(١) ئەم نموونەیەو نموونەی (ولا تنافسوا) زیاتر لە سەرچاوەکاندا بۆ ئەم (المدرج في السند)ە دەهێنرێنەوە، بەڵام ئەگەر بە وردی بۆیان بڕوانین، دەبینین زیاتر لە (المدرج في المتن) نزیك ترن ! تەنها ئەوەندە هەیە کە ڕاویەکە وتەی خۆی تێکەڵ بە حەدیسەکە نەکردووە، بەڵکو بەشێکی دەقی ڕیوایەتێکی هێناوە ولەگەڵ دەقی ڕیوایەتێکی تردا پێکەوەی نووساندوون، یان بەشێکی دەقی حەدیسێکی هێناوە وتێهەڵکێشی کردووە لەگەڵ دەقی حەدیسێکی تردا.

- کەسێك دەقی حەدیسێکی هێشتری باس نەکردووە، بەڵکو هەر خەریکە یەك بەیەك کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەکەی ناو دێنێت، بەڵام شتێك دێتە پێش کە ڕشتەکەی پێ دەبچڕێنێت، و لەو ناوەنددا شتێك دەڵێت، جا ئەو کەسەی کە گوێی لێیەتی وا تێدەگات کە ئەو قسەی کە کردی بریتیە لە دەقی ئەو حەدیسەی کە خەریك بوو ڕشتەکەی باس بکات. وەکو ئەو حەدیسەی کە دەگێڕنەوە یەکێك لە خواناسە دنیانەویستەکان بە ناوی (ثابت بن موسی) چوەتە مەجلیسی لە (شريك بن عَبْد الله القاضي)دوە، کە خەریکی گێڕانەوەی حەدیسێك بوو، دەیفەرموو: ئەعمەش لە ئەبو سوفیانەوە ئەویش جابیرەوە ڕیوایەتی کردووە، کە حەزرەت فەرموویەتی:....... ئیتر ماوەیەك ڕاوەستا وبێدەنگ بوو، تاوەکو ئەو کەسەی کە دانیشتبوو گوێی لێدەگرت فریا بکەوێت بینووسێتەوە. جا کاتێك کە (شَرِيك) سەری بەرز کردەوە وسەیری دەموچاوی (ثابت)ی کرد، فەرمووی: (( مَنْ كَثُرَتْ صَلاتُهُ باللَّيلِ حَسُنَ وَجْهُهُ بالنَّهارِ )). کە مەبەستی پێی (ثابت) بوو، چونکە کەسێکی زۆر لەخواترس وپارێزکار بووە، بەڵام (ثابت) خۆی وایزانی کە ئەوە دەقی ئەو حەدیسەیە کە دەیویست ڕیوایەتی بکات، کەچی لە ڕاستیدا ئەوە وتەی خۆی بووە نەوەك حەدیسەکە.[1]

## چۆن حەدیسی ( مدرج ) بناسین؟

چەندین ڕێگە هەن بۆ ناسینەوەی ئەم جۆرە حەدیسە، لەوانە:

- ناکرێت ئەو حەدیسە بدرێتە پاڵ حەزرەت. وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی بوخاری لە ئەبو هورەیرەوە ڕیوایەتی دەکات، کە حەزرەت فەرموویەتی: (( لِلْعَبْدِ الْمَمْلُوكِ الصَّالِحِ

(١) ئەم حەدیسە هەندێك لە زانایان بە جۆرێك لە جۆرەکانی حەدیسی (مَوْضُوع)ی دادەنێن، کە ڕاویەکە بە هەڵە درووستی دەکات. بڕوانە: سنن ابن ماجة / كتاب اقامة الصلاة والسنة فيها / باب ما جاء في قيام الليل / حەدیسی ژمارە ١٣٣٣، ومقدمة ابن الصلاح / ٥٩، بەڵام (ابن حبان والحافظ العراقي والعسقلاني) بە جۆرێك لە جۆرەکانی: (المدرج في السند)ی دەزانن. بڕوانە: شرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣١٦.

أَجْرَانِ وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْلَا الْجِهَادُ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالْحَجُّ وَبِرُّ أُمِّي لَأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ وَأَنَا مَمْلُوكٌ )).(١) ئێستا بەشی کۆتایی ئەم حەدیسە (والذی نفسي بیده......) هەمووی فەرمایشتی ئەبو هورەیرە خۆیەتی، چونکە لە دوو ڕووەوە ناکرێت فەرموودەی حەزرەت بێت: یەکەم: حەزرەت ئاوات ناخوازێت کە کۆیلەبێت ! دووەم: دایکی لە ژیاندا نەماوە، تاوەکو چاکەی لەگەڵدا بکات. بۆیە زانایان فەرموویانە: ئەم حەدیسە (مدرج)ە. (٢)

- لە ڕێگەی ترەوە حەدیسەکە ڕیوایەت کراوە، وئەو هاوەڵەی کە لە حەزرەتەوە ڕیوایەتی کردووە، خۆی دەفەرموێت: ئەو ڕستەیەم لە حەزرەت نەبیستووە. وەکو ئەو حەدیسەی کە دەگێڕنەوە لە عەبدولاّی کوڕی مەسعودەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: « مَنْ مَاتَ لاَ يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ وَمَنْ مَاتَ يُشْرِكُ بِهِ شَيْئًا دَخَلَ النَّارَ ». ئێستا ئەم حەدیسە ئیمامی بوخاری هێناویێتی، بەڵام عەبدولاّ فەرموویەتی: من وتوومە: (( مَنْ مَاتَ لَا يُشْرِكُ بِاللَّهِ شَيْئًا دَخَلَ الْجَنَّةَ )). (٣)
- یەکێك لە زانا پایەبەرزە فەرموودەناسەکان (ئیتر خۆی ڕاوی حەدیسەکە بێت یان نا) دەفەرموون کە ئەو حەدیسە (مدرج)ە، وئەو بەشەی وتەی کەسێکی ترە، وبەشێك نیە لە حەدیســەکە. وەکو ئەو حەدیسەی پێشتر هێنامانەوە لەسەر تەحیاتی نوێژ کردن، کە فەرمایشتەکەی عەبدولاّی کوڕی مەسعودی پێوە لکێنرابوو. یان وەکو ئەو حەدیسەی کە ئەنەسی کوڕی سیرین لە عەبدولاّی کوڕی عومەرەوە دەیگێڕێتەوە کە: هاوسەرەکەی

---

(١) بڕوانە: صحيح البخاري، كتاب العتق، باب العبد إذا أحسن عبادة ربه ونصح سيده، حەدیسی ژمارە ٢٤١٠.

(٢) بڕوانە: النكت على كتاب ابن الصلاح: ٨١٣/٢، وتدريب الراوي: ٢٢٩. سەرەڕای ئەوەی کە لە ڕیوایەتی تردا هاتووە کە ئەبو هورەیرە خۆی فەرموویەتی: (وَالَّذِى نَفْسُ أَبِي هُرَيْرَةَ بِيَدِهِ لَوْلاَ الْجِهَادُ فِى سَبِيلِ اللَّهِ وَالْحَجُّ وَبِرُّ أُمِّى لأَحْبَبْتُ أَنْ أَمُوتَ وَأَنَا مَمْلُوكٌ). بڕوانە: الأدب المفرد، للبخاري، الخدم والمماليك، باب من أحب أن يكون عبدا، حەدیسی ژمارە ٢٠٨، وصحيح المسلم، كتاب الأيمان، باب ثواب العبد وأجره إذا نصح لسيده وأحسن عبادة الله، حەدیسی ژمارە ١٦٦٥، ومسند أحمد بن حنبل، مسند المكثرين من الصحابة، مسند أبي هريرة، حەدیسی ژمارە ٨٣٥٤.

(٣) بڕوانە: صحيح البخاري / كتاب الجنائز / باب في الجنائز ومن كان آخر كلامة لا إله إلا الله/ حەدیسی ژمارە ١١٨١.

خۆی تەلآقی دابوو، لە کاتێکدا کە لە سووڕی مانگانەدا بوو، ئیمامی عومەریش گێڕایەوە بۆ حەزرەت، ئەویش فەرمووبووی: (( مُرْهُ فلْيُراجِعْها، فإذا طَهُرَتْ ؛ فَلْيُطَلِّقْها " قال: فَتُحْسَب بالتَّطْليقة؟ قال: فَمَهْ !!. زانای پایەبەرز (الخطيب البغدادي) فەردوویەتی: ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ڕستەی (فَتُحْسَب بالتَّطْليقة؟) وتەی ئەنەسە وپرسیاری لە عەبدولآ کردووە، وعەبدولآش وەلآمی داوەتەوە وپێی فەرمووە: (مَه) واتە: بێ دەنگبە وکۆتایی پێ بهێنە. چونکە موحەممەدی کوڕی جەعفەر ویەحیای کوڕی سەعید و(النضر بن شميل المازني) کە ئەم حەدیسەیان لە شوعبەوە ڕیوایەت کردووە، بەم جۆرە ڕوونیان کردوەتەوە، کە ئەو بەشەی حەدیسەکە فەرموودەی حەزرەت نیە.[1]

- ڕەنگە بەهۆی گەڕان وپشکنینی باش بەشوێن تەواوی ڕیوایەتەکانی حەدیسێکدا بۆمان دەرکەوێت، کە ئەو حەدیسە (مدرج)ە، چونکە لە تەواوی ڕیوایەتەکاندا بە شوێوەیەك هاتووە، بەلآم لە تەنها ڕیوایەتێکدا شتێکی بۆ زیاد کراوە. کە ئەمەش کارێکی ئاسان نیە، وپێویستی بە ڕۆچوون وشارەزاییەکی باش هەیە.

## هۆیەکانی درووست بوونی حەدیسی ( مدرج )

ڕەنگە زۆر هۆکار هەبن کە پالّ بە یەکێك لە ڕاویەکانی حەدیسێکەوە بنێن بۆ ئەوەی شتێکی بۆ زیاد بکات، کە گرنگترینیان ئەمانەن:

- لەوانەیە ڕاویەکە ویستبێتی وشەیەکی غەریب هەیە لەناو حەدیسەکەدا، کە ماناکەی ئاسان نیە، ئەمیش بێت مانای بکات، وتێهەلکێشی بکات لەگەلّ حەدیسەکەدا. وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی بوخاری لە سەرەتای صەحیحەکەیدا هێناویێتی لە (ابن شهاب

---

(١) بڕوانە: الفصل للوصل المدرج في النقل / ١ / ١٥٥. هەروەها بڕوانە: النكت على كتاب ابن الصلاح / ٢ / ٨١٥. شێخی عەسقەلانی دوای ئەوەی کە فەرمایشتەکەی بەغدادی نقلّ دەکات، دەفەرموێت: ئەم ڕێگەی سێیەمیان وەکو دوانەکەی تر دلّنیایی نادات لەسەر ئەوەی کە حەدیسەکە (مدرج) بێت، چونکە بڕیاری ئەو زانا شارەزا فەرموودەناسە لەسەر ئەساسی گومانە، کە ڕەنگە وا نەبێت، بەلآم دوانەکەی تریان وەها نین، بەلکو دلّنیایی دەدەن لەسەر ئەوەی کە حەدیسەکە (مدرج)ە.

الزهري)، ئەویش لەعورووەی کوڕی زوبەیرەوە، ئەویش لە دایکە عائیشەوە لەبارەی چیرۆکی سەرەتای دابەزینی وەحییەوە هاتووە، کە فەرموویەتی: ((وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ وَهُوَ التَّعَبُّدُ اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ)). زانایان فەرموویانە: ڕستەی (وهو التعبد) فەرمایشتی (ابن شهاب)ە، وتێکەڵ بە حەدیسەکە کراوە، مەبەستی وەها بووە کە مانای وشەی (تَحَنُّث) لێك بداتەوە، کە بە مانای بەندایەتی کردن دێت. (١)

- لەوانەیە ڕاویەکە ویستبێتی حوکمێکی شەرعی لەو حەدیسە دەربهێنێت: وەکو ئەو حەدیسەی پێشتر هێنامان، سەبارەت بە دەستنوێژ شکاندن (مَنْ مَسَّ ذَكَرَهُ أَوْ أُنْثَيَيْهِ أَوْ رُفْغَيْهِ فَلْيَتَوَضَّأْ). ئیمامی (سیوطي) فەرموویەتی: لەکاتێکدا کە عورووە وەها تێگەیشتووە لە حەدیسەکە، کە هۆکاری دەستنوێژ شکان بە دەستدان لە (ئامێری جووت بوونی پیاو) بە هۆی ئەوەوەیە کە ئەگەری درووستبوون ووروژاندنی ئارەزووی لێ دەکرێت، بۆیە ئەوەشی لێ وەرگرتووە کە دەستدان لە جێگەیەکیش کە نزیك بێت لە ئەوەوە، وەکو: (هێلکە گونەکان، یان بن ڕان) ئەوانیش هەر دەستنوێژ دەشکێنن، بۆیە ئەوانیشی بۆ زیاد کردووە، بەلاّم دواتر هەندێك لەو کەسانەی کە حەدیسەکەیان ڕیوایەت کردووە، وایان زانیوە کە فەرمایشتە زیادەکەی عوروەش، بەشێکە لە دەقی حەدیسەکەی حەزرەت. (٢)
- لەوانەیە ڕاویەکە ویستبێتی حەدیسەکە بکات بە بەڵگە لەسەر حوکمێکی شەرعی، جا سەرەتا حوکمەکە دەهێنێت، پاشان حەدیسەکەش بە شوێنیدا: وەکو حەدیسەکەی پێشووی ئەبو هورەیرە کە لەبارەی باش دەستنوێژگرتنەوە هێنابووی، کە هەڕەشەی تێدابوو بۆ ئەو کەسانەی کە باش دەستنوێژ ناشۆرن، وپاژنەکانیان تەواو تەڕ ناکەن (أَسْبِغُوا الْوُضُوءَ، وَيْلٌ لِلْأَعْقَابِ مِنْ النَّارِ).

(١) بڕوانە: النكت على كتاب ابن الصلاح /٢/٨٢٥، وتدريب الراوي /٢٣٠، اليواقيت والدرر /٢/٨١.

(٢) بڕوانە: تدريب الراوي / ٢٣٠.

● لەوانەیە ڕاویەکە ئاگای لە مەسەلەکە نەبێت، وبە هەڵە تێگەیشتبێت: وەکو حەدیسەکەی (ثابت) کە لە (شَرِيكُ القاضي)ەوە ڕیوایەتی کردبوو ( مَنْ كَثُرَتْ صَلاتُهُ باللَّيلِ حَسُنَ وَجْهُهُ بالنَّهارِ ). [1]

## حوکمی حەدیسی ( مدرج )

وەکو لە باسەکەی پێشوودا وتمان: ڕەنگە هۆکار زۆر هەبن، بۆ درووست بوونی ئەم جۆرە حەدیسە، ئیتر هەندێکیان بە هەڵە وهەندێکیشیان بە مەبەست.

شێخی شارەزووری فەرموویەتی: بزانە کە درووست نیە هیچ شتێك بە دەستی ئەنقەست زیاد بکرێت بۆ حەدیسێك. [2]

ئیمامی (سیوطي)، لە شەرحی فەرمایشتی ئیمامی نەواوی: (وَكُلُّهُ حَرَام) فەرموویەتی: ئەم بڕیارە فەرموودەناسان وشەرعزانان تێیدا کۆدەنگن. [3]

شێخی زەرکەشی لەسەر ئەو فەرمایشتەی شێخی شارەزووری، فەرموویەتی: لەم فەرمایشتەدا دوو باس هەیە: [4]

١) ڕوونی نەکردوەتەوە، ئایا ئەگەر کەسێك کارێکی لەو جۆرەی کرد، حوکمی چۆنە؟ ئیمامی ماوەردی وڕەویانی وئیبنو سەمعانی فەرموویانە: ئەو کەسە بە کەسێکی مەجروح دادەنرێت، وعەدالەت لەدەست دەدات، وە دەچێتە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە قسە لە جێگەی خۆی لادەدەن، وبە درۆزن دادەنرێت.

(١) ڕەنگە ڕێك بکەوێت کە ئەو کەسەی حەدیسەکەی نووسیوەتەوە، بە هەڵە شتێکی بۆ زیاد کردبێت، وئیتر دوای ئەو هەر کەسێك هاتبێت، هەر بەو زیادەوە هێناویەتی.

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٧.

(٣) بڕوانە: تدريب الراوي / ٢٣٣.

(٤) بڕوانە: النكت على مقدمة ابن الصلاح / ٣ / ٨١١ – ٨١٢.

٢) باسی ئەوەی نەکردووە کە جیاوازی هەیە لە نێوان ئەو هۆکارانەی کە دەبنە هۆی پەیدابوونی ئەم جۆرە حەدیسە ! کە خراپترینیان ئەوەیە کە وتەیەك هی حەزرەت نەبێت، وبدرێتە پاڵ ئەو.

جا بەگوێرەی ئەم فەرمایشتەی شێخی زەرکەشی، وا دەردەکەوێت کە هەندێك جۆریان حەرام نین، بۆیە ئیمامی (سیوطي)ش لەم بارەیەوە فەرموویەتی: ((بەلای منەوە: هەر وتەیەك کە بۆ تەفسیری وشەیەکی غەریب خرابێتە ناو حەدیسێکەوە، ئەوە درووستە، هەر بۆیە هەم ئیمامی (زهري) وهەم چەند کەسێکی تریش لە پێشەوایان کردوویانە.)) (١)

شێخی (صنعاني)یش فەرموویەتی: ((قیاس وەهایە، هەر تێهەڵکێشکردنێك کە بۆ تەفسیر کردن بوو، ئەوە حەرام نیە. بەلاَم ئەگەر بۆ تەفسیر کردن نەبوو، وەکو ئەوەی کە حوکمێکی شەرعی تێدا بێت، یان وا بگەیەنێت کە زیادکراوەکەش فەرموودەی حەزرەتە، ئەوە دروست نیە)). (٢)

لە تەواوی ئەم فەرمایشتانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەم جۆرە حەدیسەش یەکێکە لە جۆرەکانی حەدیسی (ضعیف). (٣)

---

(١) بڕوانە: تدریب الراوي / ٢٣٣. وە لە ئەلفییەکەشیدا فەرموویەتی:

٢٤٩-وَكُلُّ ذَا مُحَرَّمٌ وَقَادِحُ		وَعِنْدَيَ التَّفْسِيرُ قَدْ يُسَامَحُ

مامۆستای پایەبەرز (أحمد شاکر) فەرموویەتی: کاتێك کە بۆ تەفسیرکردنیش بێت، هەر باشتر وایە کە ڕوون بکرێتەوە ئەو بەشەیان زیاد کراوە ولەگەڵ حەدیسەکەدا تێهەڵکێش کراوە. بڕوانە: الباعث الحثیث / ٦٥.

(٢) بڕوانە: توضیح الأفکار / ٢ / ٦٦.

(٣) ڕەنگە کەسێك بپرسێت، ومافی خۆشێتی کە بپرسێت: باشە خۆ هەندێك لەو نموونانەی کە بۆ ئەم جۆرە حەدیسە هێنرانەوە، لە صەحیحی بوخاریدا هەن، وەکو: ("للعبد المملوك الصالح أجران، والذي نفسي بیده، لولا الجهاد في سبیل الله، والحج وبرّ أمي لأحببت أن أموت وأنا مملوك ") ئیتر چۆن بڵێین: جۆرێکە لە جۆرەکانی حەدیسی (ضعیف) !!

ئێمەش دەڵێین: جارێ وەکو وتمان مانای بەشی دووەمی ئەم حەدیسە لەگەڵ کەسایەتی حەزرەتدا ناگونجێت، ودرووست نیە بدرێتە پاڵ ئەو، ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە، ئیمامی بوخاری هەر خۆی لە کتێبی (الأدب المفرد)دا حەدیسەکەی بەو شێوەیە هێناوە کە ئەو بەشەی کۆتایی فەرمایشتی ئەبو هورەیرەیە، وەکو لە جێگەی خۆیدا ئاماژەمان پێکرد.

وَمَا رَوَى كُلُّ قَرِينٍ عَنْ أخِهْ      مُدَبَّجٌ فَاعْرِفْهُ حَقّاً وَانْتَخِهْ

# جۆری بیست وحەوتەم

## حەدیسی (المُدَبَّج)

واتە: ئەو حەدیسەی کە کەسێك لە کەسێکی تری هاوسەردەم وهاوڕێی خۆی گێڕابێتەوە، پێی دەوترێت (مُدَبَّج)، بیناسە، وشانازیشی پێوە بکە. [1]

لەم پێناسەیەوە دەردەکەوێت کە کاتێك حەدیسێك بەم ناوەوە ناو دەنرێت، کە دوو مەرجی تێدا بێتەجێ، ئەوانیش:

١) دوو کەس هەبن کە تەمەنیان لەیەکەوە نزیك بێت، وهاوئیسناد بن. واتە: هەردووکیان حەدیسیان لە یەك مامۆستاوە ڕیوایەت کردبێت. [2]

(١) چونکە ئەو ڕیوایەتە نیشانەی کەم نەفسی وخۆ بەکەم زانینە، دوو کەسی هاوتەمەن قوتابی یەك مامۆستان، بەلاّم هەندێك جار حەدیس لە یەکتری ڕیوایەت دەکەن.

(٢) مەرج نیە ئەو دوو کەسە یەك تەمەنیان هەبێت، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە تەمەنیان لەیەکتر نزیك بێت، بۆیە ئەگەر تەمەنیان لەیەکترەوە دوور بوو، ئەوا حەدیسەکەیان بە چەند ناوێکی تر ناو دەبرێت، هەر یەکە بە ئیعتیبارێك، لەوانە: (رواية الأكابر عن الأصاغر. رواية الآباء عن الأبناء. رواية الشيخ عن تلميذه. رواية الصحابة عن التابعين. رواية الأصاغر عن الأكابر، کە ئەمیش چەند جۆرێکی تر دەگرێتەوە: رواية الابن عن أبيه. الابن عن أبيه عن جده. رواية المرأة عن أمها أو عن جدتها. رواية التلميذ عن شيخه. رواية التابعي عن الصحابي). بەلاّم بەلای (الحافظ العراقي)یەوە، مەرج نیە کە ئەو دوو کەسە هاوتەمەن وهاوقوتابی بن، بەڵکو گرنگ ئەوەیە کە حەدیسیان لە یەکترەوە ڕیوایەت کردبێت. کەوابێت نزیکی تەمەن وهاوئیسنادی بەلای ئەمەوە مەرج نیە. بڕوانە: التقييد والإيضاح / ٢٣٣. هەروەها فەرمایشتی شێخی عەسقەلانیش وەهای لێ وەردەگیرێت، کە گرنگ ئەوەیە یەکێك لەو دوو مەرجەی سەرەوە بێتەجێ، ئیتر گرنگ نیە کامیانە. کەواتە بەلای ئەمەوە ئەگەر ئەو دووکەسە تەنها هاوقوتابی بن، یان تەنها هاوتەمەن بن، ئەوا حەدیسەکەیان هەر بە (مدبج) ناودەبرێت. بڕوانە: نزهة النظر / ١٤٩، وفتح المغيث / ١٣٩/٣. بەلاّم شێخی عەسقەلانی هەر لەم باسەدا پرسیارێك درووست دەکات، ودەفەرموێت: وەکو چۆن قوتابیەك لە مامۆستاکەیەوە حەدیس ڕیوایەت دەکات، خۆ ئەگەر مامۆستاکەشی لە قوتابیەکەوە حەدیسی ڕیوایەت کرد، ئایا لەم حاڵەتەدا پێی دەوترێت: (مدبج) ؟ ئەوجا خۆشی وەلاّم دەداتەوە، ودەفەرموێت: نەخێر، ئەوە پێی دەوترێت: (رواية الأكابر عن الأصاغر)، بەلاّم لە (مدبج)دا دەبێت دوو کەسەکە یەکسان وهاوڕێ بن.

٢) هەردووکیان حەدیسیان لە یەکتری ڕیوایەت کردبێت.

کەواتە ئەگەر دووان لە هاوەڵانی حەزرەت حەدیس لە یەکتردوە ڕیوایەت بکەن، (وەکو دایکە عائیشە وئەبو هورەیرە)، ئەوا بە حەدیسەکەیان دەوترێت: (مُدَبَّج).[1]

هەروەها ئەگەر دوو کەس لە شوێنکەوتوان، (وەکو ابن شهاب الزهري و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) یان شوێنکەوتەی شوێنکەوتوان، (وەکو ئیمامی مالیك وئیمامی ئەوزاعی) حەدیس لە یەکتر ڕیوایەت بکەن. ئیتر هەر بەم شێوە لە هەر سەردەمێکدا دوو هاوڕێ وهاوسەردەم حەدیس لە یەکتر ڕیوایەت بکەن، حەدیسەکەیان هەر بەم ناوەوە ناو دەبرێت.

جا کاتێك کە زانایان باسی ئەم جۆرە حەدیسە دەکەن، لە چوارچێوەی باسێکدا دەیهێنن کە پێی دەوترێت: (رواية الأقران). بەلاّم مەرج نیە هەرکەی باسی (رواية الأقران)مان کرد، ئیتر بڵێین حەدیسەکە لە جۆری (مُدَبَّج)ە. بەلکو زانایان فەرموویانە: کاتێك حەدیسەکە پێی دەوترێت (مُدَبَّج)، کە ئەو دوو کەسە هەردووکیان حەدیسیان لەیەکتری ڕیوایەت کردبێت. ئەگینا ئەگەر تەنها یەکێکیان حەدیسی لە ئەوی تریانەوە ڕیوایەت کردبوو، ئەوا پێی ناوترێت: (مُدَبَّج).[2]

## نموونەی ئەو کەسانەی کە حەدیسیان لە یەکتری ڕیوایەت کردووە

ئەگەر بمانەوێت نموونە لەسەر ئەو کەسانە بهێنینەوە کە حەدیسیان لە یەکتری ڕیوایەت کردووە، ئەوا ڕەنگە ڕێمان لە دەیان وصەدان حەدیس بکەوێت، بەلاّم تەنها بۆ ئاشنابوون بە

(١) یەکەم کەسێك کە ئەم ناوەی بەکار هێنابێت، ئیمامی (دار قطني) بووە، بەلاّم ئەوەندە هەیە کە ئەیبەستووەتەوە تەنها بەو حەدیسانەی کە دوو کەسی هاوتەمەن وهاوقوتابی لەیەکتری بیانگێڕنەوە، بەلکو لەو نموونانەی کە هێناوني هەندێکیان هاوتەمەن وهاوقوتابین، وە هەندێکیشیان تەنها ئەوەندەیە کە حەدیسیان لە یەکترەوە ڕیوایەت کردووە، ئەگینا نە هاوتەمەنن، ونە هاوقوتابیشن. بڕوانە: فتح المغيث / ٣ / ١٤٠.

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٨٤، والمنهل الروي / ٧٣، قفو الأثر / ١ / ١٠٣، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ١٧٤، وفتح المغيث / ٣ / ١٤٠، وتوضيح الأفكار / ٢ / ٤٧٦، وتوجيه النظر / ١ / ٤٦٠، وشرح الزرقاني على البيقوني / ٢٠٤.

هەندێکیان، چەند نموونەیەك دەهێنینەوە، هەر یەکە لە نموونەکان لە چینێکی تایبەت وسەردەمێکی دیاریکراودا:

١) چینی هاوەڵانی حەزرەت: وەکو دایکە عائیشە وئەبو هورەیرە.

- ئەبو هورەیرە لە دایکە عائیشەوە: وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی موسلیم لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی، وفەرموویەتی: حَدَّثَنَا أَبُو بَكْرِ بْنُ أَبِي شَيْبَةَ حَدَّثَنَا أَبُو أُسَامَةَ حَدَّثَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عُمَرَ عَنْ مُحَمَّدِ بْنِ يَحْيَى بْنِ حَبَّانَ عَنِ الأَعْرَجِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنْ عَائِشَةَ قَالَتْ فَقَدْتُ رَسُولَ اللَّهِ -صلى الله عليه وسلم- لَيْلَةً مِنَ الْفِرَاشِ فَالْتَمَسْتُهُ فَوَقَعَتْ يَدِى عَلَى بَطْنِ قَدَمَيْهِ وَهُوَ فِي الْمَسْجِدِ وَهُمَا مَنْصُوبَتَانِ وَهُوَ يَقُولُ « اللَّهُمَّ أَعُوذُ بِرِضَاكَ مِنْ سَخَطِكَ وَبِمُعَافَاتِكَ مِنْ عُقُوبَتِكَ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْكَ لاَ أُحْصِى ثَنَاءً عَلَيْكَ أَنْتَ كَمَا أَثْنَيْتَ عَلَى نَفْسِكَ ».(١)
- دایکە عائیشە لە ئەبو هورەیرەوە: وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی ئەحمەد وئیمامی حاکیم بۆمان دەگێڕنەوە، کە دایکە عائیشە پرسیاری کردووە لە ئەبو هورەیرە، کە ئایا ئەو گێڕاویەتیەوە لە حەزرەتەوە کە ئافرەتێك بەهۆی پشیلەیەکەوە توشی سزا بووە؟ ئەویش فەرموویەتی: بەڵێ من لە حەزرەتم گێڕاوەتەوە.(٢)

٢) چینی شوێنکەوتەکان: وەکو ابن شهاب الزهري و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز.

- (ابن شهاب) لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزەوە: وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی ئەحمەد لە موسنەدەکەیدا هێناویەتی، وفەرموویەتی: حَدَّثَنَا عَبْدُ الرَّزَّاقِ حَدَّثَنَا ابْنُ جُرَيْجٍ وَابْنُ بَكْرٍ عَنِ ابْنِ جُرَيْجٍ أَخْبَرَنِي ابْنُ شِهَابٍ عَنْ عُمَرَ بْنِ عَبْدِ الْعَزِيزِ عَنْ إِبْرَاهِيمَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ قَارِظٍ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ وَعَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ

(١) صحيح مسلم / كتاب الصلاة / باب ما يقال في الركوع والسجود / حەدیسی ژمارە ٤٨٦.

(٢) مسند أحمد بن حنبل / مسند المكثرين من الصحابة / مسند أبي هريرة / حەدیسی ژمارە ٧٨٣٤، ومعرفة علوم الحديث / لاپەڕە ٢٩٥.

صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ إِذَا قُلْتَ لِصَاحِبِكَ أَنْصِتْ وَالْإِمَامُ يَخْطُبُ يَوْمَ الْجُمُعَةِ فَقَدْ لَغَوْتَ.[1]

- **عومەری کوڕی عەبدولعەزیز لە (ابن شهاب)ەوە: وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی حاکم هێناویەتی، ودەفەرموێت:** أخبرني محمد بن إسماعيل المقرئ قال أخبرنا محمد بن نوح الجُندَيسابُوريُّ قال ثنا محمد بن عبد الله بن عبيد بن عقيل بن صبيح الهلالي قال ثنا يعقوب بن محمد الزهري قال حدثنا عبد العزيز بن عمران عن عمر بن عبد العزيز عن الزهري عن سالم عن أبيه قال: [ دعا رسول الله صلى الله عليه و سلم يوم الحديبية الناس للبيعة فجاء أبو سنان بن محصن فقال: يا رسول الله أُبَايِعُكَ عَلَى مَا فِي نَفْسِكَ قال: وما فِي نَفْسِي؟ قال: أَضْرِبُ بِسَيْفِي بَيْنَ يَدَيْكِ حَتَّى يُظْهِرَكَ اللهُ أَوْ أُقْتَل. قال فَبَايَعَهُ وبَايَعَ النَّاسُ عَلَى بَيْعَةِ أَبِي سنان ].[2]

**٣) چینی شوێنکەوتەی شوێنکەوتوان: وەکو ئیمامی مالیك وئیمامی ئەوزاعی.**

- **ئیمامی مالیك لە ئیمامی ئەوزاعی: وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی (ابن حبان) لە صەحیحەکەیدا هێناویەتی، وفەرموویەتی:** أخبرنا الحسن بن سفيان قال: حدثنا إبراهيم بن المنذر الحزامي قال: حدثنا معن بن عيسى عن مالك عن الأوزاعي عن الزهري عن عروة عن عائشة قالت: قال رسول الله صلى الله عليه و سلم: (إِنَّ اللهَ تَعَالى يُحِبُّ الرِّفْقَ فِي الأَمْرِ كلِّه).[3]

- **ئیمامی ئەوزاعی لە ئیمامی مالیك: وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی حاکیم هێناویەتی، وفەرموویەتی:** أخبرنا أبو الحسين محمد بن أحمد الحنظلي ببغداد قال ثنا سليمان بن محمد بن الفضل قال ثنا محمد بن عقبة بن علقمة قال حدثني أبي قال حدثني الأوزاعي عن مالك بن أنس عن أبي نعيم وهب بن كيسان [ عن عمر بن أبي سلمة قال:

---

(١) مسند أحمد بن حنبل / مسند المكثرين من الصحابة / مسند أبي هريرة / حەدیسی ژمارە ٧٦٧٢.

(٢) معرفة علوم الحديث / لاپەڕە ٢٩٦.

(٣) صحيح ابن حبان / كتاب البر والإحسان / باب الرفق / حەدیسی ژمارە ٥٤٧.

قال لِي رسول الله صلى الله عليه و سلم: ادْنُ يَا بنيَّ، فَسَمِّ اللَّهَ، وَكُلْ بِيَمِينِكَ، وَكُلْ مِمَّا يَلِيكَ ]. (١)

## سوودی باس کردنی حەدیسی ( مُدَبَّج )

ڕەنگە کەسێك بپرسێت: باشە سوودی باسکردنی ئەم جۆرە حەدیسە چیە؟ یان بە جۆرێکی تر: سوودی چیە ئەگەر بزانین کەسانێکی هاوتەمەن وهاوئیسناد حەدیسیان لە یەکتر ڕیوایەت کردووە؟

زانایان فەرموویانە(٢): گرنگ ترین سوودی ئەوەیە کە ئەگەر ناوی ئەو کەسانە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێکدا بەشوێن یەکدا هاتبوو، با یەکسەر نەوترێت: ئەو ئیسنادە هەڵەی تێدایە. یان ئەگەر لە نێوان ئەو کەسانەدا وشەی (عن) بەکار هێنرا، ڕاستەوخۆ کەسێك بڵێت: ئەو وشەی (عن)ە بە مانای (واو) هاتووە، بە خەیاڵی ئەوەی کە گوایە ئەوان بەیەکەوە حەدیسەکەیان ڕیوایەت کردووە، نەك یەکێکیان لەوی تریان ! کە ئەم جۆرە لێکدانەوە وخەیاڵانە هەڵە وپووچەڵن، چونکە وەکو وتمان: دەکرێت ئەو کەسانە حەدیسیان لە یەکتر ڕیوایەت کردبێت، بەڵکو نەك دەکرێت، هەر کراویشە، وحەدیسیشیان لە یەکتر ڕیوایەت کردووە، وەکو ئەو نموونانەی کە لە باسەکەی پێشوودا هێنامانەوە.(٣)

---

(١) معرفة علوم الحديث / لاپەڕە ٢٩٧.

(٢) بڕوانە: منهج النقد في علوم الحديث / ١٥٤.

(٣) بەڵکو زیاد لەوەش هەندێك جار ڕێك دەکەوێت کە سێ یان چوار یان پێنج کەس لە هاوەڵانی حەزرەت، یان شوێنکەوتوان لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسێکدا کۆبوونەتەوە. وەکو ئەو حەدیسەی کە بەم ڕشتەیە ڕیوایەت کراوە { أحمدُ بنُ حنبلٍ عن أبي خَيْثَمَةَ زُهَيْرِ بنِ حَرْبٍ، عن يحيى بنِ مَعِينٍ، عن عليِّ بنِ المدينيِّ، عن عبيدِ اللهِ بنِ مُعَاذٍ، عن أبيهِ، عن شعبةَ، عن أبي بكرِ بنِ حفصٍ، عن أبي سلمةَ، عن عائشةَ قالتْ: (( كُنَّ أَزْوَاجُ النَّبِيِّ يَأْخُذْنَ مِنْ شُعُورِهِنَّ حَتَّى يَكُونَ كَالوَفْرَةِ )) } ئێستا لەم ڕشتەیەدا هەم ئیمامی ئەحمەد وهەم چوار کەسەکەی سەرووی ئەو بە (أقران) دادەنرێن. بڕوانە: النكت على مقدمة ابن الصلاح / ٢ / ٦٤ – ٦٧، والشذا الفياح / ٢ / ٥٤٥ – ٥٤٦، وفتح المغيث / ٣ / ١٤٠ – ١٤١، وتدريب الراوي / ٥٢٣، واليواقيت والدرر / ٢ / ٢٥٠.

# حوکمی حەدیسی ( مُدَبَّج )

ئەم جۆرە حەدیسەش وەکو خۆی هیچ هۆکارێکی وەهای تێدا نیە کە بەرەو (ضعیف)ی ڕابیکێشێت، بەڵکو هەر ئەوەندە هەیە کە دوو کەس یان زیاتر لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا هەن، کە تەمەنیان لە یەکەوە نزیکە، وهاو ئیسنادیشن.

بۆیە بڕیاردان بەسەر ئەم جۆرە حەدیسەدا، دەبێت بەپێی هاتنەجێ ونەهاتنەجێی مەرجەکانی حەدیسی (صحیح) و(حسن) بێت.

کەواتە ئەگەر مەرجەکانی تێدا هاتبوەجێ ئەوا دەوترێت حەدیسێکی (صحیح)ە یان (حسن)ە. بە پێچەوانەشەوە ئەگەر مەرجەکانی تێدا نەهاتبونەجێ ئەوا دەچێتە ڕیزی حەدیسە (ضعیف)ەکانەوە.

مُتَّفِقٌ لَفْظـاً و خَطّاً مُتَّفِقْ وَضِدُّهُ فِيمَا ذَكَرْنَا المفْتَرِقْ

# جۆری بیست وهەشتەم

## حەدیسی (المُتَّفِق والمُفْتَرِق)

واتە: ئەو ناوانەی كە لە دەربڕین ونوسیندا وەكو یەك وەهان (بەلاّم كەسەكان جیاوازن)، پێیان دەوترێت: (متفق)، وە دژی ئەویش لە نوسین ودەربڕیندا پێیان دەوترێت: (مفترق).

لەم دێرە هۆنراوەیەی مامۆستاوە ئەوە وەردەگیرێت كە، ئێمە دوو جۆر ناومان هەیە:

١)هەندێكیان لەگەڵ هەندێكی تریاندا لە دەربڕین ولە نوسینیشدا وەكو یەكن، بەلاّم وەكو كەسەكان خۆیان لەیەكتر جیاوازن، كە ئەم جۆرەیان پێی دەوترێت: (متفق).

٢)هەندێكیشیان نە لە دەربڕین ونە لە نوسینیشدا لەیەكتر ناچن، كە ئەمەشیان پێی دەوترێت: (مفترق).

بەلاّم ئەگەر بە باشی بڕوانینە ئەم دێرە هۆنراوە، دەبینین كە لە دوو لایەنەوە رِەخنە ڕووی تێدەكات:

١) لەلایەكەوە، زانایانی فەرموودەناس نەهاتوون ئەم دوو ناوە لەیەكتر جیابكەنەوە، بەڵكو هەركەی باسیان كردبن، بەیەكەوە ناویان هێناون، وكردوونیان بە یەك ناو، وفەرموویانە: (المُتَّفِق والمُفْتَرِق). كە ئەو جۆرە ناوەی یەكەمە كە مامۆستا بە تەنها ناوی ناون (متفق).

٢) لەلایەكی تریشەوە، ئەوە شتێكی مەعلوومە كە دوو ناو ئەگەر لە نووسین ودەربڕیندا لە یەكتری جیاواز بن، ئەوە (مفترق)ن، بەلاّم زاراوەیەكمان نیە بەم شێوە بۆ ئەم جۆرە ناوانە، هەروەها باسی ئەم جۆرە ناوانەش لە باسەكانی ئەم زانستە نیە، وزانایان هیچ بایەخێكیان بە باسكردنیان نەداوە.

ئەوجا با بچینە سەر ئەو پێناسانەی كە زانایان كردوونیان بۆ ئەم جۆرە ناوانە، كە هەموویان لەم مانایەدا یەكدەگرنەوە: ناوی كۆمەڵە كەسێكی جیاوازن، كە لە دەربڕین ونوسیندا وەكو یەك وەهان، ئیتر ئایا تەنها ناوی كەسەكان، یان ناوی خۆیان وباوكیشیان، یان

باوك وباپیرەشیان، یان لەقەبەكانیان، یان كونیەكانیان (أبو فلان، یان أم فلان، یان ابن فلان) وەكو یەكن.(١)

جا بەپێی ئەم پێناسەیە، دەكرێت ئەم جۆرە ناوانە دابەش بكەین بۆ چەند جۆرێك، كە لەم باسەی داهاتوودا بە درێژی باسیان دەكەین.

## جۆرەكانی ئەو ناوانەی كە پێیان دەوترێت: (المُتَّفِق والمُفتَرِق)

زانایان كاتێك باسی ئەم جۆرە ناوانەیان كردووە، هەستاون كردوونیان بە چەند جۆرێكەوە،(٢) كە ئەوانیش:

- ناوی خۆیان وباوكیشیان وەكو یەك وەهایە، وەكو: (خليل بن أحمد)، كە ناوی شەش كەس یان زیاترە، كە یەكێكیان مامۆستاكەی شێخی سیبەوەیهییە لە زانستی نەحوودا.
- ناوی خۆیان وباوك وباپیرەشیان وەكو یەك وەهایە، وەكو: (أحمد بن جعفر بن حمدان)، كە ناوی چوار كەسە، و هەمووشیان حەدیسیان لەو كەسانە ڕیوایەت كردووە، كە ناویان عەبدولڵایە. یەكێك لەو ئەحمەد ناوانە بریتیە لە (أبو بكر القطيعي)، كە حەدیسی لە عەبدولڵای كوڕی ئیمامی ئەحمەدەوە ڕیوایەت كردووە.
- كونیە ونیسبەتی كەسەكان وەكو یەك وەهایە، وەكو (أبو عمران الجوني)، كە بۆ دوو كەس بەكار هاتووە، یەكێكیان بریتیە لە (عبد الملك بن حبيب التابعي)، وە ئەوی تریان بریتیە لە (موسى بن سهل البصري)، كە مامۆستای ئیمامی (طبراني) بووە.
- ناوی خۆیان وباوكیان ونیسبەتیشیان وەكو یەك وەهایە، وەكو: (محمد بن عبدالله الأنصاري البصري)، كە ناوی دوو كەس بووە، یەكێكیان بریتیە لە (القاضي أبو عبدالله محمد بن عبدالله بن المثنى بن عبدالله بن أنس بن مالك الأنصاري البصري)، ئەوی تریان

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢١٦ – ٢٢١، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٢٥٨، ونزهة النظر / ١٦٣، والتقريب بشرح تدريب الراوي / ٥٩٤ - ٦٠٠، وفتح المغيث / ٣ / ٢٠٨.

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢١٦ – ٢٢١، والمنهل الروي / ١٢٧ – ١٢٩، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٢٥٨ – ٢٧٣.

بریتیه لە (أبو سلمة محمد بن عبدالله بن زياد الأنصاري البصري)، کە زانایان بە کەسێکی (ضعیف)ی دەزانن، کە هەردووکیان حەدیسیان لەم کەسانە ڕیوایەت کردووە (حمید الطويل، وسليمان التيمي، ومالك بن دينار، وقرة بن خالد).

- کونیەی خۆیان وناوی باوکیشیان وەکو یەك وەهایە، وەکو: (أبو بكر عياش)، کە بۆ سێ کەس بەکار هاتووە، کە یەکێکیان بریتیه لە (أبو بكر بن عياش سالم الأسدي الكوفي)، کە خوێندنەوەی قورئانی لەسەر شێوەی (عاصم) ڕیوایەت کردووە.
- ناوی خۆیان وکونیەی باوکیان وەکو یەك وەهایە، وەکو (صالح بن أبي صالح)، کە ناوی چوار کەس بووە، کە یەکێکیان بریتی بووە لە (وصالح بن أبي صالح ذكوان السمان)، کە حەدیسی لە ئەنەسی کوڕی مالیك ڕیوایەت کردووە.
- تەنها ناوی خۆیان یان کونیەکەیان یان نیسبەتەکەیان وەکو یەك وەهایە، وەکو: (عبد الله). سەلەمەی کوڕی سولەیمان فەرموویەتی: ئەگەر لە شاری مەککەدا وترا عەبدولاّ، ئەوە مەبەستیان عەبدولاّی کوڕی زوبەیرە. وە ئەگەر لە شاری مەدینەدا وترا، ئەوە مەبەستیان عەبدولاّی کوڕی عومەرە. وە ئەگەر لە شاری کوفەدا وتیان، ئەوە مەبەستیان عەبدولاّی کوڕی مەسعودە. وە ئەگەر لە شاری بەصرەدا وتیان، ئەوە مەبەستیان عەبدولاّی کوڕی عەبباسە. وە ئەگەر لە خۆراساندا وتیان، ئەوە مەبەستیان عەبدولاّی کوڕی موبارەکە. وە (أبو يعلى الخليلي القزويني) فەرموویەتی: ئەگەر خەلکی میصر وتیان عەبدولاّ، ئەوە مەبەستیان عەبدولاّی کوڕی عەمری کوڕی عاصە.
- تەنها لە نیسبەتدا وەکو یەك وەهان، ئەویش لە دەربڕیندا، ئەگینا نیسبەتەکەیان جیاوازە، وەکو (حنفيّة)، کە بۆ نیسبەت بۆلای بەنی حەنیفە، بەکار دەهێنرێت، وەکو (أبو بكر عبدالكبير بن عبدالمجيد الحنفي)، وە براکەی کە ناوی (عبيدالله) بووە، کە هەردوو ئیمامی بوخاری وموسلیم حەدیسیان لێوە هێناون. هەروەهابۆ کەسێکیش بەکار دێت کە لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفە بێت.
- ئیمامی سەخاوی جۆرێکی تری باس کردووە،[1] ئەویش ئەوەیە کە: ناوی باوکی کەسەکە وناوی مامۆستاکەی وەکو یەك وەهابن، وەکو: ڕەبیعی کوڕی ئەنەس، کە لە ئەنەسی

---

(١) بڕوانە: فتح المغيث / ٣ / ٢١٨.

کوڕی مالیکەوە حەدیسی ڕیوایەت کردووە. ئێستا ئەگەر بوترێت: (عن الربیع بن أنس عن أنس)، نازانرێت کە ئەو ئەنەسە باوکێتی یان مامۆستاکەیەتی، کەچی باوکی ئەو ڕەبیعە ناوی ئەنەسە ولە هۆزی بەنی بەکرە، بەڵام مامۆستاکەی وەکو وتمان: هاوەڵی خۆشەویست ئەنەسی کوڕی مالیکە، کە هیچ کوڕێکی نەبووە بە ناوی ڕەبیعەوە.[1]

## سوودی ناسینی ئەم جۆرە ناوانە

بێ گومان ناسینی ئەم جۆرە ناوانەی وجیاکردنەوەی کەسایەتیەکان لە یەکتری چەندین سوودی گرنگی هەیە، لەوانە:

- ڕەنگە کەسێك لێی تێك بچێت کە ئەو ناوە کێیە، نەزانێت ئایا کەسێکی متمانەدارە، یان نا؟ بۆیە لەوانەیە بڕیار بدات کە کەسێکی (ضعیف)ە، وکەچی لەڕاستیدا کەسێکی متمانەدارە، یان بە پێچەوانەوە.
- ڕەنگە ئەو کەسەی کە ناوەکە دەبیسێت وا بزانێت کە تەنها یەك کەس هەیە بەو ناوەوە، کەچی چەندین کەس هەن بەو ناوەوە، وهەموشیان حەدیسیان ڕیوایەت کردووە.[2]

ئەوجا جیاکردنەوە وناسینی ئەم جۆرە ناوانە وکەسایەتی خاوەنەکانیان، هەروا کارێکی ئاسان نیە، بۆیە شێخی شارەزووری فەرموویەتی: لەم باسەدا بەهۆی ئەم

---

(١) نموونەی ئەم جۆرە، وەکو ئەو حەدیسەی کە ڕەبیعی کوڕی ئەنەس لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتی کردووە، سەبارەت بەو کەسانەی کە هاوەڵەکانی بیری مەعوونەیان شەهید کرد، کە حەزرەت چۆن تاوەکو مانگێك لە قونوتدا دووعای لێ کردوون، وەکو ئیمامی بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە، وفەرموویەتی: (عَنِ الرَّبِيعِ بْنِ أَنَسٍ عَنْ أَنَسٍ: أَنَّ النَّبِيَّ -صلى الله عليه وسلم- قَنَتَ شَهْرًا يَدْعُو عَلَيْهِمْ، ثُمَّ تَرَكَهُ، فَأَمَّا فِي الصُّبْحِ فَلَمْ يَزَلْ يَقْنُتُ حَتَّى فَارَقَ الدُّنْيَا). بڕوانە: السنن الكبرى / كتاب الحيض / باب الدليل على أنه لم يترك أصل القنوت في صلاة الصبح / حەدیسی ژمارە ٢٩٢٦. ئێستا ئەگەر تەنها لە ڕواڵەتی ئەم ڕیوایەتە بڕوانرێت، وتەماشای ڕیوایەتەکانی تر نەکرێت، نازانرێت ئایا ئەو ئەنەسە باوکی ڕەبیع خۆیەتی، یان ئەنەسی کوڕی مالیکە !!

(٢) بڕوانە: فتح المغيث / ٣ / ٢٠٨.

لەیەکچوونی ناوانەوە، پێی چەند زانایەکی گەورە وپایەبەرز هەڵخلیسکاوە، بەڵکو ئەم هاوبەشی ولەیەکچوونە لە زۆرێك لە زانستەکاندا هۆکاری بەهەڵەداچوون ولێتێکچوونە.[1]

سەبارەت بەم جۆرە ناوانە زانای گەورە (الخطيب البغدادي) کتێبێکی داناوە بەناوی (المتفق والمفترق). شێخی عەسقەلانی دەفەرموێت: من ئەو کتێبەم پوخت کردووە، وزۆر شتیشم بۆ زیاد کردووە.[2]

هەروەها زانای پایەبەرز (محمد بن طاهر المقدسي)ش کتێبێکی داناوە، بەناوی (الأنساب المتفقة).

## حوکمی ئەو حەدیسەی کە ئەم جۆرە ناوانە لە سەنەدەکەیدا هەیە

وەکو باسمان کرد، ناسینی ئەم جۆرە ناوانە گرنگی وبایەخی تایبەتی هەیە سەبارەت بە ناسینی کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکان، کە ئایا متمانەدارن، یان نا.

بۆیە هەر لەبەر ڕۆشنایی ناسینی ئەو کەسانە، دەکرێت بڕیار بدرێت کە ئەو حەدیسەی کە ئەوان لە ڕشتەی گێڕانەوەکەیدا هەن، (صحيح)ە یان (صحيح) نیە.

کەواتە، هەر حەدیسێك کە ناوی یەکێك لەو کەسانەی تێدابێت، دەکرێت (صحيح) بێت، ودەشکرێت (صحيح) نەبێت، ئەویش بەپێی عەدالەت وزەبتی کەسەکانی ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکە.

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢١٦. بەڵام وەکو زانایان فەرموویانە: گرنگی ئەم باسە زیاتر لەو کاتەدا دەردەکەوێت کە ئەو کەسانەی ناوەکانیان لەیەك دەچێت لە یەك سەردەمدا ژیابن، وە لە یەك مامۆستا حەدیسیان ڕیوایەت کردبێت، یان یەك کەس حەدیسی لە هەموویان ڕیوایەت کردبێت. بڕوانە: شرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٢٥٨، وفتح المغيث / ٣ / ٢٠٨، وتدريب الراوي / ٥٩٤.

(٢) بڕوانە: نزهة النظر / ١٦٤.

مُؤْتَلِفٌ مُتَّفِقُ الخَـــطِّ فَقَـــطْ      وَضِدُّهُ مُخْتَلِفٌ فَاخْشَ الغَلَطْ

# جۆری بیست ونۆیەم

# حەدیسی (المُؤتَلِف والمُخْتَلِف)

واتە: ئەو ناوانەی کە تەنها لە نوسیندا وەکو یەك وەهان (بەلاّم کەسەکان جیاوازن)، پێیان دەوترێت: (مؤتلف)، وە دژی ئەویش پێی دەوترێت (مختلف)، جا لە هەڵە بترسە.

لەم جۆرەشدا دووبارە مامۆستای دانەر نەیپێکاوە، کە وەهای خستۆتە پێشچاو، گوایە جۆرێك هەیە پێی دەوترێت (مؤتلف)، وە دژی ئەویش پێی دەوترێت (مختلف). بەلاّم ڕاستیەکەی ئەوەیە کە ئەم دوو وشەیە هەردووکیان پێکەوە دەبن بە ناو بۆ یەك جۆر ناو، نەك دوو جۆر، چونکە زانایان هەمیشە ئەم دوو وشەیەیان پێکەوە بەکار هێناوە، ولەیەکتریان جیا نەکردوونەتەوە، بەلکو بۆ هەردووکیان پێکەوە پێناسەیەکیان کردووە، وفەرموویانە:

(المؤتلف والمختلف): بەو ناوانە دەوترێت کە لە شێوازی نوسینیاندا لەیەك دەچن، ئیتر وەکو یەك وەهان، یان لەیەك نزیکن، بەلاّم لە دەربڕیندا لەیەکتر جیاوازن.(١)

جا کاتێك کە دەوترێت لە شێوازی نوسینیاندا لەیەك دەچن، یان لەیەکتر نزیکن، مەبەست ئەوەیە کە پیتەکانی هەردوو ناوەکە وەکو یەك وەهان، وەکو (عُبَيْد، وعَبِيد)، و(سُلَيْم، وسَلِيم)، ئیتر هەر بەم شێوە. یانە تەنها لە شێوەی نووسیندا لەیەکتر نزیکن، وەکو: (بَشار، ویشار)، یان وەکو: (همداني وهمذاني).

لەمەوە دەردەکەوێت کە جیاوازی نێوان ناوەکان هەندێك جار لە سەر وژێر وبۆر وزەنەی سەر پیتەکاندا درووست دەبێت، وەکو ناوەکانی جۆری یەکەم. هەندێك جاریش جیاوازیەکە لە خالّی سەر وژێری پیتەکاندا دەردەکەوێت، وەکو ناوەکانی جۆری دووەم.

---

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٠٧، ونزهة النظر / ١٦٤. جا ناوەکان هەر جۆرێك بن (اسم یان کنیة یان لقب یان نسب)

بەلاّم ئەمەی دووەمیان لە سەردەمانێکدا زیاتر دەردەکەوت کە نوسین تەنها پیت بوو، ئیتر هیچ وشەیەك خاڵی لەسەر نەبوو، چونکە ئەو کاتە جیاوازی لە نێوان (ن و ب)دا نەبوو، هەروەها لە نێوان (س و ش). بەلاّم لەبەر ئەوەی کە ئێستا هەموو ئەو پیتانەی کە خاڵیان هەیە لە نوسیندا لەیەکتر جیاکراونەتەوە وجیادەکرێنەوە، ئیتر ئەم جۆرە کێشە ڕوومان تێناکات سەبارەت بە جیاوازی نێوان وشەکان لەڕووی بوونی ژمارە وجێگەی خاڵەکانەوە، چونکە هەموو کەسێکی خوێندەوار دەزانێت کە (بشار ویشار) جیاوازن لەیەکتر، هەروەها (همداني وهمذاني)ش، هەروەها (حمزة وجمرة)ش، هەروەها (حيّان وحبّان)یش.

بەلاّم جیاوازی نێوان ئەو ناوانەی جۆری یەکەم، کە تەنها بە سەر وژێر وبۆر وزەنە وشەددە لەیەکتر جیادەکرێنەوە، ئەوە ئێستەش هەر کارێکی گران وسەختە، چونکە لە زۆرینەی نوسینەکاندا وا باو نیە کە سەرو ژێر وبۆر بکرێت بۆ پیتەکان، بۆیە ئەگەر کەسێك نوسی (سلام)، کەسێك چۆن بزانێت، ئەوە (سلاّم)ە نەك (سلام)، کە جیاوازی نێوانیان تەنها شەددەکەیە. هەروەها ئەگەر نوسرا (عمارة)، کێ دەزانێت کە ئەوە (عُمارة)یە، نەك (عِمارة)، یان بە پێچەوانەوە؟

## چۆن ئەم جۆرە ناوانە بناسینەوە، ولەیەکتریان جیا بکەینەوە

زانایان بۆ جیاکردنەوە وناسینی ئەم جۆرە ناوانە فەرموویانە: دەکرێت لە دوو ڕێگەی سەرەکیەوە بیانناسینەوە، کە ئەوانیش[1]:

١) هەندێکیان زۆرن وبەئاسانی لەیەکتر جیاناکرێنەوە، مەگەر لە ڕێگەی نەقڵ کردن لە زانایانەوە، کە ئەوان فەرموویێتیان بەم شێوەیان دەخوێنرێتەوە، ئەوەکو بە شێوەکەی

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٠٧ - ٢١٦، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٢١٧.

تریان. وەکو (أَسِيد، وأُسَيْد)، و(حِبّان، وحَبّان)، وهاووێنەکانیان، کە تەنها ڕێگە بۆ ناسینەوە ولەیەك جیاکردنەوەیان بریتیە لە فەرمایشتی زانایانی شارەزا وپسپۆڕ. (١)

٢) هەندێکیان کەمن وکەم بەکار دەهێنرێن، بۆیە دەکرێت ڕێسایەك دابنرێت بۆ جیاکردنەوە وناسینەوەیان. کە ئەمانەش زانایان دوو جۆر ڕێسایان بۆ داناون:

- هەندێکیان بە شێوەیەکی گشتی ڕێسایەکیان بۆ داناون، کە فەرموویانە، بۆ نموونە: هەرچی ناوێك بەم شێوەیە نووسرا، ئەوە بەو جۆرە دەخوێنرێتەوە، تەنها سێ دانە یان چوار دانە یان پێنج دانەیان نەبێت. وەکو لە ناوی (سلام)دا کە فەرموویانە: هەرچی ناوێك بەم شێوەیە نوسرابێت، بە شەددەوە دەخوێنرێتەوە (واتە: سلّام)، تەنها ناوی پێنج کەس نەبێت، کە بریتین لە: (سلام والد عبد الله بن سلام الإسرائيلي الصحابي، وسلام والد محمد بن سلام البيكندي البخاري شيخ البخاري، وسلام بن محمد بن ناهض المقدسي، وسلام جد محمد بن عبد الوهاب بن سلام المتكلم الجبائي المعتزلي، وسلام بن أبي الحقيق). یان وەکو ناوی (عمارة)، کە هەرچی ناوێك بەم شێوەیە نوسرابێت، ئەوە بە (عُمارة)

---

(١) جا بۆ ئەم مەبەستە زانایان چەندین کتێبیان داناوە، لەوانە:

- ( المختلف والمؤتلف ) ( للدار قطني ).
- ( المؤتلف والمختلف ) ( لأبي سعد الماليني ).
- ( المختلف والمؤتلف ) ( لابن التركماني ).
- ( المؤتلف تكملة المختلف ) (للخطيب البغدادي).
- ( الإكمال في رفع الارتياب عن المؤتلف والمختلف من الأسماء والكنى والأنساب ) ( لابن ماكولا).
- ( التقييد لمعرفة رجال السنن والمسانيد ) (لابن نقطة).
- (المشتبه) (للذهبي).
- ( تبصير المنتبه في تحرير المشتبه ) (للعسقلاني). بڕوانە: الرسالة المستطرفة / ١١٤ – ١١٩.

دەخوێنرێتەوە، تەنها ناوی یەك كەس نەبێت كە ئەویش باوكی یەكێك لە هاوەڵانە بە ناوی (أُبَيّ بْنِ عِمَارَةَ).

- هەندێكیان ڕێسای تایبەتیان بۆ داناون، وەكو ئەوەی كە بوترێت: لە صەحیحی بوخاری وموسلیمدا هەر ناوێك هاتبێت كە بەم شێوەیە نوسرابێت، ئەوە بەم جۆرە دەخوێنرێتەوە، تەنها (فلان وفلان) نەبێت. وەكو ناوی (البراء) كە هەر ناوێكی لەم شێوەیە لە صەحیحی بوخاری وموسلیمدا هاتبێت بە (الْبَرَاء) دەخوێنرێتەوە، تەنها دوانیان نەبێت، بە (الْبَرَّاء) دەخوێنرێنەوە، كە بریتین لە: (أبو معشر البراء) و (أبو العالیة البراء).

## گرنگی وبایەخی ناسین وجیاكردنەوەی ئەم جۆرە ناوانە لەیەكتر

گرنگی وبایەخ وسودی ناسینی ئەم جۆرە ناوانە وجیاكردنەوەیان لە یەكتری هیچ كەمتر نیە لە سوود وگرنگی ناسینی ناوەكانی جۆری (المتفق والمفترق).

بۆیە زانایان بە یەكێك لە باسە هەرە گرنگەكانی ئەم زانستەیان داناوە، وفەرموویانە: هەركەسێك ئاگای لەم جۆرە ناوانە نەبێت ولێكیان جیا نەكاتەوە، زۆر تێدەكەوێت، ولە لێتێكچوون وبەهەڵەداچوون پارێزراو نابێت، چونكە ناوەكان پەرت وبڵاون، ولە زۆرینەشیاندا قیاس ورێسایەكی تایبەتی نیە كە لەسەری برۆن بۆ ناسینەوەیان. [١]

جا لەم ڕوانگەیەوە دەكرێت بڵێین: سوود وبایەخی ناسینی ئەم جۆرە ناوانەش هەر هەمان سوود وبایەخی ناسینی ناوەكانی جۆری (المتفق والمفترق)ە. واتە گرنگە بۆ لێنەگۆڕان ونەخستنە جێگەی كەسێك بۆ كەسێكی تر، چونكە ڕەنگە كەسەكان لە ڕووی متمانەداری وعەدالەتەوە جیاوازیان هەبێت، كە ئەمەش كاریگەری دەبێت لەسەر بڕیاردان بەسەر ڕشتەی ئەو حەدیسەی كە ناوی كەسەكەی تێدایە، وپاشان كاریگەریشی لەسەر دەقی حەدیسەكە، كە ڕەنگە لە (صحیح)یەوە بیگۆڕێت بۆ (حسن) یان (ضعیف)، یان بە پێچەوانەوە!.

(١) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٢٠٧، وشرح التبصرة والتذكرة / ٢ / ٢١٦، ونزهة النظر / ١٦٤.

وَالمنْكَرُ الفَرْدُ بِهِ رَاوٍ غَدَا    تَعْدِيلُهُ لاَ يَحْمِلُ التَّفَرُّدَا

# جۆری سییەم

# حەدیسی (المُنْكَر)

واتە: حەدیسی (منكر) بەو حەدیسە دەوترێت کە تەنها کەسێکی وەها ڕیوایەتی کردووە، کە متمانەداریەکەی لە ئاستێکدایە کە حەدیسی بە تەنها لێ وەرناگیرێت.

ئەم پێناسەیەی کە مامۆستا هەڵی بژاردووە بۆ ئەم جۆرە حەدیسە یەکێکە لەو پێناسانەی کە زانایان کردوویانە بۆی، بەڵام چەند پێناسەیەکی تریشی بۆ کراوە، لەوانە:

- هەندێك فەرموویانە: ئەو حەدیسەیە کە تەنها کەسێك ڕیوایەتی کردووە. ئیتر نەزانراوە کە دەقی ئەو حەدیسە بێجگە لە ڕیوایەتەکەی ئەو، لە کەسێکی ترەوە ڕیوایەت کرابێت.(١)
- بەلای شێخی شارەزووریەوە، دەکرێت بە دوو جۆرەوە، یەکێکیان ئەوەیە کە کەسێك بە تەنها حەدیسێك ڕیوایەت بکات بە پێچەوانەی ئەوەی کەسانی متمانەدار ڕیوایەتیان کردووە. دووەمیشیان ئەوەیە کە ئەو کەسەی حەدیسەکەی ڕیوایەت کردووە، ئەوەندە متمانەدار ومەزبوت نیە کە بە تەنها حەدیسی لێ وەربگیرێت.(٢)

---

(١) ئەمە پێناسەی (الحافظ أبو بكرٍ أحمدُ بنُ هارونَ البَرْدِيجيّ)یە، وەکو شێخی شارەزووری لێیەوە نقلّ کردووە. بڕوانە / مقدمة ابن الصلاح / ٤٦. ئەم پێناسەیە بە شێوەیەکی ڕەها هاتووە، وجیاوازی نەکردووە لە نێوان ئەوەی کە ئایا ئەو کەسەی کە حەدیسەکەی ڕیوایەت کردووە، کەسێکی متمانەدارە یان نا ! هەروەها پێچەوانەی ڕیوایەتی کەسانی متمانەدارترە یان نا ! بۆیە بەپێی ئەم پێناسەیە ئەم جۆرە حەدیسە لەگەڵ حەدیسی (فرد)دا هیچ جیاوازیەکیان نابێت !.

(٢) بڕوانە / مقدمة ابن الصلاح / ٤٦ - ٤٧. جا پێناسەکەی مامۆستای دانەریش هەر هەمان پێناسەی جۆری دووەمە کە شێخی شارەزووری کردوویەتی. بەپێی ئەم بۆچوونە وا دەردەکەوێت کە جیاوازی نیە لە نێوان حەدیسی (شاذ ومنكر)دا !! کە ئەمەش بەلای زانایانەوە زۆر دوورە، چونکە کەسی ڕاوی لە حەدیسی (شاذ)دا متمانەدارە، بەڵام لە حەدیسی (منكر)دا کەسێکی (ضعیف)ە. بڕوانە: نزهة النظر / ٨٧، وتدريب الراوي / ١٩٨. هەر بۆیە ئیمامی (سیوطي) لە ئەلفییەکەیدا دەفەرموێت:

١٨٤- المُنْكَرُ الَّذِي رَوَى غَيْرُ الثِّقَهْ	مُخَالِفًا، فِي نُخْبَةٍ قَدْ حَقَّقَهْ

١٨٥- قَابَلَهُ المَعْرُوفُ، وَالَّذِي رَأَى	تَرَادُفَ المُنْكَرِ وَالشَّاذِ نَأَى

- شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: ئەو حەدیسەیە کە کەسێکی (ضعیف) ڕیوایەتی بکات بە پێچەوانەی کەسانێك کە لە ئەو بەهێز ترن. [1]
- هەندێك فەرموویانە: ئەو حەدیسەیە کە تەنها کەسێکی (ضعیف) ڕیوایەتی کردووە. ئیتر باسی موخالەفەیان نەکردووە.

## نموونەی حەدیسی (مُنْكَر)

بەپێی ئەو پێناسەیەی کە مامۆستا کردوویەتی بۆ ئەم جۆرە حەدیسە، زانایان نموونەیەکیان هێناوەتەوە کە ئەویش ئەو حەدیسەی حەزرەتە کە ئیمامی نەسائی وئیبنو ماجە ڕیوایەتیان کردووە لەڕێگەی (أبو زُكَيْر يحيى بن محمّدِ بنِ قيسٍ عنْ هِشامِ بنِ عُروةَ عنْ أبيهِ عنْ عائشةَ)، کە حەزرەت فەرموویەتی: ((كُلُوا الْبَلَحَ بِالتَّمْرِ؛ فَإِنَّ ابن آدَمَ إِذَا أَكَلَهُ غَضِبَ الشَّيطَان، وَقَالَ: عَاشَ ابْنُ آدَمَ حَتَى آكَلَ الْخَلَق بِالْجَدِيد )). [2]

جا ئیمامی نەسائی فەرموویەتی: ئەم حەدیسە (منكر)ە. زانایانیش فەرموویانە: ئەم حەدیسە تەنها (أبو زُكَيْر) ڕیوایەتی کردووە، خۆ ئەگەرچی شێخێکی چاکەکاری خواناسە، وئیمامی موسلیمیش حەدیسی لێوە هێناوە لە صەحیحەکەیدا، بەڵام ئەوەندە هەیە کە نەگەیشتوەتە پلەیەکی وەها کە حەدیسی بە تەنها لێ وەربگیرێت. [3]

نموونەیەکی تر وەکو ئەو حەدیسەی کە ئیمامی (طبراني) هێناویەتی لە ڕێگەی (حُبَيِّب بن حَبِيب) کە دەکاتە برای (حَمْزَة الزَّيَّات)، لە (أَبِو إِسْحَاق)ەوە، ئەویش لە (الْعَيْزَارِ بن

(١) بڕوانە: نزهة النظر / ٨٦.

(٢) سنن النسائي الكبرى / كتاب الوليمة / البلح بالتمر / حەدیسی ژمارە ٦٧٢٤، وسنن ابن ماجة / كتاب الأطعمة / باب أكل البلح بالتمر / حەدیسی ژمارە ٣٣٣٠.

(٣) بڕوانە / مقدمة ابن الصلاح / ٤٧، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٢٥٢، وفتح المغيث / ١ / ٢٢٤، وتدريب الراوي / ١٩٧.

حُرَيْث)ەوە، ئەویش لە (ابْن عَبَّاس)ەوە، کە حەزرەت فەرموویەتی: (مَنْ أَقَامَ الصَّلاةَ، وَآتَى الزَّكَاةَ، وَحَجَّ الْبَيْتَ، وَصَامَ رَمَضَانَ، وَقَرَى الضَّيْفَ دَخَلَ الْجَنَّةَ). [1]

شێخی عەسقەلانی لە (ابن أبي حاتم)ەوە نقلْ دەکات کە سەبارەت بەم حەدیسە فەرموویەتی: ئەو کەسە (واتە: حُبَيِّب بن حَبِيب) کەسێکی (منکر)ە، چونکە چەند ڕاویەکی متمانەدار ئەم حەدیسەیان لە (أَبِو إِسْحَاق)ەوە ڕیوایەت کردووە، کە فەرمایشتی (ابن عباس)ە، نەك فەرموودەی حەزرەت، کەچی لەم ڕیوایەتەدا وا هاتووە کە فەرموودەی حەزرەت بێت !. [2]

## حوکمی حەدیسی (مُنْكَر)

بەو پێیەی کە زانایان لەسەر پێناسە کردنی حەدیسی (منکر)دا ناکۆکن، بۆیە یەکێك لە شوێنەوارە سرووشتیەکانی ئەو ناکۆکیە بریتیە لە دروستبوونی ناکۆکی لەسەر حوکمی ئەم جۆرە حەدیسە.

بێ گومان ئەو زانایانەی کە بە پێناسەی یەکەم پێناسەیان کردووە، پێیان وایە کە ئەم جۆرە حەدیسە دەگونجێت (صحیح) یان (حسن) یان (ضعیف) بێت. چونکە وەسفی سەرەکی بەلای ئەوانەوە تەنها ئەوەیە کە حەدیسەکە تەنها یەك کەس ڕیوایەتی کردبێت، ئیتر دیاریان نەکردووە کە ئەو کەسە متمانەدارە یان نا، هەروەها بەمەرجیان نەگرتووە کە ئەو حەدیسە پێچەوانەی ڕیوایەتی کەسانێکی متمانەدار بێت. [3]

---

(١) المعجم الكبير / باب العين / عبد الله بن العباس / حەدیسی ژمارە ١٢٦٩٢.

(٢) بڕوانە / نزهة النظر / ٨٦، هەروەها بڕوانە: علل الحديث لابن أبي حاتم / حەدیسی ژمارە ٢٠٤٣، والجرح والتعديل / لابن أبي حاتم / ٣ / ٣٠٩ / لە باسی (حُبَيِّب)دا، بە ژمارەی ١٣٧٣، والكامل في ضعفاء الرجال / ابن عدي / ٢ / ٤١٥ / بە ژمارەی ٥٣٢.

(٣) بۆ تێگەیشتنی تەواو لەم باسە، بڕوانە / الرفع والتكميل، أبو الحسنات اللكنوي / ١٩٩ – ٢١٠، ومنهج النقد في علوم الحديث، نور الدين عتر / ٤٣٠ – ٤٣٣.

بەلاّم ئەوانەی کە بە پێناسەی دووەمیان وەرگرتووە، وەکو شێخی شارەزووری ومامۆستای دانەر، جیاوازیان نەکردووە لە نێوان حەدیسی (منکر) و(شاذ)دا، بۆیە بەلای ئەوانەوە هەمان حوکمی حەدیسی (شاذ)ی هەیە، کە لە جێگەی خۆیدا باسمان کرد، وئاماژەشمان بە بوونی ناکۆکی کرد لە نێوان زانایاندا سەبارەت بە زاراوەی (شاذ)، بەلاّم زۆرینەیان هەر لەسەر ئەوەن کە حەدیسێکی (ضعیف)ە.

بەلاّم ئەوانەی کە بە پێناسەی سێیەم وچوارەمیان وەرگرتووە، گومانی تێدا نیە کە ئەم جۆرە حەدیسەیان بە (ضعیف) داناوە، چونکە ئەو تەنها کەسەی کە حەدیسەکەی رِیوایەت کردووە (ضعیف)ە، ئیتر ئایا پێچەوانەی رِیوایەتی کەسانێکی متمانەدارە، وەکو شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی، یان باسی پێچەوانەیان نەکردووە، وەکو ئەوانەی پێناسەی چوارەم.

مترُوكُهُ مَا وَاحدٌ بِهِ انْفَرَدْ وَأجْمَعُوا لِضَعْفِهِ فَهْوَ كَرَدْ

---

# جۆری سی ویەکەم

## حەدیسی ( المَتْرُوك ) (١)

واتە: حەدیسی (مَتْرُوك) بەو حەدیسە دەوترێت کە تەنها کەسێکی وەها ڕیوایەتی کردووە، کە زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە کەسێکی (ضعیف)ە، وە حەدیسەکەش ڕەد دەکرێتەوە وپێی وەرناگیرێت.

سەرەتا، ئەم جۆرە حەدیسە بەر لە شێخی عەسقەلانی کەسێکی تر باسی نەکردووە وەکو جۆرێك لە جۆرەکانی حەدیس، ئەگەرچی لە فەرمایشتی هەندێك لە زانایانەوە لە باسی (جرح وتعدیل)ی ڕاویەکانەوە وەردەگیرێت، کە هەندێك حەدیس هەن وازیان لێ دەهێنرێت وپێیان وەرناگیرێت، بەڵام بەڕاشکاوی ئەم ناوەیان لێ نەناوە.

زانای پایەبەرز (أحمد بن صالح المصري) فەرموویەتی: واز لە حەدیسی هیچ کەسێك ناهێنرێت، تاوەکو تەواوی زانایان یەکدەنگ نەبن لەسەر وازلێهێنانی.(٢)

ئیمامی نەسائی فەرموویەتی: هیچ کەسێك بەلای منەوە وازلێهێنراو نیە، مەگەر تەواوی زانایان وازیان لێ هێنابێت. (٣)

ئەوجا کاتێك شێخی عەسقەلانی باسی ئەم جۆرە حەدیسەی کردووە، بەم جۆرە پێناسەی کردووە: ئەو حەدیسەیە کە ڕەد دەکرێتەوە وپێی وەرناگیرێت، بەهۆی ئەوەی کە ڕاویەکەی تۆمەتبار کراوە بە درۆکردن. (٤)

---

(١) ئیمامی (ذهبي) بە (المطروح) ناوی بردووە. بڕوانە: الموقظة في علم مصطلح الحديث / ٣٤. ئیمامی سەخاوی فەرموویەتی: ئەمە ئەو جۆرەیە کە شێخی عەسقەلانی بە (متروك) ناوی بردووە. بڕوانە: فتح المغيث / ١ / ٢٩٧، والغاية في شرح الهداية في علم الرواية / ١٥٦. شێخ (طاهر الجزائري) فەرموویەتی: کەوابوو ئەم جۆرە حەدیسە دوو ناوی هەیە. بڕوانە: توجيه النظر / ٢ / ٥٧٥.

٢) بڕوانە: الكفاية في علم الرواية / ١١٠.

(٣) بڕوانە: الرفع والتكميل / ٣٠٧، النكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ٤٨٢، ونزهة النظر / ١٧٨، وفتح المغيث / ١ / ٩٧، وتدريب الراوي / ٢٦٥، وتوضيح الأفكار / ١ / ٢٢٠.

(٤) بڕوانە: نزهة النظر / ١١٢.

پاشان کاتێك کە ئیمامی (سیوطي) ئەم پێناسەیەی شێخی عەسقەلانیمان بۆ دێنێت، خۆشی چەند سیفەتێکی تر زیاد دەکات بۆ ڕاویەکە، ودەفەرموێت: یان زۆر هەڵە دەکات، یان زۆر تاوان دەکات ونافەرمانی شەریعەت دەبێت، یان زۆر بێ ئاگایە. واتە سەرەڕای تۆمەتی درۆکردنەکە، کە شێخی عەسقەلانی دایناوە، ئەم هاتووە ئەم سیفەتانەشی بۆ زیاد کردووە.[1]

بۆیە مامۆستای دانەر هەستاوە بە جۆرێك پێناسەی کردووە، کە هەردوو پێناسەکەی شێخی عەسقەلانی وئیمامی (سیوطی)ش بگرێتەوە، وفەرموویەتی: ئەو حەدیسەیە کە تەنها کەسێك ڕیوایەتی کردووە، زانایان یەکدەنگن لەوەدا کە کەسێکی (ضعیف)ە.

## چۆن ڕاویەك بە درۆ تۆمەتبار دەکرێت؟

بۆ ئەوەی کەسێك تۆمەتبار بکرێت بە درۆکردن، زانایان دوو پێوەریان داناوە[2]:

١) ئەو ڕاویە تەنها کەس بێت کە حەدیسەکەی ڕیوایەت کردبێت، وحەدیسەکەش پێچەوانەی ڕێسا گشتییەکانی شەریعەتی ئیسلام بێت.

٢) ئەو کەسە لەقسەی عادەتی خۆیدا درۆ بکات، ئەگەرچی نەزانرابێت کە لە حەدیسی حەزرەتدا درۆی کردبێت، چونکە ئەگەر بزانرێت لە حەدیسەکەشدا درۆی کردووە، ئیتر حەدیسەکەی بە (متروك) دانانرێت، بەڵکو بە (موضوع) دادەنرێت.

## نموونەی حەدیسی (مَتْرُوك)

ئەم جۆرە حەدیسە نموونەی زۆرە، بەتایبەتی لە باسی ئەو کەسانەدا کە زانایانی فەرموودەناس کۆدەنگن لە (ضعیف)ياندا، هەروەکو لە باسی بێهێزترین ولاوازترین ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسدا ناویان هێناون وباسیان کردوون.

---

(١) بڕوانە: تدریب الراوي / ١٩٨. هەروەها لە ئەلفییەکەشیدا فەرموویەتی:

١٨٦-وَسَمِّ بِالْمَتْرُوكِ فَرْدًا تُصِبِ　　　رَاوٍ لَـهُ مُتَّهَمٌ بِالْكَـذِبِ

١٨٧-أَوْ عَرَفُوهُ مِنْهُ فِي غَيْرِ الأَثَرْ　　　أَوْ فِسْقٌ أَوْغَفْلَةٌ أَوْ وَهْمٌ كَثُرْ

(٢) بڕوانە: نزهة النظر / ١٠٦.

ئیمامی حاکیم دەفەرموێت: [١]

- أوهى أسانيد أهل البيت: عمرو بن شمر عن جابر الجعفي عن الحارث الأعور عن علي.
- أوهى أسانيد الصديق: صدقة بن موسى الدقيقي عن فرقد السبحي عن مرة الطيب عن أبي بكر الصديق.[٢]
- أوهى أسانيد العمريين: محمد بن القاسم بن عبد الله بن عمر بن حفص بن عاصم بن عمر عن أبيه عن جده.
- أوهى أسانيد أبي هريرة: السري بن إسماعيل عن داؤد بن يزيد الأودي عن أبيه عن أبي هريرة.
- أوهى أسانيد عائشة نسخة عند البصريين عن الحارث بن شبل عن أم النعمان الكندية عن عائشة. [٣]
- أوهى أسانيد عبد الله بن مسعود: شريك عن أبي فزارة عن أبي زيد عن عبد الله. [٤]

---

(١) بڕوانە: معرفة علوم الحديث / ١٠٥ – ١٠٦. هەروەها بڕوانە هەریەکە لە: الاقتراح في بيان الاصطلاح / ١١ – ١٥، والنكت على كتاب ابن الصلاح / ١ / ٤٩٦ – ٥٠٠، والنكت على مقدمة ابن الصلاح / ٢ / ٤١٣ – ٤٢٠، وتدريب الراوي / ١٣٣ – ١٣٤. بەڵام نابێ کەس وەها تێبگات کە ڕاویەکانی ئەو زنجیرانە هەموویان (ضعيف)ن، بەڵکو لەوانەیە یەکێکیان یان دوانیان یان سیانیان (ضعيف)بن، وئەوانی تریان متمانەدار بن، چونکە هەندێك لەو کەسانەی کە لەو زنجیرانەدا ناویان هاتووە، لە ڕشتەی چەندین حەدیسی (صحيح)دا ناویان هاتووە. بۆیە ئاگاداربە ئەو جۆرە تێگەیشتنە هەڵەیە.

(٢) ئیمامی (ترمذي) بەم ڕشتەیە حەدیسێکی هێناوە، وەك دەفەرموێت: حَدَّثَنَا أَحْمَدُ بْنُ مَنِيعٍ حَدَّثَنَا يَزِيدُ بْنُ هَارُونَ حَدَّثَنَا صَدَقَةُ بْنُ مُوسَى عَنْ فَرْقَدٍ السَّبَخِيِّ عَنْ مُرَّةَ الطَّيِّبِ عَنْ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ عَنِ النبي (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: « لاَ يَدْخُلُ الْجَنَّةَ خِبٌّ وَلاَ مَنَّانٌ وَلاَ بَخِيلٌ». بڕوانە: سنن الترمذي / البر والصلة / البخيل / حەدیسی ژمارە ١٩٦٣.

(٣) ئیمامی (طبراني) بەم ڕشتەیە حەدیسێکی هێناوە، وەك دەفەرموێت: حَدَّثَنَا يَعْقُوبُ بْنُ إِسْحَاقَ الْمَخْرَمِيُّ، نَا شَاذُّ بْنُ الْفَيَّاضِ، ثَنَا الْحَارِثُ بْنُ شِبْلٍ، عَنْ أُمِّ النُّعْمَانِ، عَنْ عَائِشَةَ (أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ) قَالَتْ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): " أَخَفُّ النِّسَاءِ صَدَاقًا أَعْظَمُهُنَّ بَرَكَةً ". بڕوانە: المعجم الأوسط / ٩ / ١٧٣ / حەدیسی ژمارە ٩٤٥١.

(٤) ئیمامی (طبراني وأبو داود) بەم ڕشتەیە حەدیسێکیان هێناوە، وەك دەفەرموون: حَدَّثَنَا شَرِيكٌ عَنْ أَبِي فَزَارَةَ عَنْ أَبِي زَيْدٍ عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ مَسْعُودٍ أَنَّ النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ لَهُ لَيْلَةَ الْجِنِّ: « مَا فِي إِدَاوَتِكَ » ؟ قَالَ: نَبِيذٌ. قَالَ: « تَمْرَةٌ طَيِّبَةٌ وَمَاءٌ طَهُورٌ ». بڕوانە: المعجم الكبير / باب العين / عبد الله بن مسعود الهذلي / حەدیسی ژمارە ٩٩٦٤، وسنن أبي داود / كتاب الطهارة / باب الوضوء بالنبيذ / حەدیسی ژمارە ٨٤.

- أوهى أسانيد أنس: داؤد بن المحبر بن قحذم عن أبيه عن أبان بن أبي عياش عن أنس.
- أوهى أسانيد المكيين: عبد الله بن ميمون القداح عن شهاب بن خراش عن إبراهيم بن يزيد الخوزي عن عكرمة عن ابن عباس.
- أوهى أسانيد اليمانيين: حفص بن عمر العدني عن الحكم بن أبان عن عكرمة عن ابن عباس. (١)
- أوهى أسانيد المصريين: أحمد بن محمد بن الحجاج بن رشدين بن سعد عن أبيه عن جده عن قرة بن عبد الرحمن بن حيويل عن كل من روى عنه.
- أوهى أسانيد الشاميين: محمد بن قيس المصلوب عن عبيد الله بن زحر عن علي بن يزيد عن القاسم عن أبي أمامة. (٢)

---

(١) ئیمامی (طبراني) به‌م ڕشته‌یه حه‌دیسێکی هێناوه، وه‌ك ده‌فه‌رموێت: حَدَّثَنَا حَفْصُ بن عُمَرَ الْعَدَنِيُّ، عَنِ الْحَكَمِ بن أَبَانَ، عَنْ عِكْرِمَةَ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): لا يَزْنِي الزَّانِي وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلا يَسْرِقُ حِينَ يَسْرِقُ وَهُوَ مُؤْمِنٌ، وَلا يَنْتَهِبُ النُّهْبَةَ وَهُوَ مُؤْمِنٌ. بڕوانه: المعجم الكبير / باب العين / أحاديث عبد الله بن العباس / حه‌دیسی ژماره ١١٦٢٣. ئیمامی (سیوطي) ڕشته‌یه‌ك دێنێت له عه‌بدوڵای کوڕی عه‌باسه‌وه، که ده‌فه‌رموێت: ئه‌م ڕشته‌یه لاوازترین وبێهێزترین ڕشته‌ی (ابن عباس)ه، ومامۆستاکه‌م (که شێخی عه‌سقه‌لانیه) فه‌رموویه‌تی: ((هذه سلسلة الكذب لا سلسلة الذهب)). ڕشته‌که‌ش ئه‌مه‌یه: محمد بن مروان عن الكلبي عن أبي صالح عن ابن عباس. بڕوانه: تدريب الراوي / ١٣٤. جا بۆ زانیاری، ئیمامی به‌یهه‌قی له (شعب الإيمان)دا چه‌ند فه‌رمایشتێکی (ابن عباس)ی سه‌باره‌ت به ته‌فسیری هه‌ندێك ئایه‌تێکی قورئانی پیرۆز، له‌م ڕشته‌یه‌وه هێناوه. بڕوانه حه‌دیسه‌کانی ژماره (٣٢، و٣٥٦، و٥١٩٤).

(٢) ئیمامی (البزار) به‌م ڕشته‌یه حه‌دیسێکی هێناوه، وه‌ك ده‌فه‌رموێت: عَنْ عُبَيْدِ اللهِ بْنِ زَحْرٍ، عَنْ عَلِيِّ بْنِ يَزِيدَ، عَنِ الْقَاسِمِ، عَنْ أَبِي أُمَامَةَ، عَنْ عَلِيٍّ، قَالَ: كُنْتُ آتِي النَّبِيَّ (صلى الله عليه وسلم) فَأَسْتَأْذِنُ، فَإِنْ كَانَ فِي الصَّلاةِ تَنَحْنَحَ، وَإِنْ لَمْ يَكُنْ فِي صَلاةٍ أَذِنَ لِي. بڕوانه: البحر الزخار (مسند البزار) / حه‌دیسی ژماره ٤٩٨.

- أوهى أسانيد الخراسانيين: عبد الله بن عبد الرحمن بن مليحة عن نهشل بن سعيد عن الضحاك عن ابن عباس.(١)

## حوكمی حه‌دیسی ( مَتْرُوك )

كاتێك كه‌ ته‌ماشای پێناسه‌ی ئه‌م جۆره‌ حه‌دیسه‌ ده‌كه‌ین، وبه‌راوردی ده‌كه‌ین له‌گه‌ڵ مه‌رجه‌كانی حه‌دیسی (صحيح وحسن) بۆمان ده‌رده‌كه‌وێت كه‌ ئه‌م جۆره‌ حه‌دیسه‌ ده‌چێته‌ ریزی حه‌دیسه‌ (ضعيف)ه‌كانه‌وه‌، چونكه‌ ئه‌و كه‌سه‌ی كه‌ ڕیوایه‌تی حه‌دیسه‌كه‌ی كردووه‌، كه‌سێكی (ضعيف)ه‌.

به‌ڵكو زیاد له‌وه‌ش زانایان (كه‌ مامۆستاش یه‌كێكه‌ له‌وان) فه‌رموویانه‌: زۆر نزیكه‌ له‌ حه‌دیسی (مَوْضُوع)ه‌وه‌، به‌ڵام ناگاته‌ پله‌ی ئه‌و.

(١) ئیمامی (طبراني) به‌م ڕشته‌یه‌ حه‌دیسێكی هێناوه‌، وه‌ك ده‌فه‌رموێت: عَنْ نَهْشَلِ بن سَعِيدٍ , عَنِ الضَّحَّاكِ , عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ , قَالَ: كَانَ رَسُولُ اللَّهِ – صلى الله عليه وسلم – إِذَا بَعَثَ سَرِيَّةً فَغَنِمُوا خَمَّسَ الْغَنِيمَةَ , فَضَرَبَ ذَلِكَ الْخُمُسَ فِي خَمْسَةٍ , ثُمَّ قَرَأَ {وَاعْلَمُواْ أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ}..... فَجَعَلَ سَهْمَ اللَّهِ وَسَهْمَ الرَّسُولِ وَاحِدًا ,"وَلِذِي الْقُرْبَى" , فَجَعَلَ هَذَيْنِ السَّهْمَيْنِ قُوَّةً فِي الْخَيْلِ وَالسِّلاحِ , وَجَعَلَ سَهْمَ الْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ ألا يُعْطِيهِ غَيْرَهُمْ , وَجَعَلَ الأَرْبَعَةَ الأَسْهُمَ الْبَاقِيَةَ لِلْفَرَسِ سَهْمَيْنِ , وَلِرَاكِبِهِ سَهْمٌ , وَلِلرَّاجِلِ سَهْمٌ. بڕوانه‌: المعجم الكبير / باب العين / أحاديث عبد الله بن العباس / حه‌دیسی ژماره‌ ١٢٦٦٠.

# جۆری سی ودووەم

# حەدیسی (المَوْضُوع)

واتە: درۆی هەڵبەستراوی درووستکراو بەدەم حەزرەتەوە، ئەوە پێی دەوترێت: حەدیسی (مَوْضُوع).

لەم پێناسەیەوە وەردەگیرێت کە ئەو کەسەی حەدیسەکەی بە درۆ درووست کردووە، مەبەستی هەبووە کە بیداتە پاڵ حەزرەت، ئەگینا بۆچی دەیداتە پاڵ حەزرەت ودەشزانێت کە حەدیسی ئەو نیە؟!

بەڵام هەندێك لە زانایان پێیان وایە کە مەرج نیە کەسەکە بە دەستی ئەنقەست حەدیسەکە درووست بکات وبیداتە پاڵ حەزرەت، بەڵکو ئەگەر بە هەڵەشدا چووبێت لە دانەپاڵی ئەو حەدیسە بۆلای حەزرەت، ئەوا حەدیسەکە هەر بە (موضوع) دادەنرێت، ئەگەرچی کەسەکە بەوە وەسفدار ناکرێت کە حەدیس درووست دەکات وهەڵیدەبەستێت بەدەم حەزردتەوە.[1]

## جۆرەکانی حەدیسی (مَوْضُوع)

وەکو زانایان باسیان کردووە، حەدیسی (موضوع) دوو جۆری سەرەکی هەیە، ئەوانیش:[2]

- کەسێك وتەیەکی خۆی دەداتە پاڵ حەزرەت، ووەهای پیشان دەدات کە فەرموودەی ئەوە. کە ئەم جۆرە نموونەی زۆرە، یەکێك لەوانە ئەوەیە کە کەسێك بە ناوی (سعد بن طريف الإسكاف) کوڕێکی هاتبوو بە گریانەوە بۆ لای، ئەویش پرسیاری لێ کردبوو: بۆچی

---

(١) وەکو ئەو حەدیسەی کە لە باسی حەدیسی (مدرج)دا باسمان کرد، کە لە نێوان (ثابت بن موسى الزاهد) و(شريك القاضي)دا درووست بووە، کە دەقەکەی ئەمە بوو: (مَنْ كَثُرَتْ صَلاتُهُ بِاللَّيلِ حَسُنَ وَجْهُهُ بِالنَّهارِ). کە (ثابت) لەم دەقە وەها تێگەیشتبوو کە فەرموودەی حەزرەتە، کەچی لە ڕاستیدا فەرمایشتی (قاضي شريك) بوو. ئێستا ئەمە بە هەڵە بووە، بۆیە هەندێك لە زانایان بە حەدیسی (موضوع)یان داناوە. بڕوانە: الموضوعات، لابن الجوزي / ٢ / ١٠٩ – ١١١، المقاصد الحسنة، للسخاوي / ١ / ٦٦٦ / حەدیسی ژمارە ١١٦٩، واللآلي المصنوعة في الأحاديث الموضوعة، للسيوطي / ٢ / ٢٨ – ٣٢، وكنز العمال، للمتقي الهندي / ٧ / ٣٢٣ / حەدیسی ژمارە ٢١٣٩٠.

(٢) بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٩، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣١٥.

دەگری؟ ئەویش دەڵی مامۆستاکەی لێی داوە. سەعدیش دەڵێ: دەبێ ئەمڕۆ سەرشۆڕ وریسوایان بکەم. (عكرمة) لە (ابن عباس)ەوە بۆی گێڕاومەتەوە، کە حەزرەت فەرموویەتی: " مُعَلِّمُوا صِبْيانِكُمْ شِرارُكُمْ، أَقَلُّهُمْ رَحْمَةً لِلْيَتِيمِ، وَأَغْلَظُهُمْ عَلى الْمِسْكِينِ "[1]

- کەسێك وتەی پیاوچاکێك یان حەکیمێك یان یەکێك لە بەنی ئیسرائیلیەکان دەهێنێت ودەیداتە پاڵ حەزرەت. وەکو: (حُبُّ الدُّنْيا رَأْسُ كُلِّ خَطِيئَةٍ).[2] کە هەندێك دەفەرموون: فەرمایشتی حەزرەتی عیسایە، هەندێکیش دەفەرموون: فەرمایشتی مالیکی کوڕی دینارە. یان وەکو: (المِعِدةُ بيتُ الداءِ، والحِمْيَةُ رأسُ الدَّواءِ)، کە وتەی پزیشکێکە بە ناوی (الحارث بن كلدة).[3]

## نیشانەکانی حەدیسی (مَوْضُوع)

سەرەتا، مەرج نیە هەر حەدیسێك کە وترا (موضوع)ە، ئیتر ئێمە بە دڵنیاییەوە بڵێین: بەڵێ وایە، وحەدیسی حەزرەت نیە، وبە دەمیەوە هەڵبەستراوە. چونکە لە هەندێك لەو کتێبانەی کە باسی ئەم جۆرە حەدیسانەیان کردووە، هەندێك حەدیسیان لە ڕیزی ئەم جۆرە حەدیسەدا هەژمار کردووە، کە زانایانی تر بە (ضعيف) یان (حسن) یان بگرە بە (صحيح)یشیان داناون.[4]

---

(١) بڕوانە: الموضوعات / ١ / ٤٢.

(٢) بڕوانە: اللآلي المنثورة في الأحاديث المشهورة، للزركشي / ١ / ١٢٢.

(٣) بڕوانە: المقاصد الحسنة / ١ / ٦١١ / حەدیسی ژمارە ١٠٣٥. ئەو پزیشکە لە سەردەمی حەزرەتدا ژیاوە، بەڵام ئیمانی نەهێناوە، بە (طبيب العرب) بەناوبانگە، وحەزرەت چەندین کەسی نەخۆشی ناردووە بۆلای. بڕوانە: الطبقات الكبرى، لابن سعد / ٥ / ٥٠٧.

(٤) وەکو حەدیسی: (إِنْ طَالَ بِكَ مُدَّةٌ أَوْشَكْتَ أَنْ تَرَى قَوْمًا يَغْدُونَ فِي سَخَطِ اللهِ وَيَرُوحُونَ فِي لَعْنَتِهِ فِي أَيْدِيهِمْ مِثْلُ أَذْنَابِ الْبَقَرِ) کە (ابن الجوزي) بە (موضوع)ی داناوە، کەچی لە صەحیحی ئیمامی موسلیمدا هاتووە !!! بڕوانە: الموضوعات / ٣ / ١٠١، وصحيح مسلم / كتاب الجنة وصفة نعيمها وأهلها / باب النار يدخلها الجبارون والجنة يدخلها الضعفاء / حەدیسی ژمارە ٢٨٥٧. ئیمامی (سيوطي) لە ئەلفیەکەیدا فەرموویەتی:

٢٦٩- وَفِي كِتَابِ وَلَدِ الْجَوْزِيِّ مَا — لَيْسَ مِنَ الْمَوْضُوعِ حَتَّى وُهِمَا
٢٧٠- مِنَ الصَّحِيحِ وَالضَّعِيفِ وَالْحَسَنْ — ضَمَّنْتُهُ كِتَابِيَ "الْقَوْلَ الْحَسَنْ"
٢٧١- وَمِنْ غَرِيبِ مَا تَرَاهُ فَاعْلَمِ — فِيهِ حَدِيثٌ مِنْ صَحِيحِ مُسْلِمِ

بۆیە وەکو شێخی عەسقەلانی فەرموویەتی: بڕیاردان بەسەر حەدیسێکدا کە (موضوع)ە بەپێی گومانە نەوەك دڵنیایی، چونکە دەگونجێت کە کەسێکی درۆزن ڕاستیش بکات.[1]

جا بۆ ناسینەوەی حەدیسی (موضوع) زانایان چەند نیشانەیەکیان دیاری کردووە، کە هەندێکیان لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا هەن، وهەندێکیشیان لە دەقی حەدیسەکەدا.[2]

١) ئەوانەی کە لە ڕشتەی گێڕانەوەی حەدیسەکەدا هەن بریتین لە:

- ڕاوی حەدیسەکە بە درۆزن ناسرا بێت، وحەدیسەکەش هیچ کەسێکی متمانەدار ڕیوایەتی نەکردبێت.
- ئەو کەسەی کە حەدیسەکەی هەڵبەستووە، خۆی دان بنێت بەوەدا کە هەڵی بەستووە بەدەم حەزرەتەوە.[3]

---

(١) بڕوانە: نزهة النظر / ١٠٧ – ١٠٨.

(٢) بڕوانە: التلخيص الحبير / ١ / ٣٨ – ٣٩، وأصول الحديث علومه ومصطلحه / ٤٦٠ ٤٦٤، ومنهج النقد في علوم الحديث / ٣٠٩ – ٣١٧. زانای پایەبەرز شێخ (عبد الفتاح أبو غدة) لەسەر کتێبی (توجيه النظر إلى أصول الأثر)ی (طاهر الجزائري) فەرموویەتی: " من لە کتێبێکی خۆمدا بەناوی (لمحات من تأريخ السنة وعلوم الحديث) لاپەڕە ١١٧ – ١٢٧ هەموو ئەو ڕێسا ونیشانانەم هێناوە کە حەدیسی (موضوع)ی پێدا دەناسرێتەوە، یانزە نیشانەم لە زانای پایەبەرز (ابن عَرّاق)ەوە لە کتێبی (تنزيه الشريعة المرفوعة) بەرگی ١ / لاپەڕە ٥ – ٨ نقڵ کردووە، وپاشان بیست وپێنج ڕێسام بۆ ناسینەوەی حەدیسی (موضوع) نقڵ کردووە لە زانای پایەبەرز (ابن القيم)ەوە لە کتێبی (المنار المنيف في الصحيح والضعيف) لاپەڕە ٤٣ - ١١٥، جا ئەگەر دەتەوێت با ئاگات لێیان بێت." بڕوانە: توجيه النظر / ١ / ٢٠٧.

(٣) وەکو ئەوەی کە ئیمامی بوخاری لە (عمر بن صبح بن عمران التميمي) گێڕاوەتەوە کە وتوویەتی: ((أنا وَضَعْتُ خُطْبَةَ النَّبِيّ)). بڕوانە: التأريخ الصغير، للبخاري / ٢ / ذكر ما بين عشر إلى الثمانين / حەدیسی ژمارە ٢٣٣٥، والبدر المنير، لابن الملقن / ٤ / ٤٦٠، والموضوعات / ٣ / ٢٥٤، وتدريب الراوي / ٢٣٤. یان وەکو ئەوەی کە کەسێك بە ناوی (ميسرة بن عبد ربه الفارسي) دانی بەوەدا ناوە کە چەند حەدیسێکی لەبارەی گەورەیی قورئانەوە هەڵبەستووە بەدەم حەزرەتەوە. یان وەکو ئەو کەسەی کە ناوی (أبو عصمة نوح بن أبي ابراهيم)ە، وبە (نوح الجامع) ناسراوە، حەدیسی لە ڕێگەی (عكرمة)وە، بەدەم عەبدوڵای کوڕی عەبباسەوە درووست کردووە، سەبارەت بە گەورەیی قورئان سورەت بە سورەت. جا پرسیاریان لێ کردووە: باشە ئەم حەدیسانە چۆن تەنها لای تۆ دەست دەکەوێت، ولای هیچکام لە قوتابیەکانی (عكرمة) دەست ناکەوێت ؟! ئەویش وتوویەتی: بینیم کە خەڵکی وازیان لە قورئان هێناوە وپشتیان تێکردووە، وڕوویان کردۆتە فیقهی ئەبو حەنیفە ومەغازی موحەممەدی کوڕی ئیسحاق، منیش ئەم حەدیسانەم لەبەر ئەوە داناوە، وچاوەڕوانی پاداشت لای خوا دەکەم. بڕوانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٩، والموضوعات / ١ / ٤١، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣١١، وتدريب الراوي / ٢٤٢، واللآلي المصنوعة / ٢ / ٣٩٠، وتوضيح الأفكار / ٢ / ٨١.

- هەندێك جار کەسەکە دان نانێت بەوەدا کە حەدیسەکەی هەڵبەستووە، بەڵکو شتێك دەڵێت وەکو ئەوە وایە کە دانی پیا نابێت.(١)
- قەرینەیەك هەیە لە راویەکەدا، دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە حەدیسەکەی هەڵبەستووە.(٢)

٢) هەندێك لەوانەش کە لە دەقی حەدیسەکەدا هەن بریتین لە:

- وشەکانی ئەو حەدیسە لە وتەی کەسێکی کەم فام وکەم عەقڵ دەچێت، ودیارە کە وتەی کەسێکی ژێر ورەوانبێژ نیە، چی جای حەزرەت.(٣)

---

(١) (الحافظ العراقي) وشێخی ئەبناسی فەرمویانە: وەکو ئەوەی کە کەسێك حەدیسێك لە مامۆستایەکەوە ریوایەت بکات، پاشان هەواڵی لەدایکبوونی خۆیی لێ بپرسرێت، ئەویش بەروار ومێژوویەك بڵێت، کە بزانرێت ئەو مامۆستایە لەو کاتەدا مردووە ولە ژیاندا نەماوە ! وە ئەو حەدیسەش تەنها لەلای ئەو کەسە دەست بکەوێت. جا ئێستا ئەم کەسە دانی نەناوە بەوەدا کە حەدیسەکەی هەڵبەستووە بەدەمی ئەو مامۆستاوە، بەڵکو شتێکی وتووە وەکو دانپیانان وەهایە. بروانە: التقييد والإيضاح / ١٣٢، والشذا الفياح / ١ / ٢٢٩. یان هەر قەرینەیەکی تر، وەکو ئەوەی کە ئیمامی (ذهبي) بۆمان دەگێڕێتەوە کە کەسێك بە ناوی (مأمون بن أحمد الهروي)، حەدیسی لە هیشامی کوڕی عەمارەوە ریوایەت کردووە، (ابن حبان) لێی پرسیوە: کەی چویتە وڵاتی شامەوە ؟ ئەویش وتوویەتی: ساڵی دووسەد وپەنجای کۆچی. ئەوجا (ابن حبان) پێی فەرمووە: خۆ ئەو هیشامەی کە تۆ حەدیسی لێوە ریوایەت دەکەیت ساڵی دووسەد وچل وپێنج کۆچی دوایی کردووە !!! ئیتر ئەویش وتوویەتی: دەی ئەم هیشامی کوڕی عەمارە هیشامێکی ترە !!! بروانە: ميزان الاعتدال / ٣ / ٤٢٩ / بە ژمارەی ٧٠٣٦.

(٢) وەکو حەدیسی: (معلِّموا صبيانِكم شرارُكم). یان ئەو حەدیسەی کە (مأمون بن أحمد الهروي) هێناویێتی لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: (يكون في أمتي رجل يقال له محمد بن إدريس أضر على أمتي من إبليس، ويكون في أمتي رجل يقال له أبو حنيفة هو سراج أمتي هو سراج أمتي) بروانە: المدخل إلى كتاب الإكليل، للحاكم النيسابووري / ٥٦ – ٥٧، الموضوعات / ٢ / ٤٨، واللآلي المصنوعة / ١ / ٤١٧. جا (ابن الجوزي) لەسەر ئەم حەدیسە دەفەرموێت: ئەم حەدیسە بەدەم حەزرەتەوە هەڵبەسراوە، لەعنەتی خوا لەو کەسەی کە هەڵیبەستووە، چونکە دینی نیە.

(٣) وەکو حەدیسی: (أربَعٌ لا يَشْبَعْنَ من أربع: أَرْضٌ مِنْ مَطَر، ولا أُنْثى مِنْ ذَكَر، ولا العَيْنُ مِنْ نَظَر، ولا العالِمُ مِنَ العِلْمِ، وفي رواية: ولا أُذُنٌ مِنْ خَبَر). بروانە: الموضوعات / ١ / ٢٣٥.

- خراپی ونەگونجانی مانای حەدیسەكە، ئەویش لە چەند حاڵەتێكدا خۆی دەبینێتەوە:
  - حەدیسەكە پێچەوانەی دەقی ڕاشكاوی قورئانە، بە جۆرێك كە تەئویل ناكرێت. (١)
  - حەدیسەكە پێچەوانەی دەقی ڕاشكاوی حەدیسێكی (متواتر)ە. (٢)
  - حەدیسەكە پێچەوانەی ڕێسا گشتییەكانی بڕیارە شەرعیەكان ورەوشتە بەرزەكانە. (٣)
  - حەدیسەكە پێچەوانەی زانستی پزیشكی ورێنموویيە تەندرووستیەكانە. (٤)
  - حەدیسەكە لەگەڵ عەقڵدا ناگونجێت، وناشكرێت تەئویل بكرێت. (٥)
  - حەدیسەكە هەرِەشەیەكی زۆری تێدایە لەسەر كارێك یان ووتەیەكی كەم وسادە، یان موژدە وبەڵێنی گەورەی تێدایە سەبارەت بە كردنی كارێكی كەمبایەخ وبچووك. كە ئەمەیان وەكو ئیمامی (سیوطي) دەفەرموێت: زیاتر كەسانی چیرۆكگێرەوە دروستی دەكەن وهەڵی دەبەستن. (٦)

---

(١) وەكو حەدیسی: (وَلَدُ الزِّنا لا يَدْخُلُ الجَنَّةَ). بڕوانە: المصنوع في معرفة الحديث الموضوع / ٢٠٤، وكشف الخفا، العجلوني /٢/٣٣٩، حەدیسی ژمارە ٢٩١٨. كە ئەمە پێچەوانەیە لەگەڵ دەقی ئایەتی: {وَلا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى}.

(٢) وەكو حەدیسی: (إذا حَدَّثْتُمْ عَنِّي بِحَدِيثٍ يُوَافِقُ الحَقَّ فَخُذُوا بِهِ، حَدَّثْتُ بِهِ أَو لَمْ أُحَدِّثْ بِهِ). زانایان فەرموویانە: ئەم حەدیسە ئەصڵی نیە، وكەسانێكی بێ دین دایان ناوە وهەڵیان بەستووە. بڕوانە: اللآلي المصنوعة: ١٩٥/١، وتنزيه الشريعة المرفوعة، أبو الحسن علي بن محمد بن العَرّاق الكناني: ٢٦٤/١/ حەدیسی ژمارە ٤١. كە ئەمە پێچەوانەیە دقی ئەو حەدیسە (متواتر)ەیە كە دەفەرموێت: «مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ».

(٣) وەكو حەدیسی: (جَوْرُ التُرْكِ ولا عَدْلُ العَرَبِ)، كە بە هیچ جۆرێك لەگەڵ بڕیارە شەرعییەكاندا ناگونجێت، چونكە لەلایەك ستەمی هیچ گەل وهۆزێك فەزڵ نادرێت بەسەر عەدالەتی هیچ گەل وهۆزێكی تردا، وە لە لایەكی تریشەوە هەم حەزرەت وهەم خەلیفەكانیشی عەرەب بوون. بۆیە زانایان فەرموویانە: ئەم وتەیە بە ڕواڵەت كوفرێكی صەریحە. بڕوانە: الجد الحثيث في بيان ما ليس بحديث، العامري، أحمد بن عبد الكريم الغزي / ٨٣، والمصنوع في معرفة الحديث الموضوع، ملا علي القاري / ٨٨، والمقاصد الحسنة، السخاوي / ٢٨٨، والنخبة البهية في الأحاديث المكذوبة على خير البرية، محمد الأمير الكبير المالكي / ٥١، وكشف الخفا، العجلوني / ٢ / ٣٣٧.

(٤) وەكو حەدیسی: (البَاذِنْجانُ شِفاءٌ مِنْ كُلِّ داءٍ). بڕوانە: اللآلي المصنوعة /١٨٩/٢، والموضوعات /٢/٢٠١.

(٥) وەكو حەدیسی: (أَنَّ سفينة نوح طافت بِالْبَيْتِ سَبْعاً، وَصَلى خَلْفَ الْمقَامِ رَكْعَتَيْنِ)، كە كەسێك بە ناوی (عبدالرحمن بن زيد بن أسلم) لە باوكیەوە لە باپیرەیەوە ڕیوایەتی كردووە. بڕوانە: الموضوعات / ١ / ١٠٠.

(٦) بڕوانە: تدريب الراوي / ٢٣٦. هەر بۆیە هەستاوە بە دانانی كتێبێك بە ناونیشانی (تحذير الخواص من أكاذيب القصاص) تاوەكو خەڵكی تێبگەیەنێت لە كردەوەی ئەو جۆرە كەسانە.

# هۆكارەكانی هەڵبەستنی حەدیس
# یان
# پۆلێن كردنی ئەو كەسانەی كە حەدیسیان هەڵبەستووە

وەكو باسمان كرد، ڕێك دەكەوێت كە بە هەڵە كەسێك حەدیسێك دەداتە پاڵ حەزرەت، وكەچی حەدیسی ئەویش نیە، بەلاَم زۆرجار بە دەستی ئەنقەست ئەو كارە دەكرێت ! وە هۆكاریش زۆرن كە پاڵ بە خەڵكانێكەوە دەنێن بۆ بەدرۆ هەڵبەستنی حەدیس بەدەم حەزرەتەوە، بۆیە هەر لەم ڕوانگەیەوە زانایان هەستاون بە پۆلێن كردنی ئەو كەسانەی كە حەدیسیان بە درۆوە هەڵبەستووە، بۆ چەند پۆلێك، لەوانە:

١) خەڵكانێكی بێ دین وبێ باوەڕ، بە مەبەستی تانە گرتن لە ئاینی ئیسلام چەندین حەدیسیان درووست كردووە. وەكو دەگێڕنەوە لە كەسێك بە ناوی (عبد الكريم بن أبي العرجاء)وە، كە بەر لە كاتی لەسێدارەدانی وتوویەتی: سوێند بەخوا، چوار هەزار حەدیسم بەدرۆوە داناوە، حەلاَڵم پێ حەرام كردوون، وحەرامیشم پێ حەلاَڵ كردوون، وابووە كە كاتی ڕۆژوو گرتن بووە، من ڕۆژووەكەم پێ شكاندوون، واش بووە كە كاتی ڕۆژوو نەبووە، من ڕۆژووم پێ گرتوون.(١)

٢) دەمارگیری بۆ بۆچوونێكی دیاری كراو یان مەزهەبێك، وەكوخەڵكانێك بەناوی خۆشەویستی ئالوبەیتی حەزرەتەوە چەندین حەدیسیان بە درۆ هەڵبەستووە بەدەم حەزرەتەوە. وەكو لە چەندین كەسەوە ڕیوایەت كراوە كە ئەگەر بۆچوونێكیان پێ باش وپەسەند بوایە دەیانكرد بە حەدیس ودەیاندایە پاڵ حەزرەت.(٢)

٣) دەمارگیری بۆ گەلێك یان هۆزێك یان ڕەگەزێك یان زمانێك یان ناوچەیەك، وەكو: "إن الله أنزل الوحي بالعربية، وإذا رضي أنزل بالفارسية" یا وەكو: "أبغض الكلام إلى الله تعالى

---

(١) بڕوانە: الموضوعات / ١ / ٣٧.

(٢) بڕوانە سەرچاوەی پێشوو / ١ / ٣٨ - ٣٩.

الفارسية، وكلام الشيطان الخوزية (الحورية)، وكلام أهل النار البخارية (النجارية)، وكلام أهل الجنة العربية"[1] یا وەکو ئەو حەدیسانەی کە کەسێك بەناوی (میسرة بن عبد ربه) لە وەسفی شاری قەزویندا داینـاون. [2]

٤) هەڵنان وهاندان لەسەر چاکەکردن وترساندن بۆ دوورکەوتنەوە لە خراپە، کە هەندێك کەس بۆ ئەو مەبەستە چەندین حەدیسیان بەدەم حەزرەتەوە هەڵبەستووە، بە خەیاڵی خۆیان گوایا ئەم ئاینە نوقسانی تێدا بووە، وپێویستی بە تەواوکردن وپڕکردنەوە هەبووە !!!. وەکو ئەو حەدیسانەی کە لەسـەر فەزڵی سوورەتەکانی قورئان یەك بەیەك هاتوون. [3]

٥) نزیك بوونەوە لە دەسەڵات، ودەستخستنی ماڵ وپارە، وەکو دەگێڕنەوە کە کەسێك بەناوی (غیاث بن ابراهیم) چووەتە لای مەهدی باوکی هارونە رەشیدی خەلیفەی عەبباسییەکان، کە حەزی لە کۆتر بوو وە لەو کاتەدا گەمەی پێ دەکرد، ئەویش حەدیسێکی بەدەم حەزرەتەوە هەڵبەست، ووتی: حەزرەت فەرموویەتی: (لاَ سَبْقَ إلاَّ فِي خُفٍّ، أَوْ حَافِرٍ، أَوْ نَصْلٍ، أو جَنَاحٍ). کە عیبارەتی (أو جناح)ی بۆ زیاد کرد، تەنها لەبەر ئەوەی کە خەلیفە هەندێك پارەی بداتێ. [4]

---

(١) بروانە سەرچاوەی پێشوو /١/١١١، واللآلي المصنوعة /١/١٧–١٨، وتنزيه الشريعة المرفوعة /١/١٣٦-١٣٧.

(٢) بروانە: تنزيه الشريعة المرفوعة / ٢ / ٥٧.

(٣) بروانە: الموضوعات / ١ / ٣٩ - ٤١. جا کاتێك کە بەم کەسانەیان وتووە: باشە چۆن حەدیس بەدەم حەزرەتەوە هەڵدەبەستن، لەکاتێکدا کە ئەو خۆی فەرموویەتی: « مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ ». ئەوانیش وتوویانە: حەزرەت فەرموویەتی: (كذب عليّ) واتە درۆیەك بکات لە دژی من وبەرنامەکەی من تەواو ببێت، خۆ ئێمە شتێك دەڵێین کە لە سوودی بەرنامەکەی ئەو تەواو دەبێت، چونکە خەڵکی هاندەدەین بۆ کاری چاکە، ودەیانترسێنین لە کار وکردەوەی خراپ. بروانە: هەمان سەرچاوە / ١ / ٩٨، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣١٤، والباعث الحثيث / ٦٦، وتدريب الراوي / ٢٤٣، وتوضيح الأفكار / ٢ / ٨٥.

(٤) بروانە: الإرشاد في معرفة علماء الحديث / ٢ / ٥٩٣ — ٥٩٤، والمدخل إلى كتاب الإكليل / ٥٥، والموضوعات / ١ / ٤٢، والآثار المرفوعة في الأخبار الموضوعة / ١٦ — ١٧، والبدر المنير، ابن الملقن / ٩ / ٤٢٠ — ٤٢١، واللآلي المصنوعة / ٢ / ١٩٦ — ١٩٧، وتنزيه الشريعة المرفوعة / ١ / ١٤ — ١٥، وشرح التبصرة والتذكرة / ١ / ٣٠٨ - ٣٠٩، وفتح المغيث / ١ / ٢٨٠ - ٢٨١، والشذا الفياح / ١ / ٢٢٥، وتدريب الراوي / ٢٤٥.

٦) بەرژەوەندی کەسێتی ونیازی تۆڵەسەندنەوە لە کەسانێك، وەکو حەدیسی (معلّموا صبیانِکم)، یان وەکو ئەو حەدیسەی کە کەسێك بەناوی (محمد بن الحجاج اللخمي) دایناوە لەبارەی هەریسەوە، کە گوایە حەزرەت فەرموویەتی: إنَّ جِبْرِيلَ (عليه السّلام)، أَطْعَمَنِي الهَرِيْسَةَ، يشُدُّ بِها ظَهْرِي لِقِيامِ اللّيلِ.[1]

٧) هەندێك کەس بە مەبەستی ناوبانگ وناودەرکردن حەدیس درووست دەکات، وەکو ئەوەی کە حەدیسێك دێنن، کە گوایە تەنها لای ئەوان هەیە ولای کەسی تر ئەو حەدیسە دەست ناکەوێت، بۆ ئەوەی خەڵکی ڕوویان تێ بکەن وگوێیان لێ بگرن. [2]

٨) هەندێکیش هەر وتە وقسەیەکی جوان وڕێکیان دەست کەوتبێت، داویانەتە پاڵ حەزرەت، بەپاساوی ئەوەی کە قسەی جوان هەمووی شەرعییە، وەکو دەگێڕنەوە لە کەسێکەوە بەناوی (محمد بن سعید بن حسان بن قیس القرشی الأسدی المصلوب)، کە وتوویەتی: هیچ خراپەیەکی تێدا نیە کە وتیەکی جوان ببینیت، وڕشتەیەکی گێڕانەوەی بۆ درووست بکەیت !. [3]

## حوکمی درۆ کردن بەدەم حەزرەتەوە

سەرەتا درۆ کردن خۆی بۆخۆی تاوانە، چی جای ئەوەی کە بەدەم حەزرەتەوە بکرێت، وتەیەك بدرێتە پاڵی کە هی ئەو نەبێت، ئەگەرچی وتەکە وتەیەکی باش وشەرعیش بێت.

ئیمامی بوخاری وموسلیم لە هاوەڵی بەڕێز موغەیرەی کوڕی شوعبەوە دەگێڕنەوە، کە حەزرەت فەرموویەتی: « إِنَّ كَذِبًا عَلَيَّ لَيْسَ كَكَذِبٍ عَلَى أَحَدٍ، مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنْ النَّارِ ». [4]

---

(١) بروانە: علل الحديث / ٢ / ٨ / حەدیسی ژمارە ١٤٩٦، والموضوعات / ٣ / ١٨، واللآلي المصنوعة / ١ / ١٦٧، والمصنوع في معرفة الحديث الموضوع / ٢٧٢، والمغني عن حمل الأسفار، للحافظ العراقي / ١ / ٣٧٧، ومجمع الزوائد ومنبع الفوائد، للهيثمي / ٥ / ٣٢ / حەدیسی ذمارة ٧٩٩٣.

(٢) بروانە: الموضوعات / ١ / ٤٣، واللآلي المصنوعة / ٢ / ٣٩١ – ٣٩٢.

(٣) بروانە: الموضوعات / ١ / ٤١ – ٤٢، واللآلي المصنوعة / ٢ / ٣٩٠.

(٤) بروانە: صحيح البخاري / كتاب الجنائز / باب ما يكره من النياحة على الميت / حەدیسی ژمارە ١٢٢٩، وصحيح مسلم / المقدمة / باب تغليظ الكذب على رسول الله / حەدیسی ژمارە ٤.

زانایان لەسەر ئەم حەدیسە فەرموویانە: زیاد لە شەست کەس لە هاوەڵان رِیوایەتیان کردووە، لە نێوانیاندا هاوەڵە بە بەهەشت مژدەپێدراوەکان، وزانایان بە حەدیسێکی (متواتر)یان داناوە.(١)

بۆیە دەبینین زانای پایەبەرز (أبو محمد الجويني)(٢) فەرموویەتی: هەر کەسێك بەدەستی ئەنقەست درۆ بکات بەدەم حەزرەتەوە کافر دەبێت.(٣)

بەڵام وەکو باسمان کرد، هەندێك لەوانەی کە حەدیسیان درووست کردووە وداویانەتە پاڵ حەزرەت، بە خەیاڵی خۆیان مەبەستی سەرخستن وپاڵپشتی کردنی ئاینی ئیسلام ئەو کارەیان کردووە، وبەکاری چاکیان زانیووە ! بۆیە زۆرینە یان تەواوی زانا متمانەدارەکان پێیان وایە کە حەدیس درووست کردن و هەڵبەستنی قسە بەدەم حەزرەتەوە یەکێکە لە تاوانە گەورەکان، وخاوەنەکەی لە دین دەرناچێت وکافر نابێت، مەگەر ئەو کارە بە حەڵاڵ وشەرعی بزانێت!(٤)

---

(١) بروانە: مقدمة ابن الصلاح / ١٥٧، وشرح التبصرة والتذكرة /٢/٨١-٨٢، وتوجيه النظر /١/١٣٨.

(٢) ناوی(عَبْدُ اللهِ بنُ يُوْسُفَ بنِ عَبْدِ اللهِ الجُوَيْنِيّ)یە، کە دەکاتە باوکی زانای پایەبەرز (إِمَامُ الحَرَمَيْنِ)، لە ساڵی (٤٣٨)ی کۆچی وەفاتی کردووە. بروانە: سير أعلام النبلاء، الذهبي / ٣٤ / ١٢٣ - ١٢٤، ووفيات الأعيان، ابن الخلكان / ٣ / ٤٧، وطبقات المفسرين، السيوطي / ٤٥، وطبقات الشافعية الكبرى، تاج الدين السبكي / ٥ / ٧٣.

(٣) بروانە: نزهة النظر / ١١١ - ١١٢، وفتح المغيث / ١ / ٢٨٩، وتدريب الراوي / ٢٤٤، وتوضيح الأفكار / ٢ / ٨٨. لەم بارەیەوە فەرموودەیەکی حەزرەت هێنراوەتەوە لەسەر کەسێك کە چووە بۆ جێگەیەك، ووتوویەتی بە خەڵکەکەی، کە گوایە حەزرەت ناردوویەتی بۆلایان، وئەگەر خوازبێنی هەر ئافرەتێکیشی کرد با پێی بدەن ! ئەوانیش وتیان: تاکو ئێستا کاری لەم جۆرەمان لە حەزرەت نەبینیووە، بۆیە لێرەبە تاوەکو کەسێك دەنێرینە خزمەتی، بزانین چی دەفەرموێت. جا کە هەواڵەکەیان گەیاندە حەزرەت، ئەویش ئیمامی عەلی وزوبەیری کوڕی عەووامی نارد، وپێی فەرموون: ئەگەر بینیتان بیکوژن. بروانە: مصنف عبد الرزاق / كتاب الجامع للإمام معمر بن راشد الأزدي رواية الإمام عبد الرزاق / باب الكذب على النبي / حەدیسی ژمارە ٢٠٤٩٥، والبدر المنير في تخريج الأحاديث والأثار الواقعة في الشرح الكبير، ابن الملقن / ٩ / ٢٠٥..../ حەدیسی ژمارە ٢٢.

(٤) بروانە: شرح النووي على مسلم / ١ / ٦٩، وفتح المغيث / ١ / ٣٦٨، وتوضيح الأفكار / ٢ / ٨٨.

## حوکمی گێڕانەوەی حەدیسی ( موضوع )

زانایان فەرموویانە: خراپترین جۆری حەدیسی (ضعیف) بریتیە لە حەدیسی (موضوع). بۆیە هەر کەسێك کە بزانێت ئەو حەدیسە (موضوع)ە، درووست نیە ڕیوایەتی بکات، مەگەر بۆ خەڵکی ڕوون بکاتەوە، ئەمەش بە پێچەوانەی جۆرەکانی تری حەدیسی (ضعیف) کە دەکرێت ڕاست بن، وفەرموودەی حەزرەت بن، ودرووستیشە لە هاندان وترساندنی خەڵکیدا ڕیوایەت بکرێن.(١)

کەواتە ڕیوایەت کردنی ئەم جۆرە حەدیسە حەرام وناڕەوایە، مەگەر بەجۆرێك کە خەڵکی ئاگادار بکرێتەوە لەوەی کە حەدیسی حەزرەت نیە، وبەدرۆوە هەڵبەستراوە بەدەمیەوە.

بەڵگەی ئەم بۆچوونەی زانایان فەرموودەیەکی حەزرەتە کە ئیمامی موسلیم ڕیوایەتی کردووە لە سەرەتای صەحیحەکەیدا، کە حەزرەت فەرموویەتی: « مَنْ حَدَّثَ عَنِّي بِحَدِيثٍ يُرَى أَنَّهُ كَذِبٌ فَهُوَ أَحَدُ الْكَاذِبِينَ ». واتە: هەر کەسێك حەدیسێك لە منەوە بگێڕێتەوە، وگومان هەبێت کە درۆیە، ئەوە خۆشی یەکێکە لە درۆزنان.

هەر بۆیە زانایان خوا پاداشتی چاکەیان بداتەوە، هەر لە کۆنەوە چەندین کتێبیان داناوە، هەم لەبارەی حەدیسە (موضوع)ەکانەوە، وهەم لەبارەی ئەو کەسانەشەوە کە هەڵیان بەستوون، لەوانە:(٢)

- تذكرة الموضوعات: لأبي الفضل محمد بن طاهر المقدسي.

---

(١) بروانە: مقدمة ابن الصلاح / ٥٨، وألفية العراقي / بيت ٢٢٥، وألفية السيوطي / بيت ٢٧٢.

ڕەنگە کەسێك ڕەخنە بگرێت وبڵێت: خۆ حەدیسی (موضوع) هەر حەدیسیش نیە، ئیتر چۆن فەرموویانە: خراپترین جۆری حەدیسە (ضعیف)ەکانە ؟!

زانایان فەرموویانە: مەبەست بە حەدیس لەو فەرمایشتەدا، حەدیسی حەزرەت نیە، بەڵکو وتەیەکە کە ڕیوایەت کرابێت، ئیتر هی هەرکەسێك بێت. بروانە: النكت على مقدمة ابن الصلاح / ٣ / ٨١٣، وفتح المغيث / ١ / ٢٧٤، وتوضيح الأفكار / ٢ / ٦٩.

(٢) بروانە: الرسالة المستطرفة / ١٤٩ – ١٥٤.

- الموضوعات من الأحاديث المرفوعات: لأبي عبد الله الحسين ابن إبراهيم الجورقاني، كە بە كتێبی (الأباطيل) بەناوبانگە.
- الموضوعات: لأبي الفرج عبد الرحمن بن علي بن الجوزي.
- اللآلئ المصنوعة في الأحاديث الموضوعة: للإمام السيوطي.
- الكشف الحثيث عمن رُمي بوضع الحديث ) للحافظ برهان الدين إبراهيم بن محمد بن سبط بن العجمي.
- تنزيه الشريعة المرفوعة عن الأخبار الشنيعة الموضوعة: لأبي الحسن علي بن محمد بن عراق الكناني.
- تذكرة الموضوعات: لجمال الدين محمد بن طاهر الفتني.
- الأسرار المرفوعة في الأخبار الموضوعة: كە ناسراوە بە "تذكرة الموضوعات" لملا علي القاري الهروي.
- المصنوع في معرفة الحديث الموضوع: للملا علي القاري.
- الفوائد المجموعة في الأحاديث الموضوعة: لمحمد بن علي الشوكاني.
- الآثار المرفوعة في الأخبار الموضوعة: للعلامة عبد الحي بن عبد الحليم اللكنوي.
- الجد الحثيث في بيان ما ليس بحديث: للشيخ أحمد بن عبد الكريم العامري الغزي.

وَقَدْ أتَتْ كَـــالجَوْهَرِ المكْنُونِ سَمَّيْتُهَا: (مَنْظُومَةَ البَيْقُونِي)

فَــــوْقَ الثَّلاثِينَ بِــأَربَعٍ أَتَتْ أَبْيــاتُهَا تَمَّتْ بِخَيْرٍ خُتِمَتْ

# کۆتایی

واتە: ئەم هۆنراوەیە هاتەڕوو، وەکو گەوهەرێکی پارێزراوی شاراوە، وناوم لێنا (هۆنراوەی بەیقوونی). دێڕەکانی لە سەرووی سییەوە بە چوار دێڕ تەواو بوون، و بەخێر کۆتایی پێ هێنرا.

مامۆستای دانەر لەم دوو هۆنراوەی کۆتاییەدا دەیەوێت بفەرموێت: ئەو زانیاریانەی کە لەناو ئەم چەند دێڕە هۆنراوەیەدا کۆ کراونەتەوە، وەکو گەوهەر وبەردی گرانبەها وەهان، وزۆر بەنرخن لەم زانستەدا، بۆ کەسانێك کە بەشوێن زانیاریدا بگەڕێن.

وەکو گەوهەرێکی بەنرخ وەهایە کە پارێزراو وداپۆشراو بێت، وتیشکی خۆری بەرنەکەوتبێت، وتەپوتۆز وچڵك وچەپەڵی پێوە نەنیشتبێت، وهەر بە درەوشاوەیی وخاوێنی مابێتەوە.

هەروەها وەکو زۆرێك لە زانایانی تری پێش خۆی، ئەمیش هۆنراوەکەی ناوناوە بەناو ونازناوی خۆیەوە، ناوی ناوە: (هۆنراوەی بەیقوونی).

بەڵام من ئەوەندەی کە تەماشای شەرحەکانی ئەم هۆنراوەیەم کردووە، وگەڕاوم بەناو ئەو کتێب وسەرچاوانەی کە باس لە ناساندن وژیانی زانایان دەکەن، شتێکم دەست نەکەوتووە لەسەر ئەوەی کە بزانین ئایا (بەیقوونی) نیسبەتە بۆلای چی ! ئایا ناوی ئەو لادێ یان شارە بووە کە تێیدا لەدایك بووە، یان لێی ژیاوە، یان ناوی باوکی یان باپیرەی بووە؟؟ هەروەها لەو سەرچاوانەدا لە ناوی مامۆستا خۆشیدا ناکۆکی هەیە ! هەندێك جار دەفەرموون ناوی عومەرە، وهەندێك جاریش دەفەرموون ناوی طاهایە.[1]

دێڕەکانی هۆنراوەکەش، وەکو مامۆستا خۆی فەرموویەتی، سی وچوار دێڕن، وناو وپێناسەی سی ودوو جۆر حەدیس وزاراوەی فەرموودەناسی تێدا هێناوە، وبە خێر وچاکە کۆتایی پێ هاتووە، وئەوەی کە خۆی مەبەستی بووە لەو سی وچوار دێڕە هۆنراوەیەدا جێگەی کردۆتەوە.

---

(١) بڕوانە: الأعلام، خير الدين الزركلي / ٥ / ٦٤، ومعجم المؤلفين، عمر كحالة / ٥ / ٤٤. کە دەفەرمووێ: شافیعی مەزهەب بووە، ولە دیمەشقدا ژیاوە، وتاوەکو ساڵی ١٠٨٠ی کۆچی لە ژیاندا بووە.

منیش لێرەدا هاتمە کۆتایی ڕوونکردنەوەکەم لەسەر ئەو هۆنراوەیەی مامۆستا، کە هیوادارم توانیبێتم وەکو ئەوەی کە پێویستە، تەواوی دێڕەکانیم بە باشی شی کردبێتەوە، وئەوەی کە لەخۆی گرتووە، بەجوانی خستبێتمە ڕوو، دوور لە هەڵە وتێکەوتن وپێ خزان، کە زۆر کەس ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

خوایە هەر کارێك دەکەم تەنها لەبەر خاتری تۆ بێت، جێگەی ڕەزامەندی وڕەحمەتی تۆ بێت، لە هەڵەکانم ببووریت، چاوپۆشی لە تاوانەکانم بکەیت، لە خۆم وباوك ودایك ودۆست وخۆشەویستەکانم خۆش بیت.

ئێوەش ئەی خوێنەرە بەڕێزەکان، بە چاوی دڵسۆزی ودۆستایەتیەوە بۆ ئەم کارەم بڕوانن، هەر هەڵەیەکیشتان کە بینی، بە چاکەی خۆتان چاکی بکەنەوە، من ئیددیعای خوێنەواری وشارەزایی ناکەم، بەڵام هەرچی لە توانامدا هەبووە بۆ ئەم کارە کردوومە.

عَلى قَدْرِ أَهْلِ العَزْمِ تَأْتِي الْعَزائِمُ     وتَأْتِي عَلى قَدْرِ الكِرامِ المكارِمُ

خوا پشت وپەنای هەموولایەك بێت.

* * *

بەر لە هەموو شت لـەدوای گشـت کارێ     هەزار جار شوکور لەباتی جــــارێ

درووود وســــەلام وەك تــــاوی بــــاران     هـەمیشە لەسـەر حەزرەت بیــــارێ

هەم نــــال وبەیـت وهـاوەڵان ســـەرجەم     گشـت کوردزمـانێ لە دێ ولە شــارێ

* * *

أمجد محمد زاهد شيخ محمد

دەربەندیخان

ڕۆژی دووشەممە

٢٤ی شەووالی ١٤٣١ی کۆچی

٣ / ١٠ / ٢٠١٠ی زاینی

# لیستی سەرچاوەکان

١. أصول الحديث، علومه ومصطلحه، الدكتور محمد عجاج الخطيب، دار المنارة للنشر والتوزيع، جدة – مكة، الطبعة السابعة ١٤١٧ – ١٩٩٧.
٢. أطراف الغرائب والأفراد، أبي الفضل محمد بن طاهر المقدسي، دار الكتب العلمية، عدد الأجزاء: ٥.
٣. الآثار المرفوعة في الأخبار الموضوعة، اللكنوي، عبد الحي، دار الكتب العلمية، عدد الأجزاء: ١.
٤. الإرشاد في معرفة علماء الحديث، الخليل بن عبد الله بن أحمد الخليلي القزويني أبو يعلى، مكتبة الرشد – الرياض، الطبعة الأولى، ١٤٠٩، تحقيق: د. محمد سعيد عمر إدريس، عدد الأجزاء: ٣.
٥. الأسرار المرفوعة في الأخبار الموضوعة المعروف بالموضوعات الكبرى، نور الدين علي بن محمد بن سلطان المشهور بالملا علي القاري، تحقيق محمد الصباغ، دار الأمانة / مؤسسة الرسالة، بيروت – لبنان، الطبعة الأولى ١٣٩١ هـ - ١٩٧١م، عدد الأجزاء ١.
٦. الاقتراح في بيان الاصطلاح وما أضيف إلى ذلك من الأحاديث المعدودة من الصحاح، تقي الدين محمد بن علي بن وهب بن مطيع ابن دقيق العيد، علق عليه ووضع حواشيه م. ع. بيضون، دار الكتب العلمية، بيروت – لبنان، الطبعة الثانية ١٤٢٧ - ٢٠٠٦ م.
٧. الباعث الحثيث، الحافظ ابن كثير، تحقيق: أحمد محمد شاكر، مكتبة دار التراث – القاهرة، طبعة مزيدة ومنقحة ١٤٢٣- ٢٠٠٣.
٨. البدر المنير في تخريج الأحاديث والأثار الواقعة في الشرح الكبير، ابن الملقن سراج الدين أبو حفص عمر بن علي بن أحمد الشافعي المصري، المحقق: مصطفى أبو الغيط و عبدالله بن سليمان وياسر بن كمال، دار الهجرة للنشر والتوزيع - الرياض-السعودية، الطبعة الاولى، ١٤٢٥هـ-٢٠٠٤م، عدد الأجزاء: ٩.

٩. التاريخ الصغير، محمد بن إبراهيم بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي،دار الوعي , مكتبة دار التراث - حلب , القاهرة، الطبعة الأولى، ١٣٩٧ - ١٩٧٧، تحقيق: محمود إبراهيم زايد، عدد الأجزاء: ٢.

١٠. التبيين لأسماء المدلسين، إبراهيم بن محمد بن سبط ابن العجمي أبو الوفا الحلبي الطرابلسي، مؤسسة الريان للطباعة والنشر والتوزيع - بيروت، الطبعة الأولى، ١٤١٤ - ١٩٩٤، تحقيق: محمد إبراهيم داود الموصلي، عدد الأجزاء: ١.

١١. التقييد والإيضاح شرح مقدمة ابن الصلاح، الحافظ زين الدين عبد الرحيم بن الحسين العراقي، دار الفكر للنشر والتوزيع - بيروت - لبنان، الطبعة الأولى، ١٣٨٩هـ - ١٩٧٠م، تحقيق: عبد الرحمن محمد عثمان، عدد الأجزاء: ١.

١٢. التلخيص الحبير في تخريج أحاديث الرافعي الكبير،أبو الفضل أحمد بن علي بن محمد بن أحمد بن حجر العسقلاني، دار الكتب العلمية، الطبعة الأولى ١٤١٩هـ.١٩٨٩م، عدد الأجزاء: ٤.

١٣. التوضيح الأبهر لتذكرة ابن الملقن في علم الأثر، محمد بن عبد الرحمن بن محمد بن أبي بكر بن عثمان السخاوي، مكتبة أصول السلف - السعودية، الطبعة الأولى، ١٤١٨، تحقيق: عبد الله بن محمد عبد الرحيم البخاري، عدد الأجزاء: ١.

١٤. الجامع الصحيح المختصر، محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري، دار ابن كثير، اليمامة - بيروت، الطبعة الثالثة، ١٤٠٧ - ١٩٨٧، تحقيق: د. مصطفى ديب البغا، عدد الأجزاء: ٦.

١٥. الجامع الصحيح سنن الترمذي، محمد بن عيسى أبو عيسى الترمذي، دار إحياء التراث العربي - بيروت، تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون، عدد الأجزاء: ٥.

١٦. الجامع لأخلاق الراوي وآداب السامع، أحمد بن علي بن ثابت الخطيب البغدادي أبو بكر، مكتبة المعارف - الرياض، ١٤٠٣، تحقيق: د. محمود الطحان، عدد الأجزاء: ٢.

١٧. الجرح والتعديل، عبد الرحمن بن أبي حاتم محمد بن إدريس أبو محمد الرازي التميمي، دار إحياء التراث العربي – بيروت، الطبعة الأولى، ١٢٧١ – ١٩٥٢، عدد الأجزاء: ٩.
١٨. الجد الحثيث في بيان ما ليس بحديث، العامري، أحمد بن عبد الكريم الغزي، المحقق: فواز أحمد زمرلي، دار ابن حزم، عدد الأجزاء: ١.
١٩. الرسالة المستطرفة لبيان مشهور كتب السنة المصنفة، محمد بن جعفر الكتاني، دار البشائر الإسلامية – بيروت، الطبعة الرابعة، ١٤٠٦ – ١٩٨٦، تحقيق: محمد المنتصر محمد الزمزمي الكتاني، عدد الأجزاء: ١.
٢٠. الرفع والتكميل في الجرح والتعديل، أبو الحسنات محمد عبد الحي اللكنوي الهندي، مكتب المطبوعات الإسلامية – حلب، الطبعة الثالثة، ١٤٠٧هـ، تحقيق: عبد الفتاح أبو غدة، عدد الأجزاء: ١.
٢١. الشذا الفياح من علوم ابن الصلاح، إبراهيم بن موسى بن أيوب البرهان الأبناسي، مكتبة الرشد – الرياض – السعودية، الطبعة الأولى، ١٤١٨هـ – ١٩٩٨م، تحقيق: صلاح فتحي هلل، عدد الأجزاء: ٢.
٢٢. الطبقات الكبرى، محمد بن سعد بن منيع أبو عبدالله البصري الزهري، المحقق: إحسان عباس، دار صادر – بيروت، الطبعة: ١ – ١٩٦٨ م، عدد الأجزاء: ٨.
٢٣. الغاية في شرح الهداية في علم الرواية، ابن الجزري / السخاوي، تحقيق أبو عائش عبد المنعم إبراهيم، مكتبة أولاد الشيخ للتراث، ٢٠٠١م، عدد الأجزاء ١.
٢٤. الفروسية، محمد بن أبي بكر أيوب الزرعي أبو عبد الله(ابن قيم الجوزية)، دار الأندلس – السعودية – حائل، الطبعة الأولى، ١٤١٤ – ١٩٩٣، تحقيق: مشهور بن حسن بن محمود بن سلمان.
٢٥. الفصل للوصل المدرج في النقل، أحمد بن علي بن ثابت البغدادي أبو بكر، تحقيق محمد مطر الزهراني، دار الهجرة – الرياض، ١٤١٨، عدد الأجزاء ٢.

٢٦. الكامل في ضعفاء الرجال، عبدالله بن عدي بن عبدالله بن محمد أبو أحمد الجرجاني، دار الفكر – بيروت، الطبعة الثالثة، ١٤٠٩ – ١٩٨٨، تحقيق: يحيى مختار غزاوي، عدد الأجزاء: ٧.

٢٧. الكفاية في علم الرواية، أحمد بن علي بن ثابت أبو بكر الخطيب البغدادي، المكتبة العلمية – المدينة المنورة، تحقيق: أبو عبدالله السورقي , إبراهيم حمدي المدني، عدد الأجزاء: ١.

٢٨. اللآلي المصنوعة في الأحاديث الموضوعة، السُّيوطي، جلال الدين، دار الكتب العليمة، عدد الأجزاء: ٢ + فهارس.

٢٩. اللآلي المنثورة في الأحاديث المشهورة، الزركشي، محمد بن عبد الله بن بهادر، المكتب الإسلامي، المحقق: محمد بن لطفي الصباغ، عدد الأجزاء:١.

٣٠. المحدث الفاصل بين الراوي والواعي، الحسن بن عبد الرحمن الرامهرمزي، دار الفكر – بيروت، الطبعة الثالثة ١٤٠٤، تحقيق: د. محمد عجاج الخطيب، عدد الأجزاء: ١.

٣١. المختصر في علوم الحديث، الشريف الجرجاني.

٣٢. المدخل إلى كتاب الإكليل، محمد بن عبد الله بن حمدويه أبو عبد الله الحاكم، تحقيق د. فؤاد عبد المنعم أحمد، دار الدعوة – الاسكندرية، عدد الأجزاء ١.

٣٣. المراسيل لأبي داود.

٣٤. المستدرك على الصحيحين، محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم النيسابوري، دار الكتب العلمية – بيروت، الطبعة الأولى، ١٤١١ – ١٩٩٠، تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا، عدد الأجزاء: ٤.

٣٥. المصنف في الأحاديث والآثار، أبو بكر عبد الله بن محمد بن أبي شيبة الكوفي، مكتبة الرشد – الرياض، الطبعة الأولى، ١٤٠٩، تحقيق: كمال يوسف الحوت، عدد الأجزاء: ٧.

٣٦. المصنوع في معرفة الحديث الموضوع، ملا علي القاري بن سلطان الهروي، المحقق: عبد الفتاح أبو غدة، مكتب المطبوعات الإسلامية، عدد الأجزاء: ١.

٣٧. المعجم الأوسط، أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني، دار الحرمين - القاهرة، ١٤١٥، تحقيق: طارق بن عوض الله بن محمد ,عبد المحسن بن إبراهيم الحسيني، عدد الأجزاء: ١٠.

٣٨. المغني عن حمل الأسفار، أبو الفضل العراقي، تحقيق أشرف عبد المقصود، مكتبة طبرية – الرياض، ١٤١٥هـ - ١٩٩٥م، عدد الأجزاء ٢.

٣٩. المقاصد الحسنة في بيان كثير من الأحاديث المشتهرة على الألسنة، السَّخاوي، عبد الرحمن، دار الكتاب العربي، عدد الأجزاء: ١.

٤٠. المقنع في علوم الحديث، سراج الدين عمر بن علي بن أحمد الأنصاري(ابن الملقن)، دار فواز للنشر – السعودية، الطبعة الأولى، ١٤١٣هـ، تحقيق: عبد الله بن يوسف الجديع، عدد الأجزاء: ١.

٤١. المنظومة البيقونية بشرح الزرقاني مع حاشية الأجهوري / علق عليها وخرج أحاديثها: أبو عبد الرحمن صلاح محمد عويضة / منشورات محمد علي بيضون / دار الكتب العلمية / بيروت – لبنان / الطبعة الأولى ١٤٢٠ – ١٩٩٩.

٤٢. المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج، أبو زكريا يحيى بن شرف بن مري النووي، دار إحياء التراث العربي – بيروت، الطبعة الثانية، ١٣٩٢، عدد الأجزاء: ١٨.

٤٣. المنهل الروي في مختصر علوم الحديث النبوي، محمد بن إبراهيم بن جماعة، دار الفكر – دمشق، الطبعة الثانية، ١٤٠٦، تحقيق: د. محيي الدين عبد الرحمن رمضان، عدد الأجزاء: ١.

٤٤. الموضوعات، أبي الفرج عبدالرحمن بن على بن الجوزي القرشى، ضبط وتقديم وتحقيق عبدالرحمن محمد عثمان، الطبعة الاولى ١٣٨٦ – ١٩٦٦.

٤٥. الموقظة في علم مصطلح الحديث، الإمام شمس الدين محمد بن أحمد الذهبي، اعتنى به عبد الفتاح أبو غدة، اعتنى بإخراجه وطباعته سلمان عبد الفتاح أبو غدة، دار البشائر الإسلامية، بيروت – لبنان، الطبعة الثامنة ١٤٢٥ هـ.

٤٦. النخبة البهية في الأحاديث المكذوبة على خير البرية، محمد الأمير الكبير المالكي / تحقيق زهير الشاويش / المكتب الإسلامي – بيروت / الطبعة الأولى ١٤٠٩ – ١٩٨٨.
٤٧. النكت على كتاب ابن الصلاح، أبو الفضل أحمد بن علي بن محمد بن أحمد بن حجر العسقلاني، المحقق: ربيع بن هادي عمير المدخلي، عمادة البحث العلمي بالجامعة الإسلامية، المدينة المنورة، المملكة العربية السعودية، عدد المجلدات: ٢، الطبعة: الأولى، ١٤٠٤هـ/١٩٨٤م.
٤٨. النكت على مقدمة ابن الصلاح، بدر الدين أبي عبد الله محمد بن جمال الدين عبد الله بن بهادر، أضواء السلف – الرياض، الطبعة الأولى، ١٤١٩هـ - ١٩٩٨م، تحقيق: د. زين العابدين بن محمد بلا فريج، عدد الأجزاء: ٣.
٤٩. اليواقيت والدرر في شرح نخبة ابن حجر، عبد الرؤوف المناوي، تحقيق المرتضي الزين أحمد، مكتبة الرشد – الرياض، ١٩٩٩م، عدد الأجزاء ٢.
٥٠. بلوغ المرام في أحاديث الأحكام.
٥١. بيان الوهم والإيهام في كتاب الأحكام، علي بن محمد بن عبد الملك الكتامي الحميري الفاسي، أبو الحسن ابن القطان، المحقق: د. الحسين آيت سعيد، دار طيبة – الرياض، الطبعة الأولى، ١٤١٨هـ-١٩٩٧م، عدد الأجزاء: ٦ (٥ أجزاء، ومجلد فهارس).
٥٢. تاريخ بغداد، أحمد بن علي أبو بكر الخطيب البغدادي، دار الكتب العلمية – بيروت، عدد الأجزاء: ١٤.
٥٣. تدريب الراوي في شرح تقريب النواوي، الحافظ جلال الدين السيوطي، حققه: أبو قتيبة نظر محمد الفاريابي، مؤسسة الريان، بيروت – لبنان، الطبعة الثانية ١٤٣٠ - ٢٠٠٩، عدد الأجزاء: ١.
٥٤. تنزيه الشريعة المرفوعة، أبو الحسن على بن محمد بن العراق الكناني، المحقق: عبد الله بن محمد بن الصديق الغماري، دار الكتب العلمية، الطبعة الثانية ١٩٨١، عدد الأجزاء: ٢.
٥٥. تنقيح كتاب التحقيق في أحاديث التعليق،،شمس الدين محمد بن أحمد بن عبد الهادي الحنبلي، تحقيق: سامي بن محمد بن جاد الله وعبد العزيز بن ناصر الخباني، أضواء السلف – الرياض، الطبعة الأولى، ١٤٢٨هـ - ٢٠٠٧ م، عدد الأجزاء: ٥.

٥٦. توجيه النظر إلى أصول الأثر، طاهر الجزائري الدمشقي، مكتبة المطبوعات الإسلامية – حلب، الطبعة الأولى، ١٤١٦هـ-١٩٩٥م، تحقيق: عبد الفتاح أبو غدة، عدد الأجزاء: ٢.
٥٧. توضيح الأفكار لمعاني تنقيح الأنظار، محمد بن إسماعيل الأمير الحسني الصنعاني، المكتبة السلفية – المدينة المنورة، تحقيق: محمد محي الدين عبد الحميد، عدد الأجزاء: ٢.
٥٨. جامع التحصيل في أحكام المراسيل، أبو سعيد بن خليل بن كيكلدي أبو سعيد العلائي، عالم الكتب – بيروت، الطبعة الثانية، ١٤٠٧ – ١٩٨٦، تحقيق: حمدي عبد المجيد السلفي، عدد الأجزاء: ١.
٥٩. جرح الرواة وتعديلهم . الأسس والضوابط / رسالة دكتوراه / إعداد محمود عيدان أحمد الدليمي / بإشراف الدكتور زياد محمود رشيد العاني / جامعة بغداد . كلية العلوم الاسلامية.
٦٠. حلية الأولياء وطبقات الأصفياء، أبو نعيم أحمد بن عبد الله الأصبهاني، دار الكتاب العربي – بيروت، الطبعة الرابعة، ١٤٠٥، عدد الأجزاء: ١٠.
٦١. رسوم التحديث في علوم الحديث، برهان الدين أبو إسحاق إبراهيم بن عمر الشهير ب: الجعبري، دار ابن حزم – لبنان / بيروت – ١٤٢١ هـ – ٢٠٠٠ م، الطبعة: الأولى، تحقيق: إبراهيم بن شريف الميلي.
٦٢. سنن ابن ماجه، محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني، دار الفكر – بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، عدد الأجزاء: ٢.
٦٣. سنن أبي داود، سليمان بن الأشعث أبو داود السجستاني الأزدي، دار الفكر، تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد، عدد الأجزاء: ٤، مع الكتاب: تعليقات كَمَال يوسُفْ الحوُت.
٦٤. سنن البيهقي الكبرى، أحمد بن الحسين بن علي بن موسى أبو بكر البيهقي، مكتبة دار الباز – مكة المكرمة، ١٤١٤ – ١٩٩٤، تحقيق: محمد عبد القادر عطا، عدد الأجزاء: ١٠.
٦٥. سنن الدارقطني، علي بن عمر أبو الحسن الدارقطني البغدادي، دار المعرفة – بيروت، ١٣٨٦ – ١٩٦٦، تحقيق: السيد عبد الله هاشم يماني المدني، عدد الأجزاء: ٤.

٦٦. سنن الدارمي، عبدالله بن عبدالرحمن أبو محمد الدارمي، دار الكتاب العربي – بيروت، الطبعة الأولى، ١٤٠٧، تحقيق: فواز أحمد زمرلي , خالد السبع العلمي، عدد الأجزاء: ٢.
٦٧. سنن النسائي الكبرى، أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي، دار الكتب العلمية – بيروت، الطبعة الأولى، ١٤١١ – ١٩٩١، تحقيق: د.عبد الغفار سليمان البنداري , سيد كسروي حسن، عدد الأجزاء: ٦.
٦٨. سير أعلام النبلاء، للذهبي
٦٩. شرح التبصرة والتذكرة، الحافظ العراقي، تحقيق: الدكتور عبد اللطيف الهميم والشيخ ماهر ياسين الفحل، منشورات محمد علي البيضون / دار الكتب العلمية / بيروت – لبنان / الطبعة الأولى ١٤٢٣ - ٢٠٠٢.
٧٠. شرح شرح نخبة الفكر في مصطلحات أهل الأثر، نور الدين أبو الحسن على بن سلطان محمد القاري الهروي المعروف "بملا على القاري"، قدم له: الشيخ عبد الفتح أبو غدة، حققه وعلق عليه: محمد نزار تميم وهيثم نزار تميم، دار الأرقم، لبنان / بيروت، عدد الأجزاء ١.
٧١. شرح علل الترمذي لابن رجب، الإمام العالم الحافظ النّقّاد زين الدين أبي الفرج عبد الرحمن بن أحمد البغدادي المعروف ( بابن رجب الحنبلي )، المحقق: د.نور الدين عتر، مع مقدمة تحقيق د.همام عبد الرحيم سعيد،عدد الأجزاء: ٢، مصدر الكتاب: ملتقى أهل الحديث، .www.ahlalhdeth.com
٧٢. صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان، محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي، مؤسسة الرسالة – بيروت، الطبعة الثانية، ١٤١٤ – ١٩٩٣، تحقيق: شعيب الأرنؤوط، عدد الأجزاء: ١٨.
٧٣. صحيح مسلم، مسلم بن الحجاج أبو الحسين القشيري النيسابوري، دار إحياء التراث العربي – بيروت، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، عدد الأجزاء: ٥.
٧٤. طبقات الشافعية الكبرى، تاج الدين بن علي بن عبد الكافي السبكي، هجر للطباعة والنشر والتوزيع - ١٤١٣هـ، الطبعة الثانية، عدد الأجزاء / ١٠، تحقيق: د. محمود محمد الطناحي، د.عبد الفتاح محمد الحلو.

٧٥. طبقات المفسرين، عبد الرحمن بن أبي بكر السيوطي، مكتبة وهبة – القاهرة، الطبعة الأولى، ١٣٩٦، تحقيق: علي محمد عمر، عدد الأجزاء: ١.
٧٦. علل الحديث، ابن أبي حاتم أبو محمد عَبد الرحمن بن محمد بن إدريس بن مهران الرازي، تحقيق: الدكتور سعد بن عبد الله الحميد.
٧٧. علوم الحديث [مقدمة ابن الصلاح ]، أبو عمرو عثمان بن عبد الرحمن الشهرزوري، مكتبة الفارابي، الطبعة: الأولى ١٩٨٤ م، عدد الأجزاء: ١.
٧٨. علوم الحديث في ضوء تطبيقات المحدثين النقاد، الدكتور حمزة عبد الله المليباري / دار ابن حزم / بيروت – لبنان / الطبعة الأولى ١٤٢٣ – ٢٠٠٣.
٧٩. فتح المغيث شرح ألفية الحديث، شمس الدين محمد بن عبد الرحمن السخاوي، دار الكتب العلمية – لبنان، الطبعة الأولى، ١٤٠٣هـ، عدد الأجزاء: ٣.
٨٠. قفو الأثر في صفوة علوم الأثر، رضي الدين محمد بن إبراهيم الحلبي الحنفي، مكتبة المطبوعات الإسلامية – حلب، الطبعة الثانية، ١٤٠٨هـ، تحقيق: عبد الفتاح أبو غدة، عدد الأجزاء: ٢.
٨١. قواطع الأدلة في الأصول، أبي المظفر منصور بن محمد بن عبد الجبار السمعاني، دراسة وتحقيق:محمد حسن محمد حسن اسماعيل الشافعي، دار الكتب العلمية، بيروت، لبنان، الطبعة الأولى، ١٤١٨هـ/١٩٩٩م، عدد الأجزاء: ٢.
٨٢. قواعد التحديث من فنون مصطلح الحديث، العلامة محمد جمال الدين القاسمي الدمشقي، قدم له الشيخ عبد القادر الأرنؤوط، حققه وعلق عليه مصطفى شيخ مصطفى / مؤسسة الرسالة ناشرون / بيروت – لبنان / الطبعة الأولى ١٤٢٥ – ٢٠٠٤.
٨٣. كشف الخفاء ومزيل الالباس عما اشتهر من الاحاديث على ألسنة الناس، العجلوني،إسماعيل بن محمد الجراحي ضبطه وصححه ووضع حواشيه الشيخ محمد عبد العزيز الخالدي، منشورات محمد علي البيضون / دار الكتب العلمية / بيروت – لبنان / ١٤٢٢ – ٢٠٠١.

٨٤. كنز العمال في سنن الأقوال والأفعال، علي بن حسام الدين المتقي الهندي، تحقيق: محمود عمر الدمياطي / منشورات محمد علي البيضون / دار الكتب العلمية / بيروت – لبنان / الطبعة الأولى ١٤١٩ – ١٩٩٨.

٨٥. لسان المحدثين (مُعجم يُعنى بشرح مصطلحات المحدثين القديمة والحديثة ورموزهم وإشاراتهم وشرحِ جملة من مشكل عباراتهم وغريب تراكيبهم ونادر أساليبهم)، محمد خلف سلامة، (الموصل: ١٤/٢/٢٠٠٧)، عدد الأجزاء: ٥، مصدر الكتاب: ملفات ورد نشرها المؤلف في ملتقى أهل الحديث. نال شرف فهرسته وإعداده للشّاملة: أبو أكرم الحلبيّ من أعضاء ملتقى أهل الحديث.

٨٦. مجمع الزوائد ومنبع الفوائد، الحافظ نور الدين علي بن أبي بكر الهيثمي، تحقيق: محمد عبد القادر أحمد عطا / منشورات محمد علي البيضون / دار الكتب العلمية / بيروت – لبنان / الطبعة الأولى ١٤٢٢ – ٢٠٠١.

٨٧. محاضرات في علوم الحديث، د. ماهر ياسين الفحل، رئيس قسم الحديث - كلية العلوم الإسلامية - جامعة الأنبار، maher_fahl@hotmail.com.

٨٨. مسند الإمام أحمد بن حنبل، أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني، مؤسسة قرطبة – القاهرة، عدد الأجزاء: ٦، الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأرنؤوط عليها.

٨٩. مسند البزار ( البحر الزخار )، أبو بكر أحمد بن عمرو بن عبد الخالق البزار، تحقيق د. محفوظ الرحمن زين الله، مؤسسة علوم القرآن , مكتبة العلوم والحكم، بيروت , المدينة ١٤٠٩، عدد الأجزاء ١٠.

٩٠. مصنف عبد الرزاق، أبو بكر عبد الرزاق بن همام الصنعاني، المكتب الإسلامي – بيروت، الطبعة الثانية، ١٤٠٣، تحقيق: حبيب الرحمن الأعظمي، عدد الأجزاء: ١١.

٩١. معرفة علوم الحديث، أبو عبد الله محمد بن عبد الله الحاكم النيسابوري، دار الكتب العلمية – بيروت، الطبعة الثانية، ١٣٩٧هـ - ١٩٧٧م، تحقيق: السيد معظم حسين، عدد الأجزاء: ١.

٩٢. منحة المغيث شرح ألفية العراقي في الحديث، محمد إدريس الكاندهلوي، تحقيق: د. ساجد عبد الرحمن الصديقي، دار البشائر الإسلامية، بيروت – لبنان، الطبعة الأولى ١٤٣٠ – ٢٠٠٩.

٩٣. منهج النقد في علوم الحديث، نور الدين عتر، دار الفكر دمشق- سورية، الطبعة الثالثة ١٤١٨هـ -١٩٩٧م، عدد المجلدات: ١.

٩٤. موطأ الإمام مالك _ رواية يحيى الليثي، مالك بن أنس أبو عبدالله الأصبحي، دار إحياء التراث العربي – مصر، تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي، عدد الأجزاء: ٢.

٩٥. ميزان الاعتدال، للذهبي، تحقيق علي محمد البجاوي، دار المعرفة للطباعة والنشر بيروت – لبنان.

٩٦. نخبة الفكر في مصطلح أهل الأثر، أحمد بن علي بن حجر العسقلاني، دار إحياء التراث العرب – بيروت، تحقيق: ضمن كتاب سبل السلام، عدد الأجزاء: ١.

٩٧. نزهة النظر في توضيح نخبة الفكر في مصطلح أهل الأثر، أبو الفضل أحمد بن علي بن محمد بن أحمد بن حجر العسقلاني، المحقق: عبد الله بن ضيف الله الرحيلي، مطبعة سفير بالرياض، الطبعة الأولى (١٤٢٢هـ).

٩٨. وفيات الأعيان وأنباء أبناء الزمان، أبو العباس شمس الدين أحمد بن محمد بن أبي بكر بن خلكان، المحقق: إحسان عباس، دار صادر – بيروت، موقع الوراق: http://www.alwarraq.com.

# ناوەڕۆك